# گۆڤەند      زنار

فەرهەنگی

**فارسی - کوردی**

(آ – س)


دانانی

**حەمە کەریم عارف**



**هەولێر - ٢٠٠٦**

**ناوی کتێب: (گۆڤەند و زنار)**

**فەرهەنگی فارسی - کوردی**

- دانانی: حەمە کەریم عارف
- نەخشەسازی ناوەوە: طــه حسین
- پیتچنین: رزگار حەساری
- بەرگ: هۆگر سدیق
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- چاپ: چاپی یەکەم ٢٠٠٦
- ژمارەی سپاردن: (٥٨)
- تیراژ: ٧٥٠ دانە
- نرخ: (٧٥٠٠) دینار
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب - ٦٤ - (١٦٧)

**ناونیشان:**

**دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی**

**هەولێر - پشت رۆژنامەی خەبات**

**پۆستی ئەلکترۆنی:** **asokareem@maktoob.com**

**ژمارەی تەلەفۆن: ٢٢٦٠٣١١**

**www.mukiryani.com**

# پێشەكی

بێگومـان فـەرهەنگ قـەڵای پارێزەری زمـانە، نەمـازە زمـانی نەتەوەیەكی هێـرشـدیدەو ستەمدیدەی كوردئاسا؛ چونكە زمان بەخوە قەڵخانی پاراستنی ناسنامەی نەتەوەییە لە شێواندن و فەوتاندا.
هەڵبەتە فەرهەنگ بۆ خوێنەرو، وەرگێڕ؛ یەكێكە لە پێویستترین ئامرازێن لێكۆڵینەوەو، هەمیشە پەنادەرێكی گرنگە.
فەرهەنگسازی هونەرێكی بێ سنوورە؛ چونكە هەمیـشـە لە گۆڕانكاری، گەشەسـەندن و پێشكەفتندایە، كەچی هەرگیز لاپبوونی بۆ نییە میناك خودی زمان؛ كە زیندەوەرێكە لە چێوەی جغزی (رابردوو، ئێرەنگەو ئایینده)دا هاوپێشكەفتنی شارستانییەت دەژی و، بە درێژایی تەمەنی، سێڵئاسایانە پەیڤەگەلێك لێی دەمرن و، پەیڤانێكی نوێ دێنە ئاراوە؛ جا بۆیە دەروازەی ئیجتیهادی زمانەوانی هەمیشە والایەو، هەروەها فەرهەنگسازیش.
گـەرچی فـەرهەنگسـازی بە شـێوەیەكی گشـتـیـانە ئەركی كـۆڕێن زانیـاری و دامودەزگـای رۆشنبـیـرییـە، لە كنی ئێـمەی كـورد بۆتە بەرهەمـێن كـۆششی تاكـەكـەسانێكی دڵسـۆزو سوارچاكی ئەم مەیدانە، كە لەگەڵ هەموو كەموكوڕییەكدا هەژی بەهابەخشی و شانازین.
ئەوەتانێ چیرۆكنووس، وتارڤان و، وەرگێڕی بەناوبانگمان حەمە كەریم عـارف، كە سی ساڵێكە بۆ راژەگوزاری ئەدەبیاتی كوردی خۆی بەختكردووە، سەرباری نووسینی چەندەها پەرتووكی جۆراوجـۆر بە كـوردی و، وەرگـێـڕانی دەیانی تر لە فـارسی و عـەرەبییـەوە بۆ كوردی، لە تەمەنێكی رۆشنبیریی پێگەیشتوودا قۆڵی لەم بوارەشدا هەڵماڵیوە؛ چونكە باش دەركی كردووە، كە فەرهەنگسازی ئەركێكی نەتەوەیی هەرە گرنگە.
وا بەندەش، كـە شـەرەفی ئەركی هەڵبژێری و، زێدەكـردنی پەیڤـێـن كـوردی- بە هەر شێوازێك بێ- پێم بەخشرا، دڵنیام كە ئەم فەرهەنگە كەلێنێكی گەورە لە پەرتووكخانەی كوردیدا پڕ دەكاتەوەو، هەمرە باندۆرێكی ئەرێیانەی لە بزاڤی وەرگێڕاندا لە فارسییەوە بۆ كـوردی دەبێت، بگرە ئاسانكاریش بۆ دانانی فەرهەنگێن دیكەی زمانێن (...؟- كوردی) بە ناوكۆیی فـارسیـیەوە. كەواتە رێگا خـۆش و كـورت دەكاتەوە بۆ دانانی فەرهەنگێن: (فـەرەنسی- كـوردی)، (ئەڵمـانی- كـوردی)، (ئیـتـاڵی- كـوردی)و (ئەرمـەنی- كـوردی)...هتـد بە یارمـەتی فـەرهەنگێن: (فەرەنسی- فـارسی)، (ئەڵمـانی- فـارسی)، (ئیتاڵی- فارسی)و (ئەرمەنی- فارسی)...هتد نەخاسمە ئەم فەرهەنگە:
١- لە تەڤ فەرهەنگێن دیكەی (فارسی- كوردی) دەوڵەمەندترە؛ چونكە تێكڕای پەیڤێن هەردوو فـەرهەنگێن (عـەمـیـد) و (مـوعین)و، زۆرترین ژمارەی پەیڤێن كوردی- بە گشت شـێـوەزارو دەڤـۆكـەوە- گرتۆتە ئامـێـزی خـوەو، هەر ئەمـەش رەسـەنـایەتی و دەوڵەمـەندیی زمانی كوردی دەبەڵگێنێت؛ كە هیچی لە زمانێن بەرجەستەی جیـهان كەمـتر نییە؛ گەر

هەموو وشەکانی سەرانسەری کوردنشێن کۆبکرێتەوە.
**٢- کرکێن پەیڤێن فارسی بە پیتێن عەرەبی و لاتینی تێدا تۆمارکراون؛ کە برایانی کورد لە باکوور و رۆژئاوای کوردستاندا سوودێکی باشی لێوەردەگرن.**
هیوادارم ئەم فەرهەنگە زۆرینەی پێویستی و ئارەزوویێن خوێنەران و، وەرگێران دابین بکات، تکاداریشم لە هێژایان: خوێنەران، پسپۆران، زانایان، وێژەڤانێن و، وەرگێڕان، بە تێبینییێن و هەڵەبژێرییێن خوە دەوڵەمەندی بکەن؛ چونکە هەرگیز چاپی یەکەم و دووەمی فەرهەنگێک بێ هەڵەو کەموکوڕی نەبووە؛ بۆیەش بەلای د. ساموئێل جۆسۆنی فەرهەنگساز و وێژەڤانی ناوداری ئینگلیزی: فەرهەنگساز وەک وێژەڤان نییە کە ئارەزووی ناودەرکەفتنی هەبێت؛ چونکە ئاواتی فەرهەنگساز هەر ئەوەندەیە، کە تیروتوانجی لێنەگرن، کەچی لەم کامەرانییەشدا زۆرینەی فەرهەنگسازان ناکامن!

**جەلال زەنگابادی**

**نیسانی ٢٠٠٥**

# زمان لە هاوکێشەی نەتەوەییدا

حەمە کەریم عارف

## «١»

زمان، فاکتەرێکی هەرە گرنگی یەکخستن و پێکەوە گرێدانی ئەندامانی هەر کۆمەڵێکە چ لە رووی کۆمەڵایەتی و چ لە رووی سایکۆلۆژییەوە، دیارە لە ئەنجامی ئەمەوە یەکەیەکی کۆمەڵایەتی دێتە ئاراوە. واتە زمان بنەمایەکی سەرەکی پێکهاتەی بوونی نەتەوەیی وەکو قەوارەیەکی کۆمەڵایەتی پێک دێنێ. (ساطع الحصری) لە کتێبی «چەند وانەیەک لەمەڕ سەرهەڵدانی بیری نەتەوەیی»یەوە دەڵێت: «زمان روح و ژیانی نەتەوەیە، زمان لە بری تەوەری نەتەوەیی و بڕبڕەی پشتییەتی. ل٢٦». دیارە کە ئەمە بایەخی زمان بێ لە پێکهاتەی بونیادی کۆمەڵایەتیدا، مانای وایە بایەخدان بە زمان بە تایبەتی بۆ نەتەوەی بندەست، نەک ئەرکێکی ئاساییە، بەڵکو دەچێتە خانەی خەباتی هەرە جدییەوەو فەرامۆش کردنی یەکجار مەترسیدارە. چونکە هەر نەتەوەیەک زمانەکەی بمرێت بەخۆیشی دەچێتە خانەی مردووانەوە. هەر لەم پێوەدانگەوە، گەلەک لەو گەل و میللەتانەی کە چەپۆکی رۆژگار، یان هەر هۆیەکی دی دەربەدەر و ئاوارەی کردوون، دەستبەرداری زمانی خۆیان نابن و لە جاران پتر خۆیانی پێوە خەریک دەکەن. دەیکەن بە سەنگەری بەرەڤانی و مانەوەی نەتەوەیی. دیارە لێرەدا دەبێ ئاماژە بەوە بکرێ کە نەتەوەی بندەست، بە حوکمی جەوهەر و کرۆکی پێشکەوتووانەی دۆزەکەی ناتوانێت کۆنەپەرست و بەرچاو تەنگ بێت، راستە ئەمڕۆ دنیا زۆر بچووک بووەتەوەو مرۆڤی ئەم سەر زەوینە، وەکو ئەوە وان لە یەک ماڵدا بژین، بەڵام پێوەندی کردن بەجیهانەوەو بوون بە ئەندام لەم جیهانەدا، لە رێگەی گەلێکی دیادیکراو و خاکێکی نەتەوەیی دیاریکراوەوە دروست دەبێت، بەمەش جارێکی دی بایەخی زمان بەدیار دەکەوێتەوەو بێگومان زمانی ستاندارد «زمانی خوێندن و نووسین» ئەهلی ئەدەب و قەڵەم جڵەوداری دەکەن و ئەهلی ئەدەب و قەڵەمیش، کە بابەتی بەرودوایان، مرۆڤ و ئازادی مرۆڤە، وێڕای ئەوەی کە لەسەریانە خۆ لە قەرەی مالیجەی گرفتە جیهانی و گەردوونی و ئینسانییەکان بدەن، دەبێت ئەوەشیان لەبیر نەچێت کە جەماورێکی تایبەتی و دیاریکراو بە زمانێکی تایبەتی دیاریکراو دەدوێن و ئەم دوو تایبەتمەندییە دەلالەتی کارە ئەدەبی و رۆشنبیرییەکان دیاری دەکات، بەر لەوەی نێوەڕۆکی جیهانیانەی دیاری بکات، «بڕوانە الادب من الداخل، ل١٥٥».

## «٢»

هەر میللەتێک، زمانی ستانداردی یەکگرتووی نەبێت، بە تایبەتی کە بندەست بێت و بێ دەوڵەتی سیاسی بێت، ئەوا یەکێک لە فاکتەرە هەرە گرنگەکانی بەرگری کردن و بەرەڤانی لەخۆ، لەدەست دەدات و ئەگەری پارچە پارچە کردن و بە چەند نەتەوە کردنی زۆر زیاد دەبێت، واتا ئەگەری مەرگی نەتەوەی دایک و لەدایکبوونی چەند وردە نەتەوەیەکی بێ شەخسییەت و لاواز دێتە ئاراوە. رەنگە هەندێک لەو وردە نەتەوانەش بە تێپەڕبوونی رۆژگار، بە یەکجارەکی زمانی زگماکی خۆی تەرک بکات و زمانی نەتەوەیەکی دی وەربگرێت. بەمەش خۆی دەدۆڕێنێ و لە نێو ئەو نەتەوەیەدا دەتوێتەوە کە پێشتر زمانەکەی وەرگرتووە... هەموو دەزانین کە پرۆسەی تواندنەوەی نەتەوەی کورد چ لە باری فیزیایی و چ لە باری مەعنەوییەوە، لەمێژە لە گەڕدایە و لێرە و لەوێش، کەم و زۆر سەری گرتووە، دیارە ئەم هەوڵ و پرۆسانەی دوژمنان و داگیرکەرانی کورد خۆی لە خۆیدا ئەوە دەگەیەنێت کە بایەخ و گرنگی زمانی نەتەوەیی «زمانی خوێندن و نووسینی یەکگرتووی کوردی» بە ئەندازەی بایەخی قەوارەی سیاسی گرنگ و هەندێک جار گرنگتریشە. رەنگە هەندێ جار نەبوونی قەوارەی سیاسی وەکو ئەمری واقیع بە تۆبزی بسەپێنرێت و ئاسایی بنوێنێ، بەڵام نەبوونی قەوارەی زمانەوانی «لغوی» ئاسایی نییەو ئەگەر خۆمان، خۆمان بین و خاوەنمان هەبێت، وەکو ئەمری واقیع نایەتە سەپاندن. هەر بۆیە پابەندبوون و خۆبەستنەوە بە زمانی ستانداردی نەتەوەییەوە خۆی لە خۆیدا سەنگەرێکە بۆ بەگژداچوونی پرۆسەی تواندنەوەی نەتەوەی کورد، بۆیە هەر هەوڵدانێکی نووسین بۆ ئەوەی زمانی ناوچەیی لە ناوچەیەکی تەسکدا بمێنێت، کارێکی گەلەک نابەجێیەو ئاوەو لە ئاشی دوژمن دەکرێت... پێویستە زاراوەکانی زمانی نووسینمان یەک بخەین و گیروگرفتی زمانەوانی ناپێویست بۆ خۆمان دروست نەکەین و لە مەنهەجییەت دوورنەکەوینەوەو ئەنارشیزمی حزبایەتی تەسک بۆ نێو زمانەکەمان نەهێنین، و هاوسەنگی زمان لەدەست نەچێت.

## «٣»

بێگومان، زمانی کوردی، لە هەر هەموو ئەو وڵاتانەدا کە بە ناهەق کوردیان پێوە لکێنراوە، سەرکوتکراوە و دەکرێت و دەیان پرۆسەی تواندنەوە و شێواندن و گەشە نەکردنی یەکجار خەتەری بۆ وەگەڕخراوەو نەک هەر ناهێلرێت رەواج پەیدا بکات، بەڵکو زۆر بە وردی هەوڵ دەدرێت لەبەر چاوی رۆڵەی نەتەوەی کورد بخرێت و وا بێتە بەرچاو کە زمانی کوردی، زمانێک نییە بتوانێت گوزارشت لە بابەتە ئینسانی و زانستییەکانی بکات و ببێت بە زمانی بەخشش!... بۆ وێنە بەرنامەی خوێندنی کوردی، قوتابخانەکان لە کودستانی باشوور، هێندە سەقەت و ناکوردییە مەگەر هەر بلێین شا بە تاقەتی قوتابی داماو، برۆ سەیری وەرگێڕانی کیمیا و فیزیا و بیرکاری و تەنانەت وانە ئەدەبییەکانیش

بکە، ئەوجا تێدەگەین لە دیوەخانان چ باسە... لە لایەکی دیکەوە، زمانی کوردی لەو وڵاتانەدا، نە زمانی نان پەیداکردنە، نە زمانی ژیانە، نە زمانی کار و کاسبییە، نە زمانی رۆشنبیرییە و نە لە قوتابخانەکاندا دەخوێنرێت... لە کاتێکدا ئەم واقیعە بە چاوی خۆمان دەبینین و زۆر چاک دەزانین کە زمان کۆڵەکەیەکی هەرە سەرەکی پێکهاتەی بوونی نەتەوەییە، وەکو قەواریەکی کۆمەڵایەتی، دەبێت حیکمەت و فەلسەفە چی بێ لەوەی کە دەمێ ساڵە دەستەوەستان دانیشتووین و هیچمان لەم بارەیەوە نەکردووە؟ بێگومان بەشێک لەمەش دەکەوێتە ئۆباڵی شەڕی براکوژی، ئێ بۆ بکرێت؟ خزمەتی زمان و رۆشنبیری نەتەوەیی لە شەڕ لەپێشتر نییە؟! هەر میللەتێک خاوەن و دڵسۆزی هەبێ، بە ١٠-١٥ ساڵ زۆر شت دەکات.

«٤»

١٠-١٥ ساڵە!... گلەیی لە کێ بکەین، بەگژ کێدا بچین، کێ خەتابارە، خەتایی کێ بگرین، کێ گوێ دەگرێت، کێ بە تەنگەوە دێت؟! ئەوە حاڵی زمانی نەتەوەییمانە و لەم باشوورە حەیاتەدا، ئۆرگانی حزبەکانمان بە زمانی عەرەبی دەردەچن!... لە رۆژنامە کوردییەکان پتر بایەخیان پێ دەدرێت، بودجەیان بۆ تەرخان دەکرێت! بۆ؟! ئاخر ئێمە چ پێویستیمان بەوەیە رۆژنامە بە زمانی عەرەبی دەربکەین، یان کار گەیوەتە رادەیەک هەندێک جار شانازی بەوەوە بکرێت، کە یارۆ زمانی عەرەبی لە زمانی کوردی باشتر دەزانێت!...

لە کاتێکدا زۆر ئاساییە کوردێک لە هەر پلەو پایەکدا بێت عەرەبی باش نەزانێت وەکو چۆن عەرەبێک کوردی نەزانێت یان باش نەیزانێت، ئەگەر لە سەردەمی خۆیدا ناچار کرابین و دەسەڵاتی مەرکەزی عێراق بۆ وەی لێمان حاڵی بێ کە چی دەڵێین و چ دەکەین داوایان لێ کردبین بە زمانی عەرەبی بنووسین، ئەوا بۆ ئەو قۆناغە، ئەو داوا نابەجێیەی حکوومەتی نێوەندی رەنگە پاکانەی خۆی هەبووبێت رەنگە کەمێکیش بەدرۆ دڵی خۆمان دابێتەوە، چ قەیدییە، دۆزی نەتەوەکەمان بە برایانی عەرەبیش دەناسێنین... ئەوا بۆ ئێستا و قۆناغی ئەمڕۆی ئێمە ئاشکرایە رۆژنامە ئاراستەی خەڵکی خوێندەوار دەکرێت، و خوێندەواری عەرەبی ئەمڕۆ گیروگرفت و خەمەکانی خۆی هێندە کەم نین و هێندەش دەست بەتاڵ نییە، بێ لەم رۆژگارە تیژ تێپەڕەدا کاتی خۆی بە خوێندنەوەی رۆژنامەی عەرەبی کوردی بەفیڕۆ بدات و لەوێندەرەوە دۆزی کورد بناسێت، چونکە رێگەی دی هەیە... کەواتە ئێمە بەم کارەمان دەمانەوێت کێ بدوێنین و چی بڵێین؟!

خۆ لە رێگەی بەرنامەیەکی یەک سەعاتی رۆژانەی ئاراستەکراوی رادیۆیی یان تەلەفزیۆنییەوە ئەم کارە ئاسانتر دێتە ئەنجامدان. خۆ ئەگەر مەسەلە ناساندنی دۆزی کورد بە عەرەب بێت و ئەم کارە زۆر زەروری بێت، ئەوا بە هەمان ئەندازە و بگرە پتریش زەرورییە کە دۆزی کورد، بۆ وێنە بە جەماوەری ئینگلیز و فەرەنسی و ئەڵمانی و رووس و ئەمریکی و... هتد بێتە ناساندن با بە زمانی ئەوانیش بکەوینە رۆژنامە دەرکردن.

## «٥»

بە نیسبەت زمانی کوردییەوە مەخابن تا ئەوڕۆی زمانی ستانداردمان نییە: نووسینی کوردێکی باشووری کوردستان لە زێی گەورە هێورتر ناچێ، دیارە نووسینی کوردێکی باکووری کوردستانیش لە زێی گەور هێورتر نایەت! کەواتە کیانێکی زمانەوانی نەتەوەیی یەکگرتوومان نییە، کە کورد لە هەر شوێنێک بێت یەکیان بخات.
هەموو دەزانین، زمان دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی ئاڵۆزە و هەموو گەشەکردنێکی کۆمەڵاتیش هەندێک سست و خاوە و ماوەیەکی تا رادەیەک زۆری گەرەکە تا ئەنجام بەدەستەوە دەدات، ئێمە ناڵێین زمانی نەتەوەیی یەکگرتوو بە قرار دروست دەبێت... نەخێر، بەڵکو بە جۆرێکی خۆڕسک و لە ئەنجامی پەرەسەندنی ئاسایی خۆیەوە و بە پشتیوانی و ئاراستەکاری زۆر فاکتەری رامیاری و ئابووری و رۆشنبیری و پەروەردە و فێرکردنەوە، ئەو قەوارەیە بەرە بەرە چێدەبێت، پێم وایە ئەو قەوارەیە بۆ کورد ئەگەر لە قەوارەی سیاسی گرنگتر نەبێت، ئەوە هاوتای قەوارەی سیاسییە «بڕوانە رێگای کوردستان ژمارە ١٤٠ ١٠/١/١٩٩٥ لاپەڕە هەشت «حەمە کەریم عارف» چونکە ئەگەری دروستبوون و دروستکردنی چەند وردە قەوارەیەکی سیاسی بۆ کورد زۆر دوور نییە، جا ئەم وردە قەوارە سیاسییانە. گەر قەوارەی زمانی ستاندارد بەیەکەوەیان گرێ نەدات، ئەوە ئەگەری ئەوە پەیدا دەبێ کە کورد بکرێت بە چەند وردە نەتەوەیەکی وەک: گەرمیانی، سۆرانی، هەوامانی، بادینانی...هتد.

## «٦»

زمان دەورێکی گەلەک مەزن لە یەکخستنی نەتەوەدا دەبینێ، یەکێتی زمانی نەتەوەیی «خوێندن و نووسین» فاکتەرێکی گەورەیە بۆ هاریکاری نێوان رۆڵەکانی نەتەوە. هەڵبەت ئەم دەورە لە چوارچێوەی مەرجە مێژوورییەکاندا دەبینێت، بۆیە لە سەرمانە مەودای نەتەوەیی زمان کەشف بکەین و لە ناو مێژوودا وەگەڕی بخەین و لەوەی پتر فەرامۆشی نەکەین، دەبێ بایەخی رۆشنبیری و سیاسی فاکتەری زمان لە پاڵ فاکتەرە پێکهێنەرەکانی دیکەی بوونی نەتەوەییدا وەگەڕ بخەین.
ئەوەی لێرەدا مەبەستمە زمانی قسەکردن نییە، چونکە زمانی قسەکردن، لە هەڵسوکەوت و مامەڵەی رۆژانەدا بەکار دێت و هۆیەکە لە هۆیەکانی لێکدی گەیشتن، بەڵکو مەبەست زمانی خوێندن و نووسینە کە دەوری هەرە سەرەکی و قورس لە رێکخستنی فیکرو هۆشدا دەبینێت، هەر لەبەر ئەمەشە کاتی ئەوە هاتووە سڵ لە بەکارهێنانی زمانی کوردی نەکەینەوەو دەبێت لە هەموو بوارە رۆشنبیری و زانستی و ئەدەبی و هونەرییەکاندا زۆر جدیانە بەکاری بهێنین و چالاکانە وەگەڕی بخەین و بکەوینە سەر سکەی ئاسایی خۆی و رۆڵی مێژوویی خۆی لە چوارچێوەی هەر قۆناغێکی مێژوویدا بگێرێت و ببێت بە زمانی

بەخشش، دەبێ هەوڵی ئەوە بدرێت خۆ لە بەکارهێنانی وشەی ناوچەیی دووربگرین و ئەو وشەو زاراوانە بەکار بهێنین کە لە تێگەیشتنی زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی کوردەوە نزیکن و پێویستە زۆر جدیانە کار بۆ ئەوە بکرێ کە ئەو دوو هێڵە هاوتەریبەی کە ئێستە بە هەردوو شێوەی کرمانجی سەروو و خواروو بەرهەمیان پێ دێتە نووسین، تەواو لە یەکدی نزیک بخرێنەوەو تا لە ئەنجامدا دەبن بەیەک هێڵ و زمانی ستانداردی نەتەوەییمان پێک دەهێنن.

«٧»

بێگومان، زمان رۆڵێکی یەکجار مەزن لە یەکخستنی نەتەوەییدا دەبینێت و فەرامۆش کردنی ئەم فاکتەرە کارێکی نابەجێیەو دوژمنانی کورد رژدتر دەکات لە سەر بەگژداچوونمان و نابێت ئەم سەنگەرە بە چۆڵی بهێنێتەوە. هەڵبەتە هەر نەتەوەیەک زمانی نەتەوەیی یەکگرتووی نەبێت کەلچەری یەکگرتووی نابێت و ئاسانتر دێتە داگیرکردن و بەرە بەرە زمانەکەی دێتە کوشتن و جۆگەلەی هزرو بیرو بەهرەی زانا و داناو نووسەرو هونەرمەندانی، دەخرێتە سەر باخی رۆشنبیریی داگیرکەر و بە زمانی داگیرکەر، مەرگی زمانی زگماکی خۆی رادەگەیەنێت، دیارە مەرگی زمانیش هاوتای مەرگی نەتەوەیە.

«٨»

جا لەبەر هەموو ئەو هۆیانەی سەرێ بەندە شانم دایە بەر باری گرانی ئەم کارە و سوور دەمزانی کە فەرهەنگ لە بنەڕەتدا دەکاتە کۆکەردنەوەی وشە بنەڕەتییەکانی زمان، زمانیش وەکو هەر بوونەوەرێکی زندوو، لە زاوزێ و گۆڕانی بەردەوامدا دەبێت، بۆیە فەرهەنگ وەکو بێستانەو دەبێ بژاری بەردەوام بکرێت، دەنا ناتوانێ رەونەقی خۆی بپارێزێ و بەگەڵ رەوتی رۆژگار بکەوێ، هیچ فەرهەنگێک بە حوکمی سروشت و تەبیعەتی زمان و بەرینی و دەوڵەمەندی زمان و ریشە داکوتانی لە هەموو بوارە ژیانی و ژیارییەکان ناتوانێ لە کەم و کوڕی بەدەر بێ. جا کاری من لێرەدا تەنیا ئەوەندە بووە بە گوێرەی توانای خۆم بناغەیەکم بۆ ئەم جۆرە کارە داناوە و با خەڵکی دیکەش بە چاوی رەخنەگرییەوە تەماشای بکەن و لە هەر شوێنێ هەڵەیەکیان بینی چاوپۆشی لێ نەکەن و راستی بکەنەوە و «ماڵی قەڵپ سەری ساحێبی» و رەخنەی بونیادنەرانەم لە گیان خۆشترە تا ستایشی خاڵی لە راوبۆچوونی جدی.

لە کۆتاییدا پێویستە ئەوە بڵێم ئەمە ئەو کارەیە کە توانیومە بیکەم، نەک ئەوەی کە ویستوومە بیکەم.

بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە کتێبی: پەلکە رەنگینە، وەزارەتی رۆشنبیری، چاپی یەکەم ٢٠٠٤، حەمە کەریم عارف ل٢٢٥-٢٣٠.

# سەرچاوەکانی ئەم فەرهەنگە:


١- فرهنگ عمید/ چاپ سوم ١٣٦٩ (بچووک)
٢- فرهنگ عمید دوو بەرگی چاپ ششم /١٣٦٤ امیر کبیر، تهران
٣- فرهنگ فارسی (متوسط) دکتر محمد معین، چاپ سیزدهم ١٣٧٨
٤- هەنبانه بورینه- فرهنگ کردی- فارسی
هەژار یک جلدی، سروش/ تهران ١٣٦٩ چاپ اول
٥- فرهنگ عمید (بچووک) چاپ ١٣٦٢/٢٢
مؤسسه انتشارات أمیر کبیر تهران
٦- فرهنگ عربی- فارسی معاصر
تألیف: د. فریده رازی/ ١٣٦٦ تهران، نشر مرکز
٧- دەستوری فەرهەنگی زمانی کوردی- عەرەبی- فارسی
علاءالدین سجادی- بەغدا ١٩٦٢
٨- کورتەیەک لەمەڕ زمان و دەستوری فارسی،
حەمە کەریم عارف ٢٠٠٠،
هەولێر- چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری

## کورتەی ئەو نیشانانەی لەم فەرهەنگەدا بەکارهاتوون

ا–اسم
ا.آ– اسم آلت
ا.جم– اسم جمع
ا.خ– اسم خاص
ا.ص– اسم یا صفت
ا.فا– اسم فاعل
ا.مف– اسم مفعول
ا.مر– اسم مرکب
ا.مص– اسم مصدر
انگل– انگلیسی
پھ– پهلوی
ت– ترکی
حر– حرف
رو– روسی
ص– صفت
ص.ت– صفت تفضیلی
ص.فا– صفت فاعلی
ص.مف– صفت مفعولی
ص.ن– صفت نسبی
ض– ضمیر
ع– عربی
عا– عامیانه
فر– فرانسوی
ق– قید
ق.ص– قید وصفت
ق.مر– قید مرکب
ک– کنایه

لا- لاتینی
م- میلادی
مص- مصدر
مص.ج- مصدر جعلی
مص.ل- مصدر لازم
مص.م- مصدر متعدی
هن- هندی
یو- یونانی



**ا- حر (ئا-A):**
ئەلفی درێژ، پیــــتی ئەلف. (آ)، (أ) لە ئەلفـــبـــای فـــارســـیـــدا بەیەک پیت حەساوکراون، بەڵام لە راستیدا دوو پیتی جیاوازن.

**ائروپلان**- ا (ئایروپلان- ayruplan): باڵەفڕ، فڕۆکە، تەیارە.

**ائین**- ا (ئایین- aîn): دەستوور، ڕێباز، داب‌ونەریت، شەریعەت، سوننەت.

**ائین جمشید**- ا(ئایینی جەمشید aîni cemşîd): نێوی ئاهەنگێکی کۆنی مۆسیقای ئێرانییە.

**ائین دادرس**- ا(ئایینی دادرەس- aîni dadres): دەستوورو رێبازی دادوەری، بنەماکانی محاکەمە.

**ائین نامه**- ا(ئایین نامە- aînname): ئەو دەستوورانەی بۆ جێبەجێ کردنی یاسا یان ئەنجامدانی کاری ئیداری دەنووسرێت، جاران «نیزامنامە»یان پێدەگوت.

**ائینه، ایینه، اینه** -ا(ئایینە- aîne): ئاوێنە، خۆدیک، جام.

**ائینه بخت**- ا(ئاینەی بەخت- aîney bext): ئاوێنەی بەخت، ئەو ئاوێنەیەی کە لە کۆڕی ژن مارەکردندا رووبەڕووی بووک دادەنرێ.

**ائینهء چرخ**- ا(ئایینەی چەرخ- aîney cerx): هەتاو، وەرەتاو، خۆر.

**ائینهء خاوری**- ا(ئایینەی خاڤەری- aîney xaverî): رۆژ، هەتاو، روجیار، خۆر.

**ائینه‌دار**- ا ص(ئایینەدار- aîne dar): دەلاک، بەربەر، سەرتاش.

**ائینهء سکندر**- ا(ئایینەی سکەندەر- aîney skender):

**ائینهء اسکندری**- ا(ئایینەی ئەسکەندەری- aîney eskenderî): ئاوێنەیەک بووە کە ئەرستۆ بۆ ئەسکەندەری دروست کردووەو لە ئەسکەندەرییە، لەسەر بورجێک دایان نابوو.

**آب**- ا(ئاب- ab): شلەیەکە لە دوو هیدروجین و یەک ئۆکسژین پێکهاتووە، لە پلەی گەرمای سەد دێتە کوڵ و لە پلەی سەرمای سفردا دەمەیێ، ئاو.

**آباء**- ا(ئابـاء- aba’): وشـــــەیەکی عەرەبییە، کۆنە، واتا باوکان، تاتا.

**آب آتشگون**- ا(ئـابـی ئـاتـەشـگـون- abî ateşgûn):

**آب آتش رنگ**- ا(ئابی ئاتەش رەنگ- abî ateş reng):

**آب آتش زا**- ا(ئــابــی ئــاتــەشزا- abî ateşza):

**آب آتش نما**- ا(ئـابـی ئـاتـەش نمـا- abî ateşnima): مـەبەست: شـەرابی ئاڵ و سوورە.

**آباد**- ا(ئاباد- abad): خۆش، بەرەونەق، شــــوێنێ ئاوو گــیـــای هەبێ، ئاوەدان، پێچەوانەی وێران. وەکو پاشگر لەگەڵ نێوی گوندو شاران بەکاردێت، وەش.

**آباد بوم**- ا(ئاباد بووم- abad bûm): شوێنی ئاوا، جێی ئاوەدان، یاگێ ئاوەدانە.

**آباد**- ا-ع (ئاباد- abad): هەمـیـشـە، هەتا هەتا، کۆی (أبد)ی عەرەبییە.

**آبادان**- ص(ئـابـادان- abadan): دێ، گوند، ئاوایی، دەگا.

**آبار**- ا(ئابار- abar): بیـری ئاو، کـۆی (بئر)ـە.

**آباژور**- ا- فـــر (ئـاباژور- abajûr): سابات، کەپر، چاتۆڵ.

**آبان**- ا(ئـابـان- aban): مـــــانـگـی هەشتەمی ساڵی هەتاوی ئێرانی، مانگی دووەمی پایز.

**آب انبار**- ا(ئـاب ئـەنـبــــــار- ab enbar): ئەســتــێلی گــەورەی رۆپۆشــراو، شــوێنی عــەمــارکــردنی ئاو، عەماراو، هەسارە، سارداو.

**آبانگاه**- ا(ئـابـانـگـاهـ- abangah): نێوی فریشتەی بەرپرسی ئاوە.

**آب انگور**- ا(ئــابـــی ئــەنــگـــور- abi engûr): شـــەراو، ئاوی ترێ، بە مانای عارەقیش دێت، هاوەو هەنگورێ.

**آب باز**- ا- فـــا(ئاب باز- ab baz): مەلەوان.

**آب بها**- ا(ئاب بەها- ab beha): ئاو بایی، بەهای ئاو، ئەو پارەیەی لەبری ئاوی خواردنەوە دەدرێ.

**آب بینی**- ا(ئابی بینی- abi bînî): ئاوی کەپو، چڵم، ئاوەو لوتێ.

**آب پاش**- ا(ئــاب پــاش- ab paş): ئاوپرژێن، ئامـێـرێکە لە بابەتی مـەسـینە، سەری لولەکەی کون کونە، بۆ ئاودانی گوڵ یان ئاوپرژێنی زەوی بەکاردێت.

**آب پز**- ص(ئــاب پــەز- ab pez): کوڵاو، هێلکەی مریشک یان هەر شـتێکی تر دەخرێتە ئاوەوە تا بکوڵێ، گریناى.

**آب پشت**- ا(ئابی پوشت- abî puşt): تۆمــاو، شــەهوەتی پیــاو کــە لە کــاتـی جـووتبـوون یان دەسـتـپـەڕا، لە گـونانەوە دێتەدەر، شاوەت.

**آب تاختن**- مص- ل(ئاب تاخــتـــەن- ab taxten): میزتن، گمیزکەردەی.

**آب تابه**- ا(ئـاب تـابـە- ab tabe): مەسینە، ئافتاوە،

**آب تلخ**- ا(ئـابی تـەلـخ- abi telx): ئاوی تاڵ، مەبەست شەراو یان عەرەقە.

**آب تــنـــی**- ا- مــص(ئـــاب تـــەنـــی- ab tenî): مەلەکرن لە ئاوی ساردا.

**آب جامە**- ا(ئاب جامە- ab came): جــامی ئاو خـــواردنەوە، جـــامی شـــەراو خواردنەوە، جامۆڵ و ئاو واردەیۆ.

**آب جو**- ا(ئاب جو- ab cü): ئاوی جۆ، بیرە.

**آبجی**- ا(ئابجی- ab cî): کـورتکراوەی ئاغا باجییە، وشەیەکی تورکییە بە مانای خوشک، واڵی.

**آب چین**- ا- فـــا(ئاب چین- ab çîn): وصف، خاولی، کە پاش خۆشتن لەشی پێ هیشک دەکەیەوە.

**آب حـــــیـــــات**- ا(ئـابی هـەیـات- abi heyat): ئـــاوی ژیـــان، دەڵـــێـــن ســـەرچاوەو ئاوێکە لە هادیســـدا، هەر کەسێک لێی بخواتەوە ئیدی نامرێ و گوایە خـدر پێـغـەمـبـەر ئەو ئاوەی خـواردۆتەوە، کینایەیە بە مانای زاری ماشوقش دێت.

**آبخانە**- ا(ئابخانە- ab xane): ئەدەب خانە، ئاودەست، تەوالێت.

**آب خـــسب**- ا- فـــا(ئاب خـــوسب- ab xusb): ئەو چوارپێـــیـــەی کـــە هەر کـــاتێ روباری بێـــتـــەرێ، یان بگاتە تەنکاوێک، لە نێو ئاوەکەدا بخەوێ.

**آب خـست**- ا(ئابخـەست- ab xest): میوەی بێ ئاو، میوەی ترشاوی لە کەڵک کەوتوو.

**آب خو**- ا(ئاب خوو- ab xü): دورگەی زۆر ئاودار.

**آبخـور، آبخـورد**- ا(ئابخـوو، ئابخـورد- abxür, abxürd): ئەو ســـــەرچاوەو کـــانی و رووبارانەی ئاویان لێ دەبرێ و دەخورێتەوە.

**آب خـوری**- ا(ئاب خـوری- ab xûrî): کاسە، جام، پەرداخی ئاو خواردنەوە.

**آبخـــست**- ا(ئابخـــوست- ab xust): دورگەی ئاودار، ئاوەکەی بۆگەن بووبێ،

**آبخون**- ا(ئابخوون- ab xûn): دورگەی فرە ئاو، بۆگەناو.

**آبخـیـز**- ا(ئابخـیـز- ab xîz): زەوی پڕ ئاو، زەوییەکە کە هەر شوێنێکی هەڵکەنی ئاو دێتـــەدەر، شـــەپۆل و هەســـتـــانی ئاو، لافاو.

**آبدار**- ا- فـا(ئابدار- abdar): ئاودار، تەڕوبڕ، گەش و بەڕەونەق.

**آبدارخــــانە**- ا(ئابدارخــــانە- abdar xane): دیوەخــان، ئەو ژووره تایبــەتەی کـە لە دایەرەکـان یان لە مـاڵە گـەورەکـاندا چاو قـاوەو شەربەت و قلیـانی تێدا ئامـادە دەکرێ.

**آبدار، آبدار باشی**- ا- فـا(ئابدار، ئابدار بـــــاشــــی- abdar, abdar başî): بەرپرسی دیوەخان.

**آبدان**- ا(ئابدان- abdan): ئەسـتـێڵ، حەوز، عەماراو، هەسارە.

**آبدان، آبدانک**- ص(ئابدان، ئابدانەک- abdan, abdanek): مـــیـــزڵدان، مگێزەدانی.

**آبـــــدوزدک**- ا(ئـــــــاب دوزدەک- ab düzdek): سرنج، سرنجی شیـرینقە لێدان.

**آبدست**- ا(ئابدەست- abdest): ئاوێک کە دەست و دەموچاوی پێ بشۆن، واتای دەستنوێژ، تەقواو خواناسی و داوێن پاکیش دەگەیەنێت.

**آبدستان**- ا(ئابدەستان- abdestan): مەسینە، ئەو ئاوەی بۆ دەست شتن لە مەسینە دەکرێ.

**آبدوغ**- ا(ئابدوغ- abdûx): دۆ، ئاو و دۆ، ماستاو، ئاڤاماست.

**آب دهان**- ا(ئابی دەهان- abi dehan): ئاوی دەم، لیکاو، تف.

**آب دیده**- ا(ئابی دیدە- abi dîde): ئاوی چاو، ئەشک، ئەسرین، روندک، فرمێسک، عەسرین، هەڵس.

**آبدیده**- ص(ئاب دیدە- ab dîde): ئاو هەڵمژتە، شتێک کەوتبێتە ئاوەوەو ئاوی هەڵمژی بێ.

**آبراهه**- ا(ئابڕاه- abrah): ئاوەڕۆ، ڕێگەی ئاو، رەهەند، کونج.

**آبرفت**- ا(ئابڕوفت- abruft): شتێ کە ئاو لەگەڵ خۆیدا رای دابێ، ئاومالکە.

**آب رفتن**- مص(ئاب رەفتەن- ab reften): چوونە ئاو (بۆ قوماش و جلوبەرگ).

**آبرو**- ا(ئاب رەو- ab rew): ئاوەڕۆ، ڕێگەی ئاو، رەهەند.

**آبرو**- ا(ئابڕوو- abrû): شەرەف، سەربەرزی، ئابڕوو، حەیا.

**آبرومند**- ص(ئابرومەند- abrûmend): بە ئابڕوو، خاوەن شەرەف، بە حەیاو حورمەت.

**آبرون**- ا(ئابروون- abrûn): گوڵی هەمیشە بەهار.

**آبریز**- ا(ئابریز- abrîz): شوێنی رشتنی ئاو، ئەو چاڵەی کە چڵکاوی تێدەرێژن، ئاودەست.

**آبریزان**- ا(ئابریزان- abrîzan): جەژنێکی کۆنی ئێرانییە، دەکەوێتە رۆژی ٣١ی تیرماه.

**آب زندگی**- ا(ئابی زندەگی- abi zindegî): ئاوی ژیان، ئاوی حەیات.

**آبزه**- ا(ئابزیە- abzi h): هەر درزێک ئاوبدات، ئەو درزو کەلێنە باریکانەی کە ئاو دزەیان لێوە دەکات.

**آب زیرکاه** - ا- ص(ئابی زیرکاه- abi zîrkah): ئاوی ژێرکا، کینایەیە بۆ بنیادەمی شەیتان و بە ئازارو موزیر و ریاکار کە بە رواڵەت سادەو ساکار بنوێنێ، بەڵام لە ژێرەوە موزیرێ، موخەنەت، لە بنەوەبڕ، بوغز لەزگ، دڵڕەش.

**آبسال، آبسالان**- ا(ئابسال، ئابسالان- absal): باغ، بێستان، وەرزی بەهار.

**آبست**- ص(ئابیست- abist): ئاوس، سوککراوەی ئابیستەنە، ئاوورە.

**آبستن**- ص- ا(ئابیستەن- abisten): ژن یان حەیوانی ئاوس، باردار، بۆ ئینسان حامیلە، سک پڕ.

**آبستنی**- ا- مص(ئابیستەنی- abistenî): ئاوس، بارداری، سک پڕی، لەیەکەم رۆژی گرتنەوە تا رۆژی نەجات بوون، لە مرۆڤدا ماوەی ئاسایی ٢٨٠ رۆژە.

**آبسته**- ص- ا(ئابەستە- abeste): زەوییەک کە ئاوی کرابێتە سەرو ئاوی لەسەر وەستابێ و تۆویان دابێ، ئاوەنیا.

**آب سوار، آب سواران**- ا(ئاب سەڤار، ئاب سەڤاران- ab sevar, ab sevaran): بڵقی سەر ئاو، بە تایبەتی ئەو بڵقانەی لە کاتی بارینی باراندا، لە نێو ئاو دروستدەبێ.

**آب سیاه، آب سیه**- ا(ئابی سیاه، ئابی سییەه- abi sîyeh, abi sîyah): یەکێکە لە نەخۆشییەکانی چاو کە دەبێتە هۆی کوێری و نابینایی، ئاوی رەش، بەو شەرابەش دەگوترێ کە لە ترێی رەش دەگیرێ.

**آبشار**- ا(ئابشار- ab şar): تاڤگە، ئاوێ لە بەرزییەوە بڕژێتە نشێوی، سولاڤ، قەڵبەز.

**آبشتن**- مص(ئابەشتەن- abeşten): ڤەشێرتن، پەنهان کردن، شاردنەوە.

**آبشت**- ص- م(ئابەشت- abeşt): شاردراوە، پەنهان، جاسوس.

**آبشتنگاه**- ا(ئابەشتەنگاه- abeştengah): شوێنی ئاو خواردنەوە، خەڵوەتخانە، ئاودەست.

**آبشخور**- ا(ئابیشخور- abişxûr): شوێنی ئاو خواردنەوە، سەرچاوەو کانی، رزق و رۆزی.

**آب شدن**- مص(ئاب شودەن- ab şuden): توانەوە، بوون بە ئاو، بەکینایە شەرمەزار بوون، تەریق بوونەوە، بوهژین.

**آبشنگ**- ا(ئابشەنگ- abşeng): تەشتی خۆشۆردن.

**آبزن**- ا(ئاب زەن- ab zen): تەشتی خۆشتن.

**آبشنگرفی**- ا(ئابی شەنەگەرفی- abi şengerfî): کینایەیە لە شەرابی ئاڵ، لە فرمێسکی خوێنین.

**آب شیب**- ا(ئاب شیب- abşîb): ئاوەڕۆی سەرەولێژ.

**آبغوره**- ا(ئاب غورە- abxûre): ئاوی بەرسیلە، ئاوەو هاڵێ.

**آبفت**- ص- ا(ئابەفت- abeft): جلک، جلکی ئەستور.

**آبک**- ا(ئابەک- abek): جیوە.

**آبکار**- ا- ص(ئابکار- abkar): ئاوکێش، سەقا، مەیفرۆش، عەرەقخۆر.

**آبکش**- ا- فا(ئاب کەش- abkeş): سوزگی، پلاو پاڵێو.

**آبکند**- ا(ئاب کەند- abkend): ئاودڕ، عەماراو، ئەستێل.

**آبکوهه**- ا(ئاب کووهە- abkûhe): شەپۆلی ئاو، پێل.

**آبکی**- ص(ئابەکی- abekî): شل، ئاودار، پڕ ئاو.

**آبگاه**- ا(ئابگاه- abgah): کەلەکە، قەبرغە، خالیگە، ئەستێل، میزڵدان.

**آبگرد**- ا(ئاب گەرد- abgerd): گێژاو، گێژەنگ.

**آبگردان**- ا(ئاب گەردان- abgeradan): ئاو گەردان، کەوچکێکی گەورەی لە مس دروستکراوە ئاوی پێ لە مەنجەڵیکەوە بۆ مەنجەڵێکی

دی دەگوزانەوە.

**آبگرم**- ا(ئابی گـەرم- abi gerim): ئاوی مەعدەنی، گەڕاو، ئاوێکە لە هەندێ شوێنان هەڵدەقوڵێ و گۆگردو بابەتی مەعدەنی تری تێدایەو بۆ چارەسەری نەخۆشیی پێست باشە.

**آبگز**- ص- ا(ئاب گەز- abgez): میوەی ترشاوو خراپ، میوەیەک کە لەنێو ئاودا خراپ بووبێ.

**آبگند**- ا(ئاب گەند- abgend): ئاوی بۆگەن، گەناو، زۆنگاو.

**آبگون، آبگونه**- ص(ئابگوون، ئابگوونە- abgûn, abgûne): ئاو ئاسا، ساف و روون وەکو ئاو.

**آبگیر**- ا(ئابگیر- abgîr): گۆلاو، حەوز، ئەستێل، چاڵاو.

**آبگینه**- ا(ئابگینە- abgîne): شووشە، بلور، ئاوێنە، شەراب، مینا.

**آب لمبو**- ص(ئابلەمبو- ab lembu): میوەی گەییوی پلیشاوەی ئاودار.

**آب لوج، آب لوچ**- ا(ئاب لوج- ئاب لوچ- abluç): شەکر، نەبات، قەندی سپی.

**آبله**- ا(ئابلە- able): تلۆق، نەخۆشی ئاوڵە.

**آبله فرنگی**- ا(ئابلە فەرەنگی- able ferengî): ئەو تلۆقانەی بەهۆی نەخۆشی سیفلیسەوە لەسەر پێستی بەدەن پەیدا دەبن.

**آبله کوب**- ا- ص(ئابلە کووب- able kûb): ئەو کەسەی خەڵکی دژی ئاوڵە دەکوتێ.

**آبله کوبی**- ا- مص(ئابلەکووبی- able kubî): کوتان دژی ئاوڵە.

**آبله‌گاوی**- ا(ئابلە گاڤی- able gavî): ئاوڵەی چێڵ و گایان.

**آب مروارید**- ا(ئابی مورڤارید- abi murvarîd): ئاوی سپی، نەخۆشی چاوە دەبێتە مایەی تاریکی و نابینایی چاو.

**آب مقطر**- ا(ئابی موغەتەر- abi muxeter): ئاوی کوڵێنراوی پاڵێوراو کە لە پزیشکگەری و دەرمانسازیدا بەکار دێت.

**آب نبات**- ا(ئابی نەبات- abi nebat): جۆرە شیرینییەکە کە بە شیلەی شەکر دروستی دەکەن.

**آب نما**- ا(ئاب نیما- abnima): حەوز، جۆگەی ناو ماڵ یان باغ کە ئاوەکەی دیاربێ، سەراب، تراویلکە.

**آبنوس**- ا(ئاب نووس- ab nûs): درەختێکە لە هندو حەبەشە دەڕوێ، وەکو دارگوێز گەورە دەبێ و لق و پۆپ دەهاوێ، دارەکەی قورس و قایمە، پەڵەی رەشی پێوەیە، دوای برینەوەی ماوەیەک لە ئاوی دەخەن تا رەش ببێ.

**آبو**- ا(ئابوو- abû): گوڵی نیلوفەر، نیلوفەری شین.

**آب ورز**- ص.فا(ئاب ڤەرز- ab verz): ئاوباز، مەلەوان.

**آب وند**- ا(ئاب ڤەند- ab vend): کاسەی ئاو، گۆزە.

**آبو نمان**- ا(ئابوونیمان- abuniman): ئابوونه، پارەی بەشداری لە رۆژنامە یان گۆڤار.

**آبی**- ص،ن(ئابی- abî): ئاوی، روەک و گیاندارانی ئاوی، شین؛ وەکو رەنگی ئاسمان، رەنگی ئاوی دەریا.

**آبیار**- ا- ص(ئابیار- abyar): میراو، کەسێک کە بەرپرسی ئاودانی باغ و مەزراو ماڵان بێ.

**آبیاری**- ا- مص(ئابیاری- abyarî): ئاودانی باغ یان کشتوکاڵ، ئاودێری

**آبیده انیز**- ا(ئابیدە ئانیز- abîde, anîz): شەرارە، پزیسک.

**آپارتمان**- ا(ئاپارتمان- apartman): کۆشک و سەرا.

**آپاندیس**- ا- فر(ئاپاندیس- apandîs): ریخۆڵە کوێرە، ریخۆڵەیەکی بچوکی زیادە کە دەکەوێتە لای راستی بەدەنی بنیادەمەوە.

**آپاندیست**- ا(ئاپاندیسیت- apandîsit): ئاوسانی ریخۆڵە کوێرە، کە گەلەک بە ئازارەو بە نەشتەرگەری مالیجە دەکرێ.

**آپاتئوز**- ا(ئاپاتیوز- apatiyuz): پەرستنی مرۆڤ بە تایبەتی پاشایان لە یۆنان و رۆم-ی کۆن، دیمەنی کۆتایی شانۆگەری.

**آپیس**- ا(ئاپیس- apîs): گای پیرۆز کە میسرییانی کۆن پەرستوویانە، تەوێڵی سپی بووەو وێنەی هەڵۆ یان بازی لەسەر پشت بووە.

**اتابای**- ا(ئاتابای- atabay): پیاوی گەورەو ماڵدار، ناوی تیرەیەکی گەورەی تورکمانە.

**اتاش**- اداش- ت- ا(ئاتاش، ئاداش- ataş, adaş): هاونامە، هەمنامە.

**اتاشه**- فر- ا(ئاتاشە- ataşe): وابەستە، فەرمانبەرو پیاوی سەفارەتخانە.

**اتاشه میلیتر**- ا(ئاتاشە میلیتر- ataşe mîlîtr): وابەستەیی سوپایی.

**اتاک**- ا(ئاتاک- atak): هێرش، پەلامار، حەملە.

**اتبین**- ا(ئاتن بین- atin bîn): نێوی بابی فەرەیدونە، چاکەکار، خاوەن گوتارو رەفتاری چاک.

**آتریاد**- ا(ئاتیریاد- atiryad): دەستەیەک سەرباز.

**اتش**- ا(ئاتەش- ateş): ئاگر.

**اتیش**- ا(ئاتیش- atîş): ئاگر.

**ادیش**- ا(ئادیش- adîş): ئاگر.

**ازیش**- ا(ئازیش- azîş): ئاگر.

**ازر**- ا(ئازەر- azer): ئاگر.

**آتش افروز**- افا(ئاتش ئەفرووز- ateş efrüz): هەر شتێک ئاگری پێبکرێتەوە، بەو کەسەش دەگوترێ کە ئاگر هەڵایسێنێ، فیتنەگێر، دەستەچیلە.

**آتش افروزنه**- امر(ئاتەش ئەفرووزنە- ateş efrüzene): فیتنەگێر، ئاگر هەڵگیرسێن، دەستەچیلە.

**آتش افروزی**- ا- مص(ئاتەش ئەفروزی- ateş efrüzî): فیتنەگێری، ئاورهەڵایسێنی.

**آتش انداز**- ا- فـــا (ئاتەش ئەنداز- ateş endaz): کەسێک لە کورەی خشتسازی یان تونی گەرماودا، ماموری هەڵگیرساندنی ئاگرە.

**آتشبار**- ا- فا (ئاتەشبار- ateşbar): هەر شتێک کە ئاگری لێوە ببارێ، لە زاراوەی سوپادا بریتییە لە دەستەیەک سەربازی تۆپخانە، مەفرەزەی تۆپخانە، تفەنگ، تۆپ.

**آتشـبـازی**- ا-ص(ئاتەشـبـازی- ateş bazî): ئاوربازی، یاریکردن بە ئاگر، ئاگربڕ.

**آتش بس**- ا(ئاتەش بەس-ateş bes): ئاور بەست، لە زاواوەی سوپاییدا دەکاتە هودنەو راگرتنی شەڕ،

**آتشپا**- ص(ئاتەشپا- ateş pa): خێرا، لەز، تیژڕۆ، خۆشبەز، بێ ئارام.

**آتش پارسی**- ا(ئاتەش پارسی- ateş parsî): تامێسکە، عازەبە، جوانە زمە.

**آتشپارە**- ا(ئاتەش پارە-ateş pare): پولو، پەنگر، پەڕەنگ، سکڵ، منداڵی هاروهاج و نەسرەوت.

**آتش پرست**- ا- فا (ئاتەش پەرەست- ateş perest): ئاگرپەرست، زەردەشتییەکان، چونکە رێزی ئاگریان دەگرت، پێیان دەگوترا ئاگر پەرەست.

**آتشخانە**- ا(ئاتەش خانە- ateş xane): کورە، چەکی ئاگر وەکو تۆپ و تفەنگ.

**آتشخور، آتشخارە، آتشخای**- ص- فا (ئاتەشخور، ئات شخارە، ئاتەشخای- ateşxay): ئاگر خۆرە، مەلێکە کە ئاگر دەخوات، ئایرەمەلی، کینایەیە، بۆ بنیادەمی زۆردارو ستەمکار.

**آتشدان**- ا(ئاتەشدان- ateşdan): کورە، کوانوو، مەقلی، وەجاغ، ئاگردان.

**آتشرنگ، آتش فام**- ص(ئاتەش رەنگ ئاتەش فام- ateşreng, ateşfam): قرمز، سوری تۆخ، بە رەنگی ئاگر.

**آتشزا**- ا- فا (ئاتەش زا- ateşza): ئەوەی کە ئاگری لێ بەرهەم دێ.

**آتش زنە**- ا(ئاتەش زەنە- ateş zene): چەخماخ، بەردو ئەستێ.

**آتش سوزی**- ا- ص(ئاتەش سوزی- ateş suzî): ئاگر کەوتنەوە.

**آتش فام**- ص(ئاتەش فام- ateş fam): سوری تۆخ، بە رەنگی ئاگر.

**آتش فشان**- ا- فا (ئاتەش فەشان- ateş feşan): گڕکان، بورکان.

**آتشک**- ا(ئاتەشەک- ateşek): گوڵەستێرە، ئاوڵە.

**آتشکار**- ا-ص(ئاتەشکار- ateşkar): ئاسنگەر، ماموری ئاگرکردنەوە.

**آتش گردان**- ا(ئاتەش گەردان- ateş gerdan):

**آتش سرخ کن**- ا(ئاتەش سورخ کون- ateş surxkun):

**آتش چرخان**- ا(ئاتەش چەرخان- ateş çerxan): سەبەتەیەکی بچووکی لە تەل دروستکراوە، چەند کۆڵۆ خەڵوزو ئاگری تێدەکەن و لە هەوادا بایدەدەن تا ئاگر بگرێ.

**آتش گرفتن**- مص(ئاتەش گیریفتەن- ateş giriften): ئاگر گرتن و سوتانی شتێک، هەروەها کینایەیە لە تورە بوون و هەڵچوون.
**آتشگون**- ص(ئاتەشگوون- ateş gûn): وەکو ئاگر.
**آزرگون**- ص(ئازەرگون- azer gûn): وەکو ئاگر.
**آتش فام**- ص(ئاتەش فام- ateş fam): وەکو ئاگر، بەرەنگی ئاگر.
**آتش گیره**- ا(ئاتەش گیرە- ateş gîre): چیلکەو دارو سوتەمەنی، دەستەچیلە.
**آتشناک**- ص.مر(ئاتەشناک- ateşnak): سوتێنەر.
**آتش نشاندن**- مص.م(ئاتەش نیشاندەن- ateş nişanden): ئاگر کوژاندنەوە.
**آتش نشان**- ا.فا(ئاتەش نیشان- ateşnîşan): ئاگر کوژێنەوە.
**آتش نیشانی**- ا.مص(ئاتەش نیشانی- ateşnîşanî): ئاگر کوژاندنەوە، دایەرەی ئاگر کوژاندنەوە.
**آتش نمرود** - ا- مر(ئاتەشی نیمرود- ateşinîmrud): ئەو ئاگرەیە کە بە فەرمانی نەمرودی فەرمانرەوای بابل هەڵیانگیرساند تا حەزرەتی ئیبراهیمی تێدا بسوتێنێت، ئاگرەکە بە فەرمانی خودا حەزرەتی نە سوتاند، بوو بە ساردی و سەلامەتی.
**آتش، آتشین**- ص.ن(ئاتەش، ئاتەشین- ateşîn): بە رەنگی ئاگر، ئاگرین.
**آتشیزه**- ا(ئاتەشیزە- ateşîze): گوڵە ئەستێرە.
**آتشین پنجه**- ص.مر(ئاتەشین پەنجە- ateşîn pence): سەنعەتکاری لێهاتوو، کارامەو چالاک و بەدەسەڵات.
**آتلانتیک**- ص(ئاتلانتیک- atlantîk): ئۆقیانووسی ئەتڵەسی.
**اتمسفر**- ا.مر(ئات موسفیر- atmusfir): فەزا، هاماج، هەوای دەوراو دەوری گۆی زەوی.
**اتون**- ا(ئاتون- atün): تونی حەمام، پزدان، پزلی، ژنێ کە دەرس بە کیژان بڵێ و کاری دەستییان فێر بکات.
**آتی**- ا. فا. ع(ئاتی- atî): داهاتوو، ئاینده
**آثار**- ا.ع(ئاسار- asar): شوێنەوار، نیشانە، ئاسار، ئاسەوار، مەنەر.
**آثام**- ا- ع(ئاسام- asam): گوناهان، تاوانان.
**آجال**- ل.ع(ئاجال- acal): مۆڵەت، دەرفەت، ئەجەل، مەرگ.
**آجده**- ا. مص(ئاجیدە- acide): تەقەڵ لێدراو.
**آجر**- ا(ئاجور- acur): کەرپوچ، خشتی سورەوەکراو
**اجل**- ا(ئاجەل- acel): قرقێنە.
**اجل**- ص.ع(ئاجیل- acil): چەرەز، ئاجیل، شەوچەرە لە بادەم و نۆک و گوڵەبەرۆژەو ناوکە کولەکە.
**اجار**- ا(ئاجار- acar): ترشی، هەر خواردەمەنییەک کە لە ئاوی لیمۆ و سرکە کرابی و تامی ترش بووبێ.

**اچار**- ا(ئاچار- açar): ئاچەر، هاچەر، کلیل.
**اچمز**- ا- ب(ئاچ مەز- açmez): داخراو، نەکراوە، پێچەوانەی ئاچوخ.
**احاد**- ا.ع(ئاهاد- ahad): یەکان. لە ١-٩، عشرات/ دەیان، لە ١٠- ٩٠، مئات/میئات: سەدان، لە ١٠٠- ٩٠٠، الوف/ ئولوف: هەزاران لە هەزار بەبانەوە.
**اخال**- ا(ئاخال- axal): زڕو زبڵ، خاشاڵ، پرو‌پوش.
**اختن**- مص(ئاختەن- axten): هەڵکێشان، وەک هەڵکێشانی خەنجەر لە کێلان.
**اختە**- ا- مف(ئاختە- axte): هەڵکێشراو.
**اخذ**- ع- ص- فا(ئاخیز- axiz): وەرگر.
**اخر**- ع- ص(ئاخەر- axer): یەکێک لە دوو شتان، یان یەک لە دوو کەس.
**اخر**- ع- ص(ئاخیر- axir): دوایین، ئەنجام، پێچەوانەی یەکەم.
**اخر الامر**- ع(ئاخیرەل ئەمر- axirelemr): ئاخرییەکەی، ئەنجام، ئاقیبەت، بنەتا.
**اخر الزمان**- ا- ع(ئاخیرو زەمان- axiruzzeman): کۆتایی دنیا، رۆژی قیامەت، پەسلان.
**اخرە، اخرت**- ا(ئاخیرە، ئاخیرەت- axire, axiret): ئەو دنیا، ئاخر زەمان، پەسلان، قیامەت.
**اخریان**- ا(ئاخرییان- axriyan): ئالا، کوتاڵ.
**اخسمە**- ا(ئاخ سومە- axsume): شەرابێ کە لە برنج یان هەرزن بگیرێ.
**اخشیج**- ا(ئاخ شیج- axşîc): هەر چوار رەگەزی ئاو، ئاگر، با، خاک، توخم.
**اخشیجان**- ا(ئاخ شیجان- axşîcan): چوار رەگەزی ئاو، ئاگر، با، خاک.
**اخور**- (ئاخور- axür) شوێنی ئالیکدانی وڵاخ.
**اخورچی**- ا- فا(ئاخورچی- axûrçî): میر ئاخور، ئاخوڕ سالار، سەرۆکی خزمەتچیانی تەویلەو ئەستەبڵ.
**اخورک**- ا(ئاخوڕەک- axurek): ئێسقانی لای چەپ و راستی سەرووی سینەو ژێر گەردن، چەنبەر، چەڵەمە، تەرقوە.
**اخوند**- ا- ص(ئاخوند- axûnd): مەلای شیعەیان.
**اخوندک**- ا(ئاخوندەک- axûndek): مێرویەکە، سەوز رەنگ لە کولە گەورەترە، قاچەکانی درێژو سەری گەورەیە، لە هەندێ شوێنی کوردستانماینی حەسەن و حوسەینی پێ دەڵێن، تانجیە پێغەمبەرە.
**اخیە**- ا- م(ئاخیە- axye): مێخ زنجیر.
**اداب**- ا- ع(ئاداب- adab): دابونەریت، رەوشتی باش.
**اداش**- ا(ئاداش- adaş): هاوناو، دوو شت یان دوو کەس هاوناو بن.
**اداک، ادک**- ا(ئاداک، ئادەک- adak, adek):دوڕگە، ئاوخوست، گراف.
**ادخ**- ص(ئادەخ- adex): چاک، باش، خاس،
**ادر**- ا(ئادیر- adir): نەشتەر، ئاگر.

**ادرخش**- ا(ئادرەخش- adrexş): هەورە تریشقە، بروسکە.

**ادرس**- ا(ئادریس- adris): ئەدەرس، ناوونیشان.

**ادرنگ**-ا(ئادەرەنگ- adereng): خەم، رەنج، ئافەت، مەینەت، خەفەت، کەسەر.

**ادم**- ا- ع(ئادەم- adem): مرۆڤ، یەکەمین مرۆڤ، مێردی حەوا، بابی بەشەران.

**ادمک**- ا(ئادەمەک- ademek): مرۆڤی بچوک، پەیکەری بچوک کە لە شێوەی بنیادەم دروستکرابێ.

**ادمیخورا**- فا(ئادەمی خار- ademî xar): پیاوخۆر، مرۆڤی کێوی کە گۆشتی مرۆڤان بخوات، بنیادەم خۆر.

**ادمیرال**- ا(ئادمیرال- admîral): دەریا سالار، فەرماندەی کەشتی و هێزی دەریایی.

**ادمیزاد**- ا.ص(ئادەمی زاد- ademîzad): نەوەو تیرەی ئادەم، بنیادەم، ئادەمیزاد.

**ادیش**- ا(ئادیش- adîş): ئاگر.

**ادینده**- ا(ئادیەندە- adyende): پەلکە رەنگینە، کەسک و سۆر، کۆلکە زێرینە، رەنگین کەمان، زەرینە و سیمینە.

**ادینه**- ا(ئادینە- adîne): هەینی، دوا رۆژی هەفتە.

**اذار**- ا(ئازار- azar): مانگی یەکەمی بەهار، ئادار، ئازار.

**اذان**- ع- ا(ئازان- ajan): گوێ، گوێیان

**اذر**- ا(ئازەر- azer): ئاگر، ئایر.

**اذر، ابادگان**- ا(ئازەر ئابادگان- azer abadgan): ئاتەشکەدە، پەرستگەی زەردەشتییان، ناوی کۆنی ئازەربایجانە.

**اذرافروز**- ا- فا(ئازەر ئەفروز- azer efruz): مایە فیتنە، ئاگر هەڵگیرسێن.

**اذرافزا**- ا- فا(ئازەر ئەفزا- azer efza): ئاگر هەڵگیرسێن.

**اذرپرست**- ا-فا(ئازەر پەرەست- azer perest): ئاگر پەرست.

**اذرپرا**- ا(ئازەر پیرا- azer pira): خزمەتچی ئاتەشکەدە.

**اذرخش**- ا(ئازەرخش- azerxş): هەورە تریشقە، بریسکە.

**اذرسنج**- ا(ئازەرسەنج- azer senc): گەرماپێو، پیرومەتر.

**اذرشسپ**- ا(ئازەر شەسپ- azer şesp): ناوی فریشتەی مامۆری ئاگرە، سەمەندەر.

**اذرکده**- ا(ئازەرکەدە- azerkede): ئاتەشکەدە، پەرستگەی زەردەشتییان.

**اذرکیش**- ا- ص(ئازەرکیش- azerkîş): ئاگر پەرست.

**اذرگشسب**- ا(ئازەرگوشەسب- azerguşesb): ئاگر، بلێسە، بڵاچە، هەورە تریشقە.

**اذرگون**- ص(ئازەرگوون- azergûn): بەرەنگی ئاگر، وەکو ئاگر، سوور، گوڵی لالە، گوڵە باخی سوری وەک ئاگر.

**اذرنگ**- ا(ئازەرەنگ- azereng): خەم، رەنج، مەینەت، تیشک، رووناکی.

**اذین**- ا(ئازین- azîn): زێرو زیو،

زینەت و جوانی.

**اذین بندی**- ا- مص(ئازین بەندی- azînbendî): چراخان، رازاندنەوەی دەرودیواری موغازەو کوچەو کۆڵان و بازاڕ لە ڕۆژانی جەژن و ئاهەنگ و شادیدا.

**اراء**- ا(ئاراء- ara’): بۆچوون، را

**ارائیدن**- مص(ئارائیدەن- araiden): رازانەوە، جوانکردن، ڕێکخستن.

**اراستن**- مص.م(ئاراستەن- arasten): جوانکردن، رازانەوە.

**ئارایش**- ا- مص(ئارایش- arayiş): ئاراییش، جوانی.

**اراینده**- ا- فا(ئاراینده- araynde): ئارایشکەر.

**اراسته**- ا- مف(ئاراستە- araste): رازاوە، رازێنراوە. رازیاوە.

**ارام**- ا(ئارام- aram): هێدی، ئاسودە، ئارام.

**ارامش**- ا- مص(ئارامش- aramiş): ئاسودەیی، ئارامی.

**ارامشگا**- ا- م(ئارامشگاه- aramişgah): جێی ئیسراحەت، جێی خەوتن.

**ارامگاه**- ا(ئارامگاه- aramgah): شوێنی حەوانەوە، بە مانای گۆڕو گۆڕستانیش دێت.

**ارامیدن**- مص. ل(ئارامیدەن- aramîden): پاڵکەوتن، خەوتن، ئیسراحەتکردن.

**ارایشگاه**- ا(ئارایشگاه- arayîşgah): جێی ئارایشکردن، دوکانی بەربەری.

**ارایشگر**- ا.فا(ئارایشگەر- arayîşger): کەسێک کە خەڵکی ئارایش دەکات، ئارایشگا، بەربەر.

**ارتیست**- ا- ص(ئاراتیست- artist): هونەرمەند، ئەکتەر، کەسێک کە لە هونەری نیگارکێشی یان مۆسیقا، یان شانۆگەریدا وەستا بێ.

**ارتیشو**- ا(ئارتیشو- artîşu): کەنگری فەرەنگی.

**ارج**- ا(ئارەج- arec): ئانیشک، قوونانیسک.

**ارخالق**- ا(ئارخالوغ- arxalux): کوڵەنجەی درێژ کە جاران ژنان و پیاوان لەبەریان دەکرد، کولەجەی لۆکە تێخنراو.

**ارد**- ا(ئارد- ard): ئارد، ئار، دەغڵی هاڕدراو بۆ نان.

**اردبیز**- امـر(ئاردبیز- ardbîz): هێڵەک، ئاردبێژ.

**اردوله**- ا(ئاردوولە- arddûle): ئاردەوا، پەڵوڵە، پڕتوڵە.

**اردن**- ا(ئاردەن- arden): کەوگیر، سوزگی، پلاو پالێو.

**اردهاله**- ا(ئاردهالە- ardhale): پەڵوڵە، ئاردەوا.

**اردینه**- ص-ن(ئاردینە- ardîne): ئاردێنە، ئاشی ئارد.

**ارزو**- ا(ئاریزوو- arizû): حەز، هیوا، ئومێد، خۆزی، هێڤی، ئاوات.

**ارزومند**- ا(ئاریزوومەند- arizûmend): کەسێک کە ئارەزووی شتێک بکات، بەتاسە، بە ئاوات، ئارەزوومەند.

**ارستن**- مص(ئارەستەن- aresten): رازاندنەوە، ڕێک و پێکردن، جوانکردن.

**ارشیدوک**- ا(ئارشیدۆک- arşîdok):

نازناوی شازادەکانی بنەماڵەکانی جارانی ئیمپراتۆری نەمسایە.

**ارشین**- ا(ئارشین- arşîn): یەکەیەکی پێوانەی رووسییە، بەرامبەر بە ١٧سم.

**ارشیو**- ا(ئارشیف- arşîv): ئەرشیف، شوێنی پاراستن و هەڵگرتنی قەواڵەو بەڵگەنامەو نووسراوی ئیدارە دەوڵەتی، یان میللییەکان.

**ئارشیویست**- افر(ئارشیڤیست- arşîvist): ئەرشیفکار، مامورو بەرعۆدەی ئەرشیڤ.

**ارغده**- ص(ئارەغدە- arexde): ئارەزوومەند، تاسەبار.

**ارغده**- ص(ئاروغدە- aruxde): تورە، ئاڵۆز، حەسوود.

**ارکیولوژی**- ا(ئارکیۆلۆژی-arkiolojî): شوێنەوارناسی، ئاسەوارناسی.

**ارم**- ا. فر(ئارم- arm): دروشمی تایبەتی دەوڵەتێک یان دایەرەک یان گروپ و حیزب و تاخمێک.

**ارمان**- ا(ئارمان- arman): ئاوات، ئامانج، ئارەزووی مەزن.

**ارمیدن**- مص.ل(ئارمیدەن- armîden): ئارامگرتن، ئارامبوون، خەوتن، ئاسودەبوون.

**ارامش**- ا-مص(ئارامش- aramiş): ئاسودەیی، ئارامی.

**ارن**- ا(ئارەن- aren): ئانیشک، یەرەژنە، قونانسک، ئارەنج.

**ارنج**- ا(ئارەنج- arenc): ئانیشک، قونانسک، ئارەنج.

**ارنگ**- ا(ئارەنگ- areng): ئانیشک، رەنج، خەم، قونانسک، ئارەنج.

**ارواره**- ا(ئارڤارە- arvare): کاژێرە، شەویلاگە، شەویلگە، کاجیڕ.

**اروبند**- ا.ص- ا(ئارووبەند- arûbend): شکستەبەند، جەراحی عەشایەر کە شوێنی شکاوی بەدەن دەگرێتەوە.

**اروغ**- ا(ئارووغ- arûx): قرقێنە، قرخێنە.

**اروند**- ا(ئارڤەند- arvend): فەڕ، شکۆ، عەزەمەت، پایەو شەوکەت، ئەقڵ و زانست، فێڵ و دەهۆ.

**اروین**- ا(ئارڤین- arvîn): تاقیکردنەوە، تەجرەبە، ساوکە.

**اریا، اریایی**- ا(ئاریا، ئاریایی- arya, aryayî): رەگەزی ئاریایی.

**اریستوکرات**- فر(ئاریستوکرات- aristûkrat): خەڵکی سەر بە چینی ئەشراف، لایەنگری دەوڵەمەندو ئەشرافان، لایەنگری ئارستکراسی.

**اریستوکراسی**- (ئاریستوکراسی- aristukrasî): حکومەتی چینی دەوڵەمەندو ئەشراف، سەرمایەداران و بۆرژوا.

**اریغ**- ا(ئاریغ- arîx): نەفرەت، ساردی، کەرب و کینە لە دڵگرتن بەرانبەر بە کەسێک، رک لە زگ، رکونی، رقن، کینەکێش.

**ارین، ئاریان، اریا**- ا(ئارین، ئاریان، ئاریا- arîn, aryan, arya): گەورەترین و گرینگترین لقی سپی نەژادان، سپی پێستانی ئاسیاو ئەوروپا کە هندو ئەوروپاییان-ش پێدەگوترێ.

**از**- ا(ئاز- az): بە تەماح، چاوچنۆکی، ئێرەیی، حەسوودی.

**ازاد**- ص(ئازاد- azad): سەربەست، پێچەوانەی کۆیلە، ئازاد.

**ازادمـــــــرد**- ص(ئـازاد مـــــــەرد- azad merd): جــوامــێــر، رەســەن، خانەدان، نەجیب، نەجیمزادە.

**ازادمیوه**- ا(ئازادمیڤە- azad mîve): جۆرە شـیـرینییـەکـە کـە بە ناوکـە بادام و پستەو قەند یان شەکر دروستدەکرێ.

**ازادوار**- ص(ئازادڤـــار- azadvar): ئازادانە، سەربەستانە، رەهایانە.

**ازاده**- ص(ئازادە- azade): رەســـەن، خانەدان، نەجیبزادە.

**ازادگی**- ا.مص(ئازادەگی- azadegî): ئازادبوون، جوامێری، سەربەستی.

**ازار**- ا(ئـــازار- azar): ژان، ئـــێـــش، ئازار، نەخۆشی.

**ازخ**- ا(ئازەخ- azex): بالووکە.

**ازدن**- مص(ئازدەن- azden): تـەقـــەڵ لێدان.

**ازردن**- مـــص(ئـــازەردەن- azerden): ئازاردان، رەنجاندن، ئەشکەنجەدان.

**ازرده**- ا مـــف(ئـــازەردە- azerde): ئازاردیدە، رەنجاو، ئازاردراو.

**ازرم**- ا(ئازەرم- azerm): شـــەرم، بە مـــانای گـــەورەیی، ئابڕوو، عـــیـــزەت و حورمەت، نەرمی وبەزەییش دێت.

**ازرمجو**- افا(ئازەرم جوو- azermcû): بەشەرم، پاک، دادپەروەر.

**ازرمـــگـــین**- ص(ئـــازەرمـــگـــین- azermgîn): شەرمن، بە حەیا، سەلار.

**ازغ**- ا(ئازوغ- azux): لق، لقـێک کـە لە دار خورمای دەبڕنەوە.

**ازفنداک**- ا(ئازفەنداک- azfendak): پەلکە زێڕینە، کـۆڵـکە زێڕینە، کـەسک سوور، زەڕینەو سیمینە.

**ازمـــائیـــدن**- مص(ئازمـــاییـــدەن- azmayîden): جـــــــــەڕبـانـدن، تاقیکردنەوە، ساوکەکردن.

**ازمـــــایش**- ا. مص(ئـەزمـــــایـش- azmayiş): تاقیکردنەوە، ساوکەکردن، جەڕباندن.

**ازمـــایشگاه**- ا(ئـازمـــــایـشگـاه- azmayişgah): شوێنی تاقیکردنەوەی زانســـتی و هونەری، تـاقــیگە، لابراتـور، ئەزموونگە.

**ازمـــــایشگر**- ص(ئازمـــــایشگەر- azmayîşger): تاقـیکردنەوەکـار، ئەو کەسەی کاری تاقیکردنەوە ئەنجام دەدات، ئەزموونکار، ساوکەکار.

**ازمند**- ص فا(ئازمەند- azmend): بە تەماح، چاوچنۆک، حەسود، تەماحکار

**ازمـــــودن**- مـص م(ئـازمـــــــوودەن- azmüden): جـــــــــەڕبـانـدن، هەڵسـەنگاندنی چاکـەو خـراپەی شـتـێک، تاقیکردنەوە.

**ازموده**- ا مف (ئازمـوودە- azmûde): جەڕبێنراو، تاقیکراوە، ساوکەکراوە.

**أزمـــــون**- ا(ئازمــــــوون- azmûn): ئەزموون، تەجرەبە، تاقیکردنەوە.

**ازمونه**- ا(ئازموونە- azmûne): لولەی تاقیکردنەوە، بۆری تاقیکردنەوە.

**ازنگ**- ا(ئازەنگ- azeng): ئەو چرچ و لۆچەی لە ئەنجامی پیـری یان تورەییـدا، لە دەم و چاوو تەوێڵ پەیدا دەبن.

**ازور**- ص(ئازڤـەر- azver): حـەسـوود، بەغیل.

**ازوغه**- ا(ئازوغـە- azûxe): ئازووقـە، ئازووخە، بژێوی پێویست لە ماڵدا.

**ازیر**- ا(ئازیر- azir): ئازار، رەنج.
**ازیغ**- ا(ئازیغ- azîx):
بڕوانە: **اریغ**- (ئاریغ- arîx):
**اژان**- ا(ئاژان- ajan): نوێنەر، پاسەوان
**اژانس**- ا(ئاژانس- ajans): وەکالە، هەواڵگری، هەواڵگوزاری.
**اژدن**- ا(ئاژدەن- ajden):
بڕوانە: **اجیدن**- (ئاجیدەن- acîden):
**اژند**- ا(ئاژەند- ajend): ئەو قوڕەی لەسەر چینە دیوارێک ڕۆ دەکرێ تا چینێکی تری لەسەر ڕۆبنرێ.
**اژندیدن**- مص(ئاژەندیدەن- ajendîden): ڕاکێشانی قوڕی سەر بەرد یان خشت لە کاتی دیوار دروست کردنا.
**اژنگ**- ا(ئاژەنگ- ajeng):
بڕوانە: **اژنگ** = ئاژەنگ
**اژی دهاک**- ا(ئاژی دەهاک- ajî dehak): ئەژدەهاک، ناوی پاشایەکی ستەمکارو زۆردار بووە، بە مانای مارێکی سەیری سێ سەرو هەزار پێش هاتووە.
**اژیر**- ص(ئاژیر- ajîr): بەهۆش، ژیر، هۆشیار، زیرەک، بە ئاوەز، سڵ و زیتەڵ، گۆماو، حەوز، ئەستێل.
**اژیریدن**- مص(ئاژیریدەن- ajîrîden): ئاگادارکردنەوە
**اژیریده**- ا مف(ئاژیریدە- ajîrîde): ئاگادارکراو.
**اس**- ا(ئاس- as): دەسار، دەستاڕ.
**اس**- ا(ئاس- as): تەک خاڵ، یەکێکە لە وەرەقەکانی قومار.
**اسا**- ا(ئاسا- asa): پاشگرە، واتای وەک دەگەیەنێ: شێراسا،

**اسا**- ا(ئاسا- asa): باوێشک، باوشک
**اسائیدن**- مص(ئاسائیدەن- asaiden): حەسانەوە، ئیسراحەتکردن، ئارامگرتن.
**اسان**- ص(ئاسان- asan): سانا، هاسان، سوک، ئاسان.
**اسانسور**- ا فر (ئاسان سور- asan sür): بالاڕۆ، مەصعەد.
**اسایشگاه**- ا(ئاسایشگاه- asayîşgah): جێی حەسانەوە، شوێنێک کە نەخۆشان بە تایبەتی خەڵکی سیلداری تێدا ئاگاداری و مالیجە دەکرێ.
**أسپیرین**- ا(ئاسپیرین- aspîrîn): جۆرە حەبێکە بۆ دامرکاندنەوەی تاو ئازار بەکار دێت.
**استات**- ا(ئاسیتات- asitat): خوێی ئەسیدی ئەستیک.
**استان**- ا(ئاستان- astan): دەرگا، بەردەرگا، قەدەمە، دەربارو بارەگا.
**استانه**- ا(ئاستانە- astane): دەرگا، بەردەرگا، دەربارو بارەگا.
**آستر**- ا(ئاستەر- aster): ئەستەر، بەر، بەری کەوا.
**استین**- ا(ئاستین- astîn): قۆڵی کراس یان هەر جلێکی دی.
**استیم**- ا(ئاستیم- astîm): هەوکردن و ئاوسانی زام و برین، چڵک و کێم.
**استینه**- ا(ئاستینە- astîne): هێلکەی مریشک، هێلەو کەرگی، خایە.
**اسغده**- ص. مف(ئاسوغدە-asuxde): نیوەسووت، دارو چیلکەی نیوە سوتاو.
**اسفالت**- ا(ئاسفالت- asfalt): ئەسفەڵت، قیری قیرتاوی جادەو شەقامان.

**اسم**- ا فـا (ئـاسم- asim): تەنگەنەفەسی.

**اسمان**- ا(ئاسمان- asman): عاسمان، ئاسمان.

**اسمانخراش**- ا فا (ئاسمان خەراش- asman xeraş): کۆشک و تەلاری چەندین نهۆمی و زۆر بەرز کە سەری گەیببێتە هەوران، کۆشک و تەلاری سەر بە فەلەک.

**اسمان دره**- ا(ئاسمان دەرە- asman dere): کاکێشان، کاکەشان، کادز، چەرخ و فەلەک.

**اسمان گون**- ص(ئاسمان گون- asman gûn): شینباو، بەڕەنگی ئاسمان.

**اسمانه**- ا(ئاسمانە- asmane): سەقف، بن میچ، ئاسمانە.

**اسمند**- ص(ئاسمەند- asmend): سەرسام، سەرگەردان، فریوکار، درۆزن.

**اسموغ**- ص(ئاسموغ- asmüx): درۆو دوزمانی، فیتنەچییەتی.

**اسه**- ا(ئاسە- ase):تەوەر، بەردی ئاش، زەوی ئامادە بۆ کشتوکاڵ.

**اسیا**- ا(ئاسیا- asya): ئاش، ئاسیاو.

**اسیابان**- ا- ص(ئاسیابان- asyaban): ئاشەوان، لووینە.

**اسیا زنه**- ا(ئاسیا زەنە- asyazene): ئامێرێکە بەردی ئاشی پێ تیژ دەکەنەوە.

**اسیا سنگ**- ا(ئاسیا سەنگ- asya seng): بەرداش، تات و تاوێر، هەر بەردێکی گەورە لە بەرداش بچێ.

**اسیب**- ا(ئاسیب- asîb): ئاسیو، زیان، زەرەر، ئەزیەت، بەڵا.

**اسیه**- ا- ص(ئاسییە- asiye): ژنی خەمگین.

**اسیستان**- ا(ئاسی ستان- asîystan): یاریدەدەر، دەستبار.

**اسیمه**- ص(ئاسیمە- asîme): پەرێشان، سەرگەردان.

**اش**- ا(ئاش- aş): شۆربا، دۆکولێو، دۆخەوا، ئاش.

**اش دادن**- مص(ئاش دادەن- aşdaden): خۆشەکردنی پێستی حەیوانات.

**اشامیدن**- مص(ئاشامیدەن- aşamîden): خواردنەوە، خواردنەوەی ئاوو هەموو شلەمەنییەک.

**اشامنده**- ا- فا (ئاشامەندە- aşamende): ئەو کەسەی ئاو یان ساردی دەخواتەوە.

**اشپزخانه**- ا- م(ئاشپەزخانە- aşpezxane): جێگەی شیولێنان، موبەق، متبەخ.

**اشتی**- ا- مص(ئاشتی- aştî): دۆستایەتی و تەبایی و نێوان خۆشی.

**اشرمه**- ا(ئاشورمە- aşurme): زین، لبادی زینی ئەسپ.

**اشغال**- ا(ئاشغال- aşxal): ئاخاڵ، زڕوزبڵ، خاشاڵ، پڕوپوش.

**اشفتن**- مص(ئاشوفتەن- aşuften): توڕەبوون، پەرێشان بوون.

**اشکار**- ص(ئاشکار- aşkar): ئاشکرا، دیار، خویا، بەرچاو.

**اشکوب**- ا(ئاشکووب- aşkûb): میچ،

سەقف، ئاسمانە.
**اشکوخیدن**- مص- ل(ئاشکوخیدەن- aşküxîden): نوچدان، خزان، سەرسمدان، رەت بردن.
**اشکوخیده**- ا- مف(ئاشکوخیدە- aşküxîde): خزاو، رەت بردوو.
**اشگر**- ص(ئاشگەر- aşger): پێستە خۆشکەر، دەباغچی.
**اشمال**- افا- ص(ئاشمال- aşmal): مەرایی کردن، پانکەرەوە.
**اشناب**- ص- فا(ئاشناب- aşinab): مەلەوان، ئاوباز.
**اشناگر**- ص- فا(ئاشیناگەر- aşinager): مەلەوان.
**اشناور**- ص- مر(ئاشیناڤەر- aşinaver): مەلەوان.
**اشناه**- ا(ئاشیناه- aşinah): مەلەوان.
**اشوال**- ا(ئاشڤال- aşval): پارەی سەر مێزی قومار.
**اشوب**- امص(ئاشووب- aşûb): فیتنە، ئاژاوە، پشێوی، ئاشووب.
**اشوبگر**- ص فا(ئاشووبگەر- aşûbger): فیتنەچی، ئاژاوەچی، ئاژاوەگێڕ، سەرە سۆدرە، مایەفیتنە، کەتنگێڕ.
**اشوبناک**- ص- م(ئاشووب ناک- aşûb nak): بە ئاژاوە، پڕ ئاژاوە، ئاشووبناک.
**اشوردن**- مص- م(ئاشوور دەن- aşûrden): تێکدان، شێواندن.
**اشورنده**- ا- فا(ئاشوورەندە- aşûrende): مایە فیتنە، تێکدەر، گێرە شێوێن.
**اشوغ**- ص(ئاشوغ- aşûx): غەوارە، بێگانە، گومناو، نەناسراو.
**اشیان، اشیانه**- ا(ئاشیان، ئاشیانە- aşyan, aşyane): هێلین، لانەی مەلان، ماڵ و خانوو.
**اشیهه**- ا(ئاشیهە- aşîhe): حیلەی ئەسپ.
**اصال**- ع- ا(ئاسال- asal): بوڵێڵە، زەردەپەڕ، خۆر لەزەردە.
**اغار**- ا(ئاغار- axar): نم وشێ، رتووبەت، تەڕ.
**اغاردن، اغاریدن**- مص- م(ئاغاردەن، ئاغاریدەن- axarden, axarîden): تەڕکردن.
**اغاز**- ا(ئاغاز- axaz): هەوەڵ، سەرەتا، دەستپێک.
**اغازگر**- ص- فا(ئاغازگەر- axazger): دەستپێکەر، لە بواری جریدبازی ئەسپدا بەو کەسە دەگوترێ کە فەرمانی حەرەکەت بە ئەسپ سواران دەدات.
**اغازه، اغاره**- ا(ئاغازە، ئاغارە- axaze, axare): پەرگەما، بنەما.
**اغازیان**- ا(ئاغازیان- axazyan): گیانداری یەک خانەیی کە تەنیا بە میکروسکۆب دەبینرێ.
**اغازیدن**- مص- م(ئاغازیدەن- axazîden): دەست پێکردن.
**اغازنده**- ا- فا(ئاغازەندە- axazende): دەستپێکەر.
**اغازیده**- ا- مف(ئاغازیدە- axazîde): دەستپێکراو.

**اغــالیــدن**- مص- م(ئاغــالیــدەن- axalîden): دنەدان بۆ شەڕ،

**اغـر**- ا(ئاغـەر- axer): خڕ، شـیـوەڵە، رووباری وشک، وشکە چەم.

**اغـره**- ا(ئاغـیـرە- axire): نەخـۆشی پێست، ئەگزیما.

**اغــستن**- مص- م(ئاغــەســتــەن- axesten): ئاخنین، ماخەنای، پڕکردن، پرکردنی شتێک بەزۆر، تەپاندن.

**اغــشتن**- مص- م(ئاغــەشــتــەن- axeşten): تەڕکردن.

**اغل**- ا(ئاغـەل- axel): ئاغـەڵ، جـێی داکـردنی مـەڕو بزن لە کـاتی سـەرمـادا، گەوڕ، پشتیر.

**اغـنـدن**- مـص- م(ئـاغـــــــەنـدەن- axenden): گوڵۆڵە پەمووی ئامادەکراو بۆ رستن.

**اغـوز، اغـز**- ا(ئاغـوز- axuz): ژەک، فرچک، هەوەڵ شیر.

**اغـوش**- ا(ئاغـوش- axuş): هەمـێـز، ئامێز، باوەش، باوش، کۆش.

**اغـوشـیـدن**- مص- م(ئاغـوشـیـدەن- axuşîden): یەکـتـر لەباوەش گـرتن، پەشتان.

**اف**- ا(ئاف- af): خـــۆر، هەتاو، رۆژ، رۆجیار.

**افــات**- ع- ا(ئافــات- afat): ئازار، زیان، بەڵا، مسیبەت.

**افاق**- ع- ا(ئافاغ- afax): ئاسۆ.

**افت**- ع- ا(ئافــەت- afet): بڕوانە: **افات**، **ئافات**، (afat)

**افـتـاب**- ا(ئافـتـاب- aftab): هەتاو، خۆرەتاو.

**افتـاب پرست**- ا- فـا(ئافـتـاب پەرەست- aftabperest): خـۆرپـەرست، خـۆرەتاو پەرس.

**افــتــابرو**- ص- م(ئافــتــاب روو- aftabrû): روو وەک هەتـاو، جـــوان، شۆخ.

**افتاب زرد، افتاب زردی**- ا- م(ئافتاب زەرد ,ئـافـــتـــاب زەردی- aftabzerd,aftabzerdî): زەردەپەڕ، خـۆر لە زەردەی ئێـواریێ، خـۆر لە زەردە.

**افتـاب گردان**- ا- م(ئافتـاب گـەردان- aftab gerda): گوڵەبەڕۆژە، شەبەنگە بەڕۆژ.

**افــتــابه**- ا(ئافــتــابە- aftabe): مەسینە.

**افـرازه**- ا(ئافـرازە- afraze): شـولەی ئاگر، بڵێسە.

**افــــرینـگـان**- ا- م(ئافــــەرینـگـان- aferîngan): هەندێ لە نوێـژەکــــانی خـوردە ئاوێـسـتـایە کـە زەردەشـتـیـیـەکـان هەندێ جار دەیخوێنن.

**افروزه**- ا(ئافرووزە- afrûze): پلێـتەی چرا.

**افروشه**- ا(ئافـرووشە- afrûşe): جۆرە حــەڵوایەکـــە بە ئاردو رۆن و هەنگوین دروست دەکرێ.

**افره**- ا(ئافرە- afre): سزای خراپی.

**افـریدگـار**- ص- فـا(ئافـەریدگـار- aferîdgar): خوا، یەکێکە لە نێوەکانی یەزدان.

**افــــریدن**- مـص- م(ئـافــــەریـدەن- aferîden): خـولـقـاندن، دروسـتـکـردن، ئەفراندن.

**اطراب**- ع- مص- م(ئیتراب- itrab): سرود گوتن، وەجۆش هێنانی کەسێک.
**اطراح**- مص- م(ئیـــتـــراە- itrah): توڕدان.
**اطراد**- ع- مص- م(ئیـتـراد- itrad): دەرکردن.
**اطـــراف**- ع- ا(ئـــەتـــراف- etraf): دەوروبەر.
**اطرش**- ع- ص(ئەترەش-etreş): کەڕ.
**اطعام**- ع- مص- م(ئیـتـئـام- itam): نان دان.
**اطعـمـه**- ع- ا(ئەتئیـمـە- et'ime): خۆراک، خواردەمەنی.
**اطفـــاء**- مص- م(ئەتفـــاء- etfa'): کوژاندنەوە، کوژاندنەوەی ئاگر.
**اطفائیه**- ع- ا(ئیتفائییە- itfa'iye): دایەرەی ئاگر کوژێنەوە.
**اطفال**- ع- ا(ئەتفال- etfal): منداڵان. زارۆکان، بچووکان.
**اطلاع**- ع- مص- ل(ئیـــتـــیـــلاء- ittila'): شارەزابوون، ئاگادار بوون.
**اطلاق**- ع- مص- م(ئیـتـلاغ- itlax): رەهاکردن. ئازادکردن- کردنەوە.
**اطـــلال**- ع- ا(ئـــەتـــلال- etlal): شـوێنەواری خـانوو گـوندان، شـوێنی بەرز، شوێنەواری خانوو، سەراو بینایان، مەنەر.
**اطلس**-ا(ئەتلەس- etles): کـــەوەیی، جۆرە قوماشێکی ئاوریشمییە، ئەتڵەس.
**اطلس**- ا(ئەتلەس- etles): نەخـشـەی جوگرافیا. کتێبی نەخشان.
**اطـلـسـی**- ص- ن- ا(ئـەتـلـەسـی- etlesî): جـۆرە گـوڵێکی شـەپـوریـیـە، رەنگی شین، وەنـەوشـەیی، سـورو سـپی هەیەو تا زستان دەوام دەکات.
**اطـمـاع**- ا(ئەتماع- etma'): تـەمـاع، تەماح، چاوچنۆکی.
**اطماع**- ع- مص- م(ئیتماء- itma'): تەماح خستنە بەر کەسێک.
**اطـمـئنان**- ع- امص(ئیـتـمـینان- itmînan): ئـاسـودەیی، ئـەرخـایـەنی، دڵنیایی.
**اطنـاب**- ع- ا- مص ل(ئیـــتـنـاب- itnab): درێژدادڕی، درێژە پێدان.
**اطـوار**- ع- ا(ئـەتـڤـــار- etvar): جۆرەکان، ڕێبازان، دۆخەکان.
**اطواق**- ع- ا(ئەتڤـاغ- etvax): تەوق، کۆت.
**اطول**- ع- ص- ت(ئەتڤـەل- etvel): درێژتر.
**اطهـــار**- ع- ص(ئەتهـــار- ethar): پاکان، پیاوچاکان.
**اطهـر**- ع- ص- ت(ئەتهـەر- ether): پاکتر، پاکیزەتر، پاکژتر.
**اطیاب**- ع- ص- ا(ئەتیاب- etyab): خۆش بۆ، پاکان.
**اطـیـب**- ع- ص- ت(ئـەتـیـــەب- etyeb): خۆشبۆتر، پاکیزەتر، خۆشتر.
**اظافــر**- ع- ا(ئەزافــیـــر- ezafir): نینۆکان، ناخوونەکان.
**اظافــیــر**- ع- ا(ئەزافـیـر- ezafîr): نینۆکان، ناخونان.
**اظـــلال**- ع- ا(ئـــەزلال- ezlal): سێبەران، سایە، سایکەکان.
**اظلال**- ع- مص- م(ئیـــزلال- izlal): سێبـەرکردن، بڵاوبوونەوەی سێبـەری دارو درەخت یان شتی دی.

**اظلام**- ع- مص- ل(ئیـزلام- izlam): تاریک بوون.

**اظهار**- ع- مص- م(ئیـزهار- izhar): ئاشکراکردن، دەربڕین.

**اظهر**- ع- ص(ئەزهەر- ezher): دیارتر. ئاشکراتر.

**اعاجم**- ع- ا(ئەئاجیم- e'acim): غەیرە عەرەب، زمان خوار، کەسێک نەتوانێ بە زمانی عەرەبی قسە بکات. کەسێک نەتوانێ بە دروستی و رەوانی قسە بکات.

**اعاجیب**- ع- ا(ئەئاجیب- e'acîb): عەجایەب، سەیرو عەنتیکە.

**اعاده**- ع- مص- م(ئیئادە- iade): گەڕاندنەوە. دووبارەکردنەوە.

**اعادی**- ع- ص(ئەئادی- e'adî): دوژمنان.

**اعاشه**- ع- مص- م(ئیئاشە- iaşe): ژیاندنەوە، بوژاندنەوە، زندەگی کردن، نان پەیدا کردن، ئیوەتکرن.

**اعاظم**- ع- ص(ئەئازیم- eazim): گەورەکان، مەزنەکان.

**اعالی**- ع- ص(ئەئالی- ealî): خەڵکانی پایە بەرز، شوێنانی بەرزو بڵند.

اعانه،اعانت- ع- مص- م(ئیئانە، ئیئانەت- i'ane, i'anet): کۆمەککردن، یارمەتی دان، باربو، پیتاک.

**اعتاق**- ع- مص- م(ئیئتاغ- i'tax): ئازادکردنی کۆیلە، رەهاکردن.

**اعتبار**- ع- مص- ل(ئیئتیبار- i'tibar): عیبرەت گرتن، پەندگرتن، قەدرو پایە.

**اعتداء**- ع- مص- م(ئیئتیداء- i'tida'): زوڵم کردن، تەعەدا کردن، دەستدرێژی کردن.

**اعتداد**- ع- مص- ل(ئیئتیداد- i'tidad): بایەخ پێدان، حیساب بۆ کردن.

**اعتدال**- ع- مص- ل(ئیئتیدال- i'tidal): یەکسانی.

**اعتدال خریفی**- ا(ئیئتیدالی خەریفی- i'tidali xerîfî): هەوەڵی پایز کە درێژی رۆژو شەو یەکسان و بەرانبەر دەبێت.

**اعتدال ربیعی**- ا(ئیئتیدالی رەبیئی- i'tidali rebî'î): هەوەڵی بەهار کە رۆژو شەو یەکسان دەبێت.

**اعتذار**- ع- مص- ل(ئیئتیزار- i'tizar): عوزرخوایی، تەوازۆ هێنانەوە.

**اعتراض**- ع- مص- ل(ئیئتیراز- i'tiraz): عەیبگرتن، رەخنەگرتن، ناڕەزایی.

**اعتراف**- ع- مص- ل(ئیئتیراف- i'tiraf) دان پێدانان.

**اعتزاز**- ع- مص- م(ئیئتیزاز- i'tizaz): عەزیز بوون، شانازی.

**اعتزال**- امص- ل(ئیئتیزال- i'tizal): گۆشەگیری، دوورە پەرێزی.

**اعتیساف**- ع- مص- م(ئیئتیساف- i'tîsaf): زوڵم کردن. لەڕێی راست لادان، ستەمکاری.

**اعتصاب**- ع- مص- ل(ئیئتیساب- i'tisab): مانگرتن، سینگرتن.

**اعتصام**- ع- مص- م(ئیئتیسام- i'tisam): خۆ لە گوناه لادان، پەناگرتن.

**اعتضاد**- ع- مص- م(ئیئتیزاد- i’tizad): یارمەتی دان. پشتگیری لە کەسێک.
**اعتقاد**- ع- مص- ئیئتیغاد- i’tixad): باوەڕکردن.
**اعتکاف**- ع- مص ل(ئیئتیکاف- i’tikaf): چوونە خەڵوەت بۆ عیبادەت. خەڵوەتگیری.
**اعتلاء**- ع- مص- ل(ئیئتیلا- i’tila’): بەرزبوونەوە. پایە وەرگرتن.
**اعتلال**- ع- مص- م(ئیئتیلال- i’tilal): بیانوو هێنانەوە. نەخۆش کەوتن.
**اعتماد**- ع- مص- ل(ئیئتیماد- i’timad): پشت پێ بەستن، متمانە بوون بە کەسێک.
**اعتناء**- ع- مص- ل(ئیئتینا ء- i’tina’): دەست لە ملانێ، کار گرتنە ئەستۆ.
**اعتیاد**- ع- مص- م(ئیئتیاد- i’tiyad): خووگرتن، راهاتن لەسەر شتێ، ئیدمان، ئالودەبوون.
**اعجاب**- ع- مص- م(ئیئجاب- i’cab): سەرسام بوون.
**اعجاز**- ع- مص- م(ئیئجاز- i’caz): بێتواناکردن، ئەنجامدانی کارێک کە بە خەڵکێکی دی نەکرێ، پەرجوو.
**اعجب**- ع- ص- ت(ئەئجەب- e’ceb): عەجیبتر، سەیرتر.
**اعجم**- ع- ص- (ئەئجەم- e’cem): غەیرە عەرەب، عەرەبی نەزان، زمانخوار.
**اعجمی**، عجمی- ص- ن(ئەئجەمی، ئەجەمی - e’cemî, ecemî): ئێرانی، فارسی، غەیرە عەرەب.
**اعجوبه**- ع- ص(ئوئجوبە- u’cube): سەرسامکەر، عەجایەب، سەیروسەمەرە.
**اعداء**- ع- ا(ئەئداء- e’da’): دژمن، نەیار.
**اعداد**- ع- ا(ئەئداد- e’dad): ژماران.
**اعداد**- ع- مص- م(ئیئداد- i’dad): ئامادەکردن.
**ئیعدام**- ع- مص- م(ئیئدام- i’dam): خەنەقاندن، لە سێدارەدان، لە قەنارەدان.
**اعدل**- ع- ص-ت(ئەئدەل- e’del): دادوەرتر.
**اعذار**- ع- ا(ئەعزار- e’zar): عوزر، تەوازی، بەهانە، بیانوو، پاساو.
**اعراب**- ع- مص- م(ئیئراب- i’rab): ئاشکراکردن، دەربڕین، رەوانی و راشکاوی لە قسەکردندا، دیاریکردنی حەرەکەی پیت و وشان.
**اعراب**- ع- ا(ئەئراب- e’rab): عەرەبی ساراگەڕ، عەرەبی بیابان نشین.
**اعرابی**- ع- ا(ئەئرابی- e’rabî): عەرەب، خەڵکی عەرەب نەژاد.
**اعراش**- ع- ا(ئەئراش- e’raş): عەرش، بارەگا، تەخت، جێگە، کەپرو سابات، کۆشک و قەڵا.
**اعراض**- ع- ا(ئەئراز- e’raz): نیشانەکان.
**اعراض**- ع- مص- ل(ئیئراز- i’raz): روو وەرگێڕان، خۆپاراستن لە شتێک.
**اعراف**- ع- ا(ئەئراف- e’raf): عورف و عادەت، داب و نەریت، بە باوەڕی موسڵمانان شوێنێکە لە نێوان دۆزەخ و

بەهەشتدا، زینەخ.

**اعرج**- ع- ص(ئەئرەج- e’rec): لەنگ، شەل.

**اعـــــرف**- ع- ص(ئەئرەف- e’ref): ناسراوتر، زاناتر.

**اعـز**- ص- ت(ئەئەز- e’ez): ئازیزتر، خۆشەویستر، هەژیتر.

**اعـزاء**- ع- ص- ا(ئەئیـزاء- e’iza’): عەزیزان، ئازیزان.

**اعـزاز**- ع- مص-م(ئیـئـزاز- i’zaz): شانازی.

**اعـزام**- ع- مص م(ئیـئـزام- i’zam): ناردن، رەوانە کردن.

**اعزه**- ع- ص(ئەئیزە- e’ize): ئازیزان، ڕێزداران.

**اعـزل**- ع- ص(ئەئزەل- e’zel): هەوری بێباران، پیاوی بێچەک.

**اعسار**- ع- مص- ل(ئیئسار- i’sar): کەوتنە تەنگانە. دەستکورتی، لێقەومان.

**اعـــشی**- ع- ص(ئەئشـــا- e’şa): شەوکوێر.

**اعشار**- ا(ئەئشار- e’şar): دەیەکان.

**اعـصـاب**- ع- ا(ئەئسـاب- e’sab): دەمار، رەگ.

**اعصار**- ع- ا(ئەئسار- e’sar): دەورو زەمان، رۆژگاران.

**اعضاء**- ع- ا(ئەئزا- e’za): ئەندامان.

**اعطاء**- ع- مص- م(ئیـئـتـاء- i’ta’): بەخشین، دان.

**اعطیـه**- ع- ا(ئەئتـیـیـە- e’tiye): بەخشش.

**اعظام**- ع- مص- م(ئیئزام- i’zam): گەورەکردن، ڕێزگرتن، گەورەیی، مەزنی.

**اعظم**- ع- ص- ت(ئەئزەم- e’zem): گەورەتر، مەزنتر.

**اعقاب**- ع- ا(ئەئغاب- e’xab): نەوەو نەتیرە. پاژنەی پێ.

**اعـقل**- ع- ص- ت(ئەئغـەل- e’xel): ئاقڵتر، بە ئاوەزتر، هشیارتر.

**اعلی**- ع- ص(ئەئلا- e’la): بەرزتـر، باڵاتر، بڵندتر.

**اعـلاء**- ع- مص- م(ئیـئـلاء- i’la’): بەرزکردنەوە.

**اعـلال**- ع- مص- م(ئیـئـلال- i’lal): نەخۆشین.

**اعـــلام**- ع-ا(ئەعـــلام- e’lam): پێشـەواو ڕێبـەری قـەوم، ناوداری گـەورە، ئاڵاو نیشانە.

**اعلام**- ع- مص- م(ئیـئلام- i’lam): ئاگادارکردن، راگەیاندن.

**اعــلامــیــه**- ص- ن(ئیـئـلامـیـیـە- i’lamîye): بەیاننامـە و راگـەیاندن نامە.

**اعلان**- ع- مص- م(ئیـئـلان- i’lan): راگەیاندن، ئاشکراکردن، بەیاننامە.

**اعلم**- ع- ص- ت(ئـەئلـەم- e’lem): داناتر.

**اعم**- (ئەئەم- eem): گشتیتر. ئاپۆرای خەڵکی.

**اعمی**- ع- ص(ئەئما- e’ma): حافز، نابینا، کوێر، زەلیل.

**اعـمـاء**- ع- مص(ئیـئـمـاء- i’ma’): کوێرکردن.

**اعمار**- ا(ئەئمار- e’mar): تەمەن.

**اعـــمـــاق**- ع- ا(ئەئمـاغ- e’max): قوڵایی، ناخ، دەروون، کودیلە.

**اعـــمـــال**- ع- ا(ئەئمـــال- e’mal): کاروکردەوە.

**اعـمـال**- ع- مص(ئیـئـمـال- i’mal): بەکار بردن.

**اعمام**- ع- ا(ئەئمام- e’mam): مام، هاپۆ.

**اعـمـده**- ع- ا(ئەئمـیـده- e’mide): کۆڵەکە، ستون، ئەستون، عامود.

**اعمش**- ع- ص-(ئەئمەش- e’meş): چاوکوتو کوێر، چاوپروش.

**اعناب**- ع- ا(ئەئناب- e’nab): ترێ، هەنگور، مێو.

**اعناب**- ع- مص(ئیـــئناب- i’nab): رەنجـاندن. خـۆ ئالکانە کـاری سـەخت و دژوارەوە.

**اعناق**- ع- ا(ئەئناغ- e’nax): گەردن، مل، ئەستۆ.

**اعنق**- (ئەئنەغ- e’nex): گـەردن درێژ، گەردن بەرز.

**اعنی**- ع(ئەئنی- e’nî): مـــەبەســـتم ئەمەیە.

**اعوام**- ع- ا(ئەئڤام- e’vam): عـەیام و ساڵان.

**اعـــوان**- ع- ا(ئەئڤـــــان- e’van): هاوکـــارو دۆست و هاورێ و یاریدەدەر، دارودەستە.

**اعــوج**- ع- ص(ئەعــڤــەج- e’vec): خوارو خێچ، ناڕاست، بنیادەمی بەدخوو، خوار، چەفت.

**اعـوجـاج**- ع- ا- مص(ئیـئـڤـیـجـاج- i’vicac): خـوارو خـێـچ، چەفـتـبـوون، گێربوونەوە.

**اعـــور**- ع- ص(ئەئڤـــەر- e’ver): بنیـادەمی یەکـەڵە چاو، یەک چاو ببـینێ، ریخۆڵە کوێرە.

**اعیـاء**- ع- مص- م(ئیـئیـاء- i’ya’): ماندووکردن، شەکەتکردن.

**اعیاد**- ع- ا(ئەئیاد- e’yad): جەژنان.

**اعـــیـــان**- ع- ا(ئەئیـــان- e’yan): خـانەدان، گـەورە پیـاوان. دەوڵەمـەندان، پیاوماقووڵان.

**اعین**- ع- ا(ئەئیون- e’yun): چاوان.

**اعین**- ع- ص(ئـەئیـــــــەن- e’yen): کەسێک کە رەشێنەی چاوی زیاتر بێ.

**اغـاثه**- ع- مص(ئیـغـاسـە- ixase): بەفریا کەوتنی کەسێک، فریاکەوتن.

**اغـالیط**- ع- ا(ئەغـالیت- exalît): قسەی غەڵەت، بە هەڵەبردنی کەسێک.

**اغانی**- ع- ا(ئەغانی- exanî): ئاواز، سرود، گۆرانی، ستران.

**اغـبـر**- ع- ص(ئەغـبــەر- exber): تۆزاوی، بۆر، خاکی.

**اغـتـبـاط**- ع- مص- (ئیـغـتـیـبـات- ixtibat): شادبوون.

**اغـتـراب**- ع- مص- ل(ئیـغـتـیـراب- ixtirab): کـــەوتنە غـــەریبی، دوورە وڵاتی، چوونە نێو بێگانان، نامۆبوون.

**اغـتــرار**- ع- مص- ل(ئیـغـتـیـرار- ixtirar): مـــەغـــرور بوون، کـــەوتنە خەفڵەتەوە، فریوخواردن، فڕناخبوون.

**اغـتسـال**- ع- ا- مص م(ئیـغـتـیسـال- ixtisal): خۆششتن، خۆشۆردن.

**اغتشاش**- ع-ا -مص م(ئیغتیشاش- ixtişaş): ئاژاوەو هەراو هەنگـامـــە، غەلوغەش، تێکوپێک چوون.

**اغـتصاب**- ع- مص- م(ئیـغـتـیسـاب-

ixtisab): زەوتکردن، غەسپ کردن، داگیرکردن، ئەتکردن.
**اغتماس**- ع- مص- ل(ئیغتیماس- ixtimas): خۆ نقومکردن لە ئاودا، خۆ بە ئاواکردن.
**اغتمام**- ع- مص- ل(ئیغتیمام- ixtimam): غەمگین بوون. غەمباری، کۆڤانباری.
**اغتنام**- ع- مص- م(ئیغتینام- ixtinam): دەست کەوت، بەدەست خستن.
**اغتیاب**- ع- مص- ل(ئیغتیاب- ixtiyab): لێ خوێندنی پاشملە، غەیبەت کردن.
**اغتیال**- ع- مص- ل(ئیغتیال- ixtiyal): غافڵکوژی، رەشەکوژی، لێخەفتان.
**اغذیه**- ع- ا(ئەغزیە- exziye): خواردەمەنی، خۆراک.
**اغر**- ع- ص(ئەغەر- exer): چاک، جوان، پیاوی چاکەکار، گەورەو بەشەرەف و دڵسۆز.
**اغر، اوغور**- تر- ا(ئوغور- uxur): سەفەر، سەلامەتی لە سەفەردا، خێردیتن لە سەفەردا، بەرەکەت، شادی، بەختەوەری.
**اغراء**- ع- مص(ئیغراء- ixra): دنەدان، تەماح خستنەبەر، هەڵخەڵەتاندن، خاپاندن.
**اغراض**- ع- ا(ئەغراز- exraz): مەبەستەکان.
**اغراق**- ع- ا- مص(ئیغراغ- ixrax): موبالغە، زێدەڕۆیی.
**اغرب**- ع- ص- ت(ئەغرەب- exreb): غەریب تر.
**اغره**- ع- ص- ا(ئەغیرە- exire): هەڵخەڵەتاو و لە خۆبایی و هەرزەکاری بێئەزموون.
**اغره**- ع- ص- ا(ئوغرە- uxre): زام و وەرەم کەلە ملی مرۆڤ بێت.
**اغشیه**- ع- ا(ئەغشییە- exşiye): پەردە، رووپۆش.
**اغصان**- ع- ا(ئەغسان- exsan): لق و پۆپ و نیهال، چڵ.
**اغفال**- ع- مص- م(ئیغفال- ixfal): هەڵخەڵەتاو، ئیغفالکردن، گێلکردن.
**اغلاء**- ع- مص- م(ئیغلاء- ixla’): گران کردنی نرخ، گران کڕین، کوڵاندنی ئاو.
**اغلاط**- ع- ا(ئەغلات- exlat): هەڵە، خەڵەت، شاش.
**اغلاق**- ع- مص م(ئیغلاغ- ixlax): داخستن، ئاڵۆزکردنی کارێک، ئاڵۆزاندنی مەعناو مەبەستی وشەو دەستەواژان.
**اغلال**- ع- ا(ئەغلال- exlal): تەوق و کۆت، کۆت و زنجیر، کەلەپچەو پێوەند.
**اغلال**- ع- مص- م(ئیغلال- ixlal): خیانەت کردن، بوغزن، رقن، ناپاکیکردن.
**اغلب**- ع- ص ت(ئەغلەب- exleb): زۆرتر، زاڵتر.
**اغلوطه**- ع- ا(ئوغلوتە- uxlute): قسەی خەڵەت، بە هەڵەبردنی کەسێک.
**اغلیسون**- ا(ئیغلیسون- ixlîsun): پەلکە رەنگینە، کۆڵکە زێڕینە، کەسکەسۆر، زەرینەو سیمینە، پلورەواران.

**اغـــمــــاء**- ع- مص- م(ئيـــغــــمـــــاء- ixma’): بـێــــــهــــــۆشی، بورانـەوە، لەخۆچوون، لەهۆش چوون.

**اغــمــاض**- ع- مص- م(ئيــغــمـــاز- ixmaz): چاوپۆشی، چاونووقاندن.

**اغـنـی**- ع- ص- ت(ئـەغـنـا- exna): دەوڵەمەندتر، زەنگینتر.

**اغناء**- م- مص(ئيـــغنـاء- ixna’): دەوڵەمەندكردن، زەنگین كردن.

**اغنام**- ع. ا(ئەغنام- exnam): مـەڕو پەزان.

**اغـنيــــــاء**- ع- ا- ص(ئـەغـنـيـــــاء- exniya’): دەوڵەمەندان، زەنگینان.

**اغنيـــه**- ع- ا(ئوغنيــيـــە- uxniye): ئاواز، سروود، گۆرانی، ستران.

**اغواء**- ع- مص- م(ئيغڤاء- ixva’): گومڕاكردن، هەڵخەڵەتاندن، لەڕێدەركردن.

**اغـــيـــار**- ع - ا(ئەغـيـــار- exyar): ئەغیار، بێگانان، غەواران.

**اف**- ع(ئـوف- uf): ئـۆف، دەربـڕیـنـی بێزاری.

**افـاده، افـادت**- ع- مص- م(ئيـــفــــادە، ئيــــفـــــادەت- ifade, ifadet): ســـود پێگەیاندن، فیزو دەعیە زلی، خۆبەزلزانین.

**افاضـه**- ع- مص- م(ئيـفـازە- ifaze): ئاو بەخـۆداكـردن، پڕكـردنی كـاسـە تا لێـو ڕێژبوون. شارەزایی لە قسەكردندا بەڕادەی سوودگەیاندن.

**افاضل**- ع-ا(ئەفازيل- efazil): كۆی افضل (ئەفزەل): باڵاتر لەڕووی زانست و بنەچەو ڕەچەڵەكەوە.

**افاعی**- ع- ا(ئەفائی- efa’i): ماران، ئەژدیها.

**افاقه**- ع- مص- ل(ئيـفـاغـە- ifaxe): ئيـــفـاقـە، چاك بوونەوە، وەهۆش هاتنەوە، شفا.

**افام**- ا(ئەفام- efam): قەرز.

**افـانين**- ع-ا(ئەفـانين- efanîn): لق و پۆپی درەختان.

**افـاويه**- ع- ا(ئەفـاڤـيـيـە- efaviye): بەهارات.

**افئده**- ع- ا(ئەفئيدە- efide): دڵان.

**افت**- ا- مص(ئوفت- uft): كەموكوڕی، كەمی، نوقستانی.

**افـتـاء**- ع- مص- ل(ئيـفـتـاء- ifta’): فەتوادان، ئاشكراكردنی حوكم.

**افتادن**- مص- ل(ئوفتادەن-uftaden): بـەربـوونـەوە. لـە پـێـكـەوتـن، ڕوودانـی كارێك، كەفتن.

**افـتـاده**- ا- مض(ئـوفـتـادە- uftade): پيـــرو پەككەوتوو، كـــەســـاس و زەبوون، كەنەفت.

**افــتـــاليـــدن**- مص(ئيــفـــتـــاليـــدەن- iftalîden): پەڕاگــەندەكــردن، تۆڕدان، بڵاوكردنەوە.

**افـتـتــاح**- ع- مص- ل(ئيـفـتـيـتـاح- iftitah): كردنەوە، دەست پێكردن.

**افتتان**- ع- مص(ئيفتيتان- iftitan): فيتنە هەڵگيرساندن.

**افـتـخـار**- ع- ا- مص- ل(ئيـفـتـيـخـار- iftixar): فـەخـركـردن، شـانازی كـردن، سەرفرازی، سەربەرزی.

**افـتـد**- (ئەفـتـيـد- eftid): عـەجـيـب. سەير.

**افــتــراء**- ع- مص- ل(ئيــفــتـيــراء- iftira’): بوختان بۆ كردن.

**افتراس**- ع- مص- م(ئیفتیراس- iftiras): پارچەپارچەکردن و هەڵدڕینی نێچیر.

**افتراض**- ع- مص- م(ئیفتیراز- iftiraz): فەرزو واجب. فەرز کردن.

**افتراق**- ع- ا- مص- ل(ئیفتیراغ- iftirax): جودایی، لە یەکدی جیابوونەوە.

**افتضاح**- ع- مص- ل(ئیفتیزاھ- iftizah): ریسوایی، بەدناوی، ریسوابوون.

**افتعال**- ع- مص- م(ئیفتیئال-iftial): بوختان و درۆ هەڵبەستن بۆ کەسێک، داهێنان.

**افتقاد**- ع- مص(ئیفتیغاد- iftixad): ونکردن، لەدەست دان.

**افتقار**- ع- مص- ل(ئیفتیغار- iftixar): هەژار بوون، بێنەوایی.

**افتکاک**- ع- مص- ل(ئیفتیکاک- iftikak): لێک جیابوونەوە.

**افت و خیز**- ا- مر (ئوفتوخیز- uftuxîz): کەوتن و هەستان.

**افتیمون**- ا(ئەفتیمون- eftîmun): زیرە.

**افچه**- ا(ئوفچە، ئەفچە-ufçe, efçe): داهۆڵ.

**افحش**- ع- ص- ت(ئەفهەش- efheş): ئاشکراتر، حەیابەرتر.

**افخم**- ع- ص- ت(ئەفخەم- efxem): پایەبەرزتر، بەقەدرتر.

**افد**- ص- (ئەفد، ئەفید- efd, efid): عەجیب، سەیر.

**افدر**- ا(ئەفدەر- efder): برای باب، مام، هاپۆ.

**افدستا**- ا(ئەفدیستا- efdista): باشترین ستایش، ستایشی سەیر.

**افدم**- ا(ئەفدوم- efdum): ئەنجام، ئاقیبەت، ئاکام.

**افدیدن**- مص- ل(ئەفدیدەن- efdîden): سەرسوڕمان، تەعەجوبکردن، حەپەسان.

**افر**- (ئوفر- ufr): پێشکەشکردن، بەخشین، پێشنیاز.

**افرا**- ا(ئەفرا- efra): درەختێکە لە بابەتی چنار.

**افراختن**- مص- م(ئەفراختەن- efraxten): بەرزکردنەوە. هەڵکردن.

**افراخته**- ا- مف(ئەفراختە-efraxte): هەڵکراو، بەرزکراوە.

**افرازنده**- ا- فا (ئەفرازەندە- efrazende): هەڵکەر، بەرزکەرەوە.

**افراز**- ا(ئەفراز- efraz): هەوراز، بەرز.

**سرافراز**- ا- فا (سەر ئەفراز- serefraz): سەربەرز، سەرفراز.

**افراد**- ع- ا(ئەفراد- efrad): تاککردنەوەی شتێک، بەتنێ دەست دانە کارێک.

**افراز**- ا(ئەفراز- efraz): جیاکردنەوەی شتێک لە شتێکی دی. هەڵاوێردان.

**افرازیدن**- مص- م(ئەفرازیدەن- efrazîden): رازاندنەوە، هەڵکردن، بەرزکردنەوە، ئاڵا هەڵکردن.

**افراز**- ع- ا(ئەفراز- efraz): کەناڵ، سەرچاوە، کانی، خێوەت، سەرا پەردە، دیوانی میر.

**افراس**- ع- ا(ئەفراس- efras): ئەسپان.

**افراشتن**- ا- مص- م(ئەفراشتەن- efraşten): بەرزکردنەوە، هەڵکردن.

**افراشته**- ا- مف(ئەفراشتە- efraşte): هەڵکراو.

**افراض**- ع- مص- م(ئیفراز- ifraz): بەشە ئازوقەدان بە کەسێک، زۆربوونی پەز بەڕادەیەک کە زەکاتی بکەوێ.

**افراط**- ع- مص- ا(ئیفرات- ifrat): توندڕەوی، لە حەد دەرچوون، زیادڕەوی.

**افراض**- ا(ئەفراز- efraz): خواردنی زیندانیان.

**افربیون**- ا(ئەفەربیون- eferbiyun): جۆرە گیایەکە.

**افرنج**- ا(ئەفرەنج- efrenc): فەڕەنگی، بێگانەی ئەوروپایی.

**افرند**- ا(ئەفرەند- efrend): فەڕوشکۆ، ناسکی و جوانی.

**افرندیدن**- مص(ئەفرەندیدەن- efrendîden): رازاندنەوە، جوانکردن.

**افرنگ**- ا(ئەفرەنگ- efreng): فەڕوشکۆ، بێگانە، تەختی پاشایەتی.

**افرنگی**- ص- ن(ئەفرەنگی- efrengî): فەڕەنگی. ئەوروپایی.

**افروختن**- مص- م(ئەفروختەن- efruxten): هەڵکردنی ئاگر. چرا، رۆشنکردن.

**افروزاندن، افروزانیدن**- مص- م(ئەفروزاندەن، ئەفروزانیدەن- efruzanîden): هەڵگیرساندن، هەڵکردن، رووناککردن.

**افروزه**- ا(ئەفروزە- efruze): پلێتەی چرا، دەستە چیلە.

**افروزیدن**- مص(ئەفروزیدەن- efruzîden): بڕوانە: **ئەفروختن/** ئەفروختەن.

**افروشه**- ا(ئەفروشە- efruşe): جۆرە حەڵوایەکە لە ئاردو رۆن و هەنگوین دروست دەکرێ.

**افروغ**- ا(ئەفروغ- efrüx): تیشک، روناکی، پرتەو.

**افریسموس**- ا(ئەفریسموس- efrîsmüs): نەخۆشییەکە کە لە هەندێ پیاواندا دەردەکەوێ، کێرەڕەپەی بەردەوام.

**افزار**- ا(ئەفزار- efzar): ئامێر، ئەوزار، ئاڵەت و بەهاراتی نێو خواردن و چێشت.

**افزارمند**- ا(ئەفزارمەند- efzarmend): خاوەن ئامێر، کەسێک کە بە ئامێر کار بکات، ئامێردار.

**افزودن**- مص- م(ئەفزودەن- efzuden): زیاد کردن، زیاد بوون.

**افژولیدن**- مص- م(ئەفژولیدەن- efjulîden): پەرێشان کردن، پەراگەندە کردن.

**افساد**- ع- مص- م(ئیفساد- ifsad): فەسادکردن، ئاژاوەو فیتنە هەڵگیرساندن، گەندەڵکردن.

**افسار**- ا(ئەفسار- efsar): هەوسار، رەشمە.

**افسان**- ا(ئەفسان- efsan): هەسان، هەستان، بەردێکە چەقۆو کێردی پێ تیژ دەکەنەوە، ئەفسانەو حیکایەت.

**افسانه**- ا(ئەفسانە- efsane): سەربورد، بەسەرهات، حیکایەت، نەقڵ، داستان.

**افسایيدن**- مص- م(ئەفسایيدەن- efsayîden): ئەفسونکردن، رامکردن و دەستەمۆکردن، کەویکردن.
**افسد**- ع- ص- ت(ئەفسەد- efsed): فاسیدتر، بەدتر، گەندەڵتر.
**افسر**- ا(ئەفسەر- efser): تاج، کڵاوی پاشایی، خودان پلەی سوپایی (ئەفسەر).
**افسردن**- مص- ل(ئەفسوردەن- efsurden): سیس بوون و ژاکان، ساردبوونەوە، دڵ ساردبوونەوە، بەستن لە ئەنجامی سەرمادا، بنێسان.
**افسرده**- ا- مص(ئەفسوردە- efsurde): دڵتەنگ، بەستوو، ژاکاو، سیس، غەمگین.
**افسوس**- ا(ئەفسووس- efsûs): حەیف، مەخابن، زوڵم، ستەم، حەسرەت، خەم، پەژارە، گاڵتەوگەپ، تەوس و توانج.
**افسون**- ا(ئەفسون- efsün): فێڵ، حیلە، سیحر، جادوو.
**افسونگر، فسونگر**- ص- شغ(ئەفسونگەر، فسونگەر- efsûnger, fisûnger): جادوگەر. سیحرباز، جادووباز.
**افشاء**- مص- م(ئیفشاء- ifşa’): ئاشکراکردن، پەرتەوازەکردن، بڵاوەپێکردن.
**افشار**- ا(ئەفشار- efşar): ناوی یەکێکە لە خانەکانی تەختە نەرد (تاوڵە)، ناوی ئاهەنگێکی مۆسیقی ئێرانییە، تایفەیەکی ئێرانییە.
**افشاندن**- مص- م(ئەفشاندەن- efşanden): رشتن و بڵاوکردنەوە، وەشاندن.
**افشانیدن**- مص(ئەفشانیدەن- efşanîden): تۆودان.
**افشرج**- ا(ئەفشورەج- efşurec): ئاوی میوە کە لە ئەنجامی گوشینی وەرگیرابێ.
**افشردن**- مص- م(ئەفشوردەن- efşurden): گوشاردان، گوشین.
**افشرده، فشرده**- ا- مف(ئەفشوردە، فشوردە- efşurde, fşurde): گوشراو.
**افشره**- ا(ئەفشورە- efşure): ئاوی میوە کە بە گوشین گیرابێ.
**افشک، افشنگ**- ا(ئەفشەک، ئەفشەنگ- efşek, efşeng): شەونم، ئاونگ، خوناڤ.
**افشون**- ا(ئەفشون- efşun): شەن، شەنە.
**افشه**- ا(ئەفشە- efşe): ساوار، ساوەر، گەنمە کوتراو.
**افصح**- ع- ص- ت(ئەفسەح- efseh): رەوانتر، بەزمانتر.
**افضال**- ع- مص- م(ئیفزال- ifzal): زیاد کردن، باڵاتر لە رووی بنەچەوە. بەخشش، چاکی کردن.
**افطار**- ع- مص- م(ئیفتار- iftar): فتارکردنەوە، رۆژو شکاندن، بەربانگ.
**افطح**- ع- ص(ئەفتەح- efteh): کەپو پان، سەرپان.
**افطس**- ع- ص(ئەفتەس- eftes): لوت فس، فەنسە.
**افعال**- ع- ا(ئەفئال- efal): کارو کردەوان.
**افعی**- ع- ا(ئەفئا- efa): ماری گەورە، ئەژدیها.

**افغان**- ا(ئەفغان- efxan): هاوار، ئاهونالە.

**افغانی**- ص- ن(ئەفغانی- efxanî): خەلکی ئەفغانستان.

**افق**- ع- ا(ئوفوغ- ufux): ئاسۆ، داوێنی ئاسمان، پەراوێزی ئاسمان.

**افکار**- ع- ا(ئەفکار- efkar): هزرو بیران.

**افکندن**- مص- م(ئەفکەندەن- efkenden): توڕدان، راخستنی فەرش.

**افگار**- ص(ئەفگار- efgar): ڕەنجاو، زامدار، ماندوو.

**دل افگار، دلفگار**- ص(دل ئەفگار، دلفیگار- dilefgar, dilfigar): دڵ یەشاو، دڵ بریندار، دلبرین.

**افگانه**- ا(ئەفگانە- efgane): منداڵی نەبەکامی لەبار چوو.

**افلاک**- ع- ا(ئەفلاک- eflak): ئاسمانان.

**افلاس**- ع- مص- ل(ئیفلاس- iflas): نابووت بوون، نادارا بوون، دەستکورتی و بێنەوایی.

**افلنجه**- ا(ئەفلەنجە- eflence): جۆرە گیایەکە.

**افناء**- ع- مص- م(ئیفناء- ifna’): نەهێشتن، فەناکردن، دالاویز برین، یافتبرین.

**افنان**- ع- ا(ئەفنان- efnan): لق و پۆپان، چڵ.

**افندی**- تر- ا(ئەفەندی- efendî): لە قەبێکە بۆ ڕێزلێنان، وەک: بەگ، ئاغا، ئەمە زیاتر بۆ خوێنەوارو زاناو نووسەران بەکارهاتووە.

**افندیدن**- مص- ل(ئەفەندیدەن- efendîden): شەڕکردن.

**افواج**- ع- ا(ئەفڤاج- efvac): دەستە دەستە.

**افواه**- ع- ا(ئەفڤاه- efvah): دەم و زاران.

**افواه**- ا(ئەفڤاه- efvah): ئالەت و بەهاراتی تام و بۆ خۆشی خواردەمەنی.

**افول**- ع- مص(ئوفول- ufül): ئاوابوون، دیارنەمان، ئاوابوونی ستێران.

**افهام**- ع- مص- ل(ئیفهام- ifham): تێگەیاندن.

**افیون**- ا(ئەفیون- efyün): ئەفیون، تیلیاک، شیلەی خەشخاش.

**افیونی**- ص- ن(ئەفیونی- efyunî): کەسێک کە خووی بە کێشان یان خواردنی تیلیاکەوە گرتبێ، ئەفیونکێش.

**اقارب**- ع- ص- ا(ئەغاریب- exarib): خزم و کەس و کاران.

**اقاقیا**- ا(ئەغاغیا- exaxiya): جۆرە درەختێکە.

**اقاله، اقالت**- ع- مص- م(ئیغالە، ئیغالەت- ixale, ixalet): هەڵوەشاندنەوەی فرۆشتن، هەڵوەشاندنەوەی مامەڵەو سەودا.

**اقالیم**- ع- ا(ئەغالیم- exalîm): ئیقلیم، کیشوەر، ولات، مەلبەند، ناوچە، هەرێم.

**اقامه، اقامت**- ع- مص- ل(ئیغامە، ئیغامەت- ixame, ixamet): وەستان، نیشتەجێ بوون، ئاکنجی بوون.

**اقانیم**- ا(ئەغـانـیم- exanîm): کـۆی اقنوم/ ئقنوم-ـە: شـەخس، بناوان و هۆی شتێک.

**اقـانیم ثلاثه**- ا(ئەغـانیـمی سـەلاسـە- exanîmi selase): لەلای مەسیحیان دەکاتە: باب، کوڕ، روحی قودس.

**اقباض**- ع- مص- م(ئیغباز- ixbaz): گـرتن، لـە مـامـەڵەو سـەوداو ئاڵوویرش‌دا بەکار دێت.

**اقبـال**- ع- مص- م(ئیـغبـال- ixbal): هاتن، بەخت و نێـوچەوان، یەغـبـاڵ، ئیقباڵ، تالح، شانس، هیر.

**اقبح**- ع- ص- ت(ئەغبەھ- exbeh): ناشرین تر، بلّح تر.

**اقتباس**- ع- صم(ئیغتباس-ixtibas): سـوود وەرگـرتـن و زانست فـێـربوون لە کـەسـێکەوە، لە ڕەوانبـێـژیدا بریتـیـە لە بەکـارهێنانی ئـایەتی قـورئـان یان دەستەواژەیەک لە فەرموودەکان. لە شیعرو پەخشـاندا بێ ئەوەی ئاماژە بکرێ کە لە چ شـوێنێکەوە نەقڵ کـراوە، نەقڵ کـردن و وەرگـرتـنی بابەتێک لە کـتـێب یان ڕۆژنامەوە.

**اقـتـحـام**- ع- مص(ئیـغـتـیـهـام- ixtiham): خۆهەڵقورتاندن لە کارێک بەبێ بیـرکـردنەوە، خۆخـسـتـنە ناڕەحەتی و سـەریەشـەوە، بەسـووک زانینی کـەسـێک، هەڵمەتبردن.

**اقـتـداء**- ع- مص- م(ئیـغـتـیـداء- ixtida'): پەیڕەوکـردن، نوێژکـردن لە پشت پێش نوێژەوە.

**اقـتـراح**- ا- مص- م(ئیـغـتـیـراھ- ixtirah): پێشنیاز.

**اقـتـراع**- ع- مص ل(ئیـغـتـیـراء- ixtira'): تیرو پشک، قورعە کردن.

**اقـتـران**- ع- ا- مص ل(ئیـغـتـیـران- ixtiran): نـزیـکبـوونەوە، بوون بەیار لەگـەڵ کـەسـێکدا، نزیکی و پەیوەندی، بەیەک گەییشتن.

**اقـتـسـام**- ع- مص- م(ئیـغـتـیـسـام- ixtisam): دابەشکردن، سوێند خواردن.

**اقـتـصـاد**- ع- مص- ل(ئیـغـتـیـسـاد- ixtisad): پاشەکەوت، دەستگرتنەوە لە خەرجی‌دا، دەست پێوەگرتن.

**اقـتـصـاص**-ع- مص- ل(ئیـغـتـیـسـاس- ixtisas): چیرۆک گوتن، تۆڵە سەندن.

**اقـتـضـاء**- ع- مص- م(ئیـغـتـیـزاء- ixtiza'): داواکردنەوەی قەرز، داواکردن و وەرگرتنەوەی قەرز، تکا، داوا.

**اقـتـضـاب**- ع- مص(ئیـتـغـیـزاب- ixtizab): بڕین، بڕینی لق و نیـهـاڵ لە درەختان.

**اقـتطاع**- ع- مص- م(ئیـغـتـیـتـاء- ixtita'): میوە چنین، بڕین.

**اقـتـفـاء**- ع- مص- م(ئیـغـتـیـفـاء- ixtifa'): پەیڕەوی کـردن، شـوێن پێ هەڵگرتن.

**اقتلاع**- ع- مص(ئیغتیلاء- ixtila'): هەڵکەندن، لەبن و بێـخـەوە هەڵکەندن، ریشەکێشی.

**اقـتنـاء**- ع- مص- م(ئیـغـتـینـاء- ixtina'): بەدەسـتـهـێنـان و پاشەکەوتکردنی سەروەت و سامان.

**اقحوان**- ع- ا(ئوغهوڤان- uxhuvan): جۆرە گوڵێکە. جۆرە گیایەکی بۆن خۆشە، پونگە.

**اقــداح**- ع- ا(ئەغـــداھ- exdah): لێوان، پەرداخ، گلاس، قەدەح، بادە.
**اقــدام**- ع- ا(ئەغـــدام- exdam): پێیان، هەنگاو.
**اقدام**- ع- مص- م(ئیغدام- ixdam): چوونە پێش، ئازایەتی، دلێری.
**اقــدس**- ع- ص(ئەغـدەس- exdes): پاکتر، پیرۆزتر.
**اقدم**- ع- ص- ت(ئەغدەم- exdem): دێرینەو کۆنتر.
**اقـرار**- ع- مص- ل(ئیـغـرار- ixrar): دان پـێـــــدانـان، دەربـڕیـنـی ئـاشـکـراو راستەوخۆی مەبەست.
**اقــراع**- ع- مص(ئیــغـــراء- ixra’): قورعە راکێشان.
**اقـــران**- ع- ا(ئەغـــــران- exran): نزیکان، هاوچەشنان، هاوڕێیان، هاوگوف، ئاوزە.
**اقرب**- ع- ص-ت(ئەغـرەب- exreb): نزیکتر.
**اقرباء**- ع- ص- ا(ئەغریبا- exriba’): خزمان، نزیکان، کەس و کار، خوێشان.
**اقـــرع**- ع- ص(ئەغـــــرەء- exre’): پیـاوێک کـە قـژی سـەری روتابێــتــەوە، کەچەڵ.
**اقســاط**- ع- ا(ئەغـسـات- exsat): بەشێک، قەرزێک کە بۆ دانەوەی بکرێ بە چەند بەشێکەوە . بەش، بڕ.
**اقســاط**- ع- مص- م(ئیــغـســات- ixsat): دادوەری، عەدالەت کردن.
**اقـســام**- ع- ا(ئەغـسـام- exsam): چەند بەشێک.
**اقـصی**- ع- ص- ت(ئەغـسا- exsa): دوورتر.
**اقصاء**- ع- مص م(ئیغسـاء- ixsa’): لابردن، دوورخستنەوە.
**اقـصـا**ء- ع- ا(ئەغـســاء- exsa’): دوور.
**اقصر**- ع- ص- ت(ئەغسەر- exser): کورتتر.
**اقط**- ا(ئەغەت- exet) پەنیر، کەشک.
**اقطاب**- ع- ا(ئەغـــتـــاب- extab): قـوتب، گەورە، پیری تەریقەتی پایەبەرز، جەمسەر.
**اقطار**- ع- ا(ئەغـتار- extar): ناوچە، وڵات، ئیقلیم.
**اقطاع**- ع- مص(ئیــغــتــاء- ixta’): شتێک لە خۆت ببڕی و بیدەی بە کەسێکی دی، بەخـشــینی مــوڵـکێک یان پارچە زەوییـەک بە کـەسێک تا بە دەرامـەتەکـەی بژی، تیوڵ.
**اقطع**- ع- ص(ئەغـــتـــەء- exte’): پیاوی دەست بڕیاو، دەستبڕاو.
**اقعاد**- ع- مص- م(ئیغـئاد- ix’ad): دانیشاندن، خزمەتکردنی کەسێک.
**اقـفـال**- ع- ا(ئەغـفـال- exfal): قـفڵ، کلیل.
**اقل**- ع- ص(ئەغەل- exel): کەمتر.
**اقـلال**- ع- مص- م(ئیـغـلال- ixlal): کەمکردن.
**اقلام**- ع- مص- م(ئەغلام- exlam): قەڵەم، پێنووس.
**اقلیم**- ا(ئیــــغـلیم- ixlîm): وڵات، ناوچە، کیشوەر، هەرێم.
**اقلیمیا**- ل- ا(ئیغلیمیا- ixlimiya): وردەی بنی زێڕو زیو، خۆڵی زێڕ، بەڕادە.

**اقمار**- ع- ا(ئەغمار- exmar): مانگ، هەیڤ.
**اقمشه**- ع- ا(ئەغمیشه- exmişe): کوتاڵ، قوماش.
**اقناع**- ع- مص- م(ئیغنا ء- ixna'): رازی کردن، قەناعەت پێکردن، هێنانە رەدا.
**اقوی**- ع- ص(ئەغڤا- exva): بەتواناتر، مکومتر. بەهێزتر، قایمتر.
**اقواء**- ع- مص- ل(ئیغڤاء- ixva'): تەواوبوونی تێشوو، بێ تێشوو مانەوە.
**اقوات**- ع- ا(ئەغڤات- exvat): خواردەمەنی، خۆراک، قووت.
**اقوام**- ع- ا(ئەغڤام- exvam): تیرەو تایفە، قەوم و قیلە.
**اقویاء**- ع- ص- ا(ئەغڤیاء- exviya'): بە توانایان، هێزداران.
**اقیانوس**- ا(ئوغیانوس- uxyanus): ئۆقیانووس، دەریای زۆر گەورە، ئۆقیانووسی مەزن، ئۆقیانووسی ئەتڵەسی، ئۆقیانووسی هندی، ئۆقیانووسی بەستەڵەکی باکوور، ئۆقیانووسی بەستەڵەکی باشوور، دەریالووش، زەریالووش.
**اکابر**- ع- ص- ا(ئەکابر- ekabir): کۆی اکبر- (ئەکبەر): مەزنان.
**اکاذیب**- ع- ا(ئەکازیب- ekazîb): درۆیان، دەلەسە.
**اکارس**- ا(ئەکاریس- ekaris): کارگ، قارچک، هەلچ.
**اکارع**- ع- ا(ئەکارئ- ekari'): کۆی **کراع**: (کوراع):بە: کەلەپاچە، سەروپێی رەشە ولاخ یان حەیوان.
**اکاسره**- ع- ا(ئەکاسیره- ekasire): کۆی کیسرا/ کیسرایە، بەعەرەبیکراوی (خسرو)ەوە.
**اکال**- ع- ص(ئەکال- ekkal): زۆرخۆر، فرە خۆر، بخۆر.
**اکالیپتوس**- ل. ا(ئوکالیپتوس- ukalîptus): درەختی کالیپتوس.
**اکالیل**- ع- ا(ئەکالیل- ekalîl): تاج، ئەفسەر، تاجە گوڵینە، دواخ.
**اکباد**- ع- ا(ئەکباد- ekbad): جەرگ، جگەر.
**اکبر**- ع- ص- ت(ئەکبەر- ekber): مەزنتر، گەورەتر.
**اکتاف**- ع- ا(ئەکتاف- ektaf): شان.
**اکتبر**- ا(ئوکتوبر- uktubr): مانگی دەیەمی ساڵی زایینی.
**اکتحال**- ع- مص- م(ئیکتیهال- iktihal): چاوڕشتن، سوورمە لە چاوکردن.
**اکتساب**- ع- مص- م(ئیکتیساب- iktisab): بەدەست هێنان.
**اکتشاف**- ع- مص- م(ئیکتیشاف- iktişaf): کەشفبوون، کەوتنەڕوو، ئاشکرابوون.
**اکتفاء**- ع- مص- م(ئیکتیفاء- iktifa'): بەسکردن، کیفایەت کردن.
**اکتناه**- ع- مص- ل(ئیکتناه- ikti-nah): گەیشتنە بنج و بناوانی شتێک، پەیبردن بە ماهیەت و نهێنی شتێک.
**اکثار**- ع- مص- م(ئیکسار- iksar): زۆر کردن.
**اکثر**- ع- ص- ت(ئەکسەر- ekser): زۆرتر.
**اکثم**- ع- ص(ئەکسەم- eksem): پیاوی ورگن، تێرخۆراک، زگن.

**اکحل**- ع- ص(ئەکـهـەل- ekhel): چاو بەکل. پیاوی برژانگ ڕەش.

**اکذوبە**- ع- ا(ئوکـزوبە- ukzübe): درۆ، قـسـەی درۆو بێ بنج و بناوان، دەلەسە.

**اکرام**- ع- مص- م(ئیکرام-ikram): ڕێزگرتن، بەخشیش پێدان.

**اکراه**- ع- مص- م(ئیکراه- ikrah): ناچارکردن، تۆبزی.

**اکرم**- ع- ص(ئەکـرەم- ekrem): سەخیتر، گەورەتر.

**اکزما**- فر- ا(ئیکزیما- ikzima): جۆرە نەخۆشییەکی پێستە.

**اکسون**- ا(ئیکسون- iksûn): جۆرە جلێکی ڕەشی گران بەهایە.

**اکسید**- (ئوکسید- uksîd): ئۆکسید.

**اکسیداسیون**- فر- ا(ئوکسیداسیون- uksîdasyun): پـرۆسـەی ئەکسەدەکردن.

**اکسید دوزنگ**- ا(ئوکسیددوزەنگ- uksîddûzeng): ئۆکسیدی دوو زەنگ.

**اکسید دو کربن**- ا(ئوکسیددو کاربون- uksîddûkarbun): دووەم ئۆکسیدی کاربون.

**اکسید کلسیوم**- ا(ئوکسید کالیسیوم- uksîdkalîsyum): قـسڵ، ئاهەک، قسر.

**اکسیر**- ل- ا(ئیکسیر- iksîr): ئیکسیر، کیمیا، هەر شتێک زۆر بە کەڵکو نایاب بێ.

**اکسیژن**- فر- ا(ئوکسیژن- uksîjin): ئۆکسجین.

**اکسیژناسیون**- فر- ا(ئوکسیژناسیون- uksîjnasiyun): پـرۆسـەی ئۆکسجیناوی کردنی تەنێک.

**اکفاء**- ع- مص- م(ئیکفاء- ikfa’): چەماندنەوە، خوارکردن.

**اکل**- ع- ا(ئەکل- ekl): خواردن.

**اکلیل**- ع- ا(ئیکلیل- iklîl): تاج، ئەفسەر، دواخ.

**اکلیل الجبل**- ع- ا- فر(ئیکلیول ئەلجەبل- iklîlul lcebel): ئەکلیلی کێوی. گیایەکە.

**اکلیون، اگلیون**- ا(ئەکلیون، ئەگلیون- ekliyun): ئینجیل، پارچەی حەوترەنگ، جۆرە قوماشێکی ئاوریشمی گوڵدارە.

**اکمال**- ع- مص- م(ئیکمال-ikmal): تەواوکردن.

**اکمە**- ا(ئەکمە- ekeme): گرد- تەپە، کۆڵ.

**اکمە**- ع- ص-ت(ئەکمە- ekme): کوێر، کوێری زکماک.

**اکمل**- ع- ص- ت(ئەکمەل- ekmel): تەواوتر.

**اکناف**- ع- ا(ئەکناف- eknaf): کەناران، دەوروبەر.

**اکنون**- هـ- ق(ئەکنون- eknûn): ئێستا، هەنووکە، ڤێ گافێ، نها، ئیرەنگە.

**اکواب**- ا(ئەکڤاب- ekvab): کوزە، شەربە، کوپ.

**اکوان**- ا(ئەکڤان- ekvan): کەون، دنیاو بوون، گەردوون.

**اکوان**- ع- ا(ئەکڤان- ekvan): بەپێی

شانامە، ناوی ئەو دێوەیە کە لەگەڵ ڕۆستەمدا کەوتە شەڕو ئەنجام کوژرا، کوناحکار، گوڵی ئەرخەوان.

**اکوبا**- ا(ئەکوبا- ekûba): درەختێکی بچکۆلەی جوانە.

**اکول**- ع- ص(ئەکوول- ekul): زۆرخۆر، چلێس.

**اکونومی**- ف- ا(ئیکونومی- ikunûmî): ئیختیسادی، ئابووری.

**اکونومیست**- فر-ا(ئیکونومیست- ikunûmîst): پسپۆری ئابووری. ئابووریزان.

**اکیاس**- ع- ا- ص(ئەکیاس- ekyas): کیسە، وریا، زیرەک. زرینگ.

**اکیپ**- (ئیکیپ- ikîp): دەستەیەک کرێکاری هاوپیشە.

**اکید**- ع- ص-(ئەکید- ekîd): مکوم، قایم.

**اکیدنە**- ع- ص(ئیکیدنە- ikîdne): ژیژکی ئوسترالیایی.

**اکیس**- ع- ص- ت(ئەکیەس-ekyes): بە ئاوەزتر، هۆشیارتر، زیرەکتر.

**اگر**- پە- حرف- (ئەگەر- eger): ئامرازی مەرج، ئەگەر.

**اگرا**- ا(ئوگرا- ugra): پەڵوڵە.

**الاغ**- تر- ا(ئولاغ- ulax): گوێدرێژ، ولاخ، هەر.

**الامان**- ع- ا(ئەل ئەمان- eleman): داواکردنی پەنا، پەناوەبەربردنی کەسێک.

**الان**- ع- ق(ئەلئان- elan): ئێستا، نهۆ، هەنووکە، ئەلعان، نها، ئێرەنگە.

**الب**- ا(ئیلب- ilb): جۆرە درەختێکی درک دارە، لە درەختی ترنج دەچێت.

**البا**- ا(ئولبا- ulba): دڵ و جگەری لە ڕۆن و پیازدا سوورەوەکراو، قەلی پیفاز.

**الباب**- ع- ا(ئەلباب- elbab): ئەقڵ و ئاوەزان.

**الباد**- ا(ئەلباد- elbad): هەلاج.

**البتە**- ع- ق(ئەلبەتتە- elbette): هەڵبەتە. بێگومان.

**البسە**- ع- ا(ئەلبیسە- elbise): جلکوبەرگ، پۆشاک.

**التباس**- ع- مص(ئیلتیباس-iltibas): لێ تێک چوون، بەهەڵەچوون.

**التثام**- ع- مص- ل(ئیلتیسام- iltisam): دەمامک کردن، دەمپۆشین.

**التجاء**- ع- مص- م(ئلتیجاء- iltica’): پەنابردن. بوون بە پەنابەر.

**التجاج**- ع- مص- ل(ئیلتیجاج- ilticac): هەراوزەنا، جۆش و خرۆشی دەریا، تێکەڵ بوون و گەورە بوونی شەپۆلانی دەریا.

**الحاد**- ع- مص- ل(ئیلهاد- ilhad): لە دین وەرگەڕان، لە دین دەرچوون.

**التحاق**- ع- مص(ئیلتیهاغ-iltihax): پەیوەندی کردن.

**التحام**- مص- ل(ئیلتیهام-iltiham): پێکەوە لکان، جۆش خواردن و لەحیم بوونی دووشت بەیەکەوە.

**التذاذ**- ع- مص- ل(ئیلتیزاز- iltizaz): لەزەت بردن، لەزەت بینین، لەمگێز بردن.

**التزام**- ع- مص- ل(ئیلتیزام- iltizam): پابەندی بە کارێک یان شتێکەوە.

**التـصــاق**- ع- مص- م(ئیلتـیـســاغ- iltisax): پێکەوە نووســـان، لکاندنی شتێک بە شتێکەوە.

**التـفــات**- ع- مص- م(ئیلتـیـفــات- iltifat): روودان بـە کـــــەســـــێـک، ئاوڕلێدانەوە. بایەخ پێدان، بە لوتف بوون لەگەڵ کەسێکدا.

**التـقــاط**- ع- مص- م(ئیلتـیـغــات- iltixat): هەڵگرتنەوەی شــتــێک لە زەوی، چینەکردنی مریشک.

**التـمــاس**- ع- مص- م(ئیلتـیـمــاس- iltimas): داواکردن، داواکردنی شتێک بەلاڵانەوەو پاڕانەوە.

**التواء**- ع- مص- ئیلتیڤاء- ’iltiva) پێچ خواردن، پێکەوە پێچان، لوولخواردن.

**التون**- تر- ا(ئەلتون- eltûn): ئاڵتون، زێڕی سوور، قەرەواش.

**التـهــاب**- ع- مص- ل(ئیلتـیـهــاب- iltihab): هەڵایسانی ئاگر، هەڵایسان.

**التـــیـــام**- ع- مص- ل(ئیلتـــیـــام- iltiyam): ســارێژبـوونەوەی زام و برین. پێکەوەلکان.

**الجـاء**- ع- مص- م(ئیلجـاء- ’ilca): ناچارکردن، پەنادان.

**الجـــخت**- الچـــخت- ا(ئەلجـــەخت، ئەلچەخت- elcext, elçext): ئومێد، تەماح.

**الجـه**- ا(ئولجـە- ulce): تالانی، دیل و ئەسیر، دەستکەوتی تالانی، غەنیمە.

**الحـاح**- ع- مص- م(ئیلهـاه- ilhah): سوربون و پێ داگرتن. داواکردن.

**الحـــاد**- ع- ا(ئەلهـــاد- elhad): کـۆی لحد/ لەحد: گۆڕ.

**الحـاد**- ع- مص- ل(ئیلحـاد- ilhad): کـوفـرو بێـدینی، ئینکاری کـردنی خـوا، لە دین دەرچوون.

**الحاق**- ع- مص- ل(ئیلهـاغ- ilhax): پەیوەندی کردن بە کەسێکەوە.

**الحان**- ع- ا(ئەلهان- elhan): ئاواز.

**الحـــذر**- ع- ا(ئەلحـــەزەر- elhezer): ئاگادارکردنەوە. ترس و پارێز.

**الحق**- ا(ئەل هەغ- elhex): ئەلحـەقی، راستییەکەی.

**الحـمـد**- ع- ا(ئەلهـەمـد- elhemd): سوپاس. ستایش.

**الـدنــگ**- ا(ئــەلــدەنــگ- eldeng): بەرەڵڵا، بێکار، موفتەخۆر، مشەخۆر.

**الــذ**- ع- ص- ت(ئــەلــەز- elez): بەلەزەتتر، بەتامتر، لەمگێزتر.

**الـرد**- ا(ئـەلـەرد- elered): رەشـکـە، تۆڕی کاکێشان.

**الزام**- ع- مـص- م(ئیـلزام- ilzam): لازم کـردن، واجـبکردنی کـارێک لەســەر کەسێک.

**الست**- ع- ا(ئەلەست- elest): کەفەڵ، ران، سمت.

**الست**- ع(ئەلەســتــو- elestu): ئایا نیم؟!

**الست**- ع- ا(ئەلـەست- elest): رۆژی ئەزەڵ، ئـەو رۆژەی کـــــە خــــــودا روو لە خـەڵقـەندەکـانی خـۆی گـوتی: (الستُ بربکم).

**السنه**- ع- ا(ئەلســــینە- elsine): زمانان، زار.

**الصاق**- ع- مص- م(ئیلساغ- ilsax): چەسپاندن، لکاندن.

**الطاف**- ع- ا(ئەلتاف- eltaf): لوتف.
**الطاف**- ع- مص- م(ئیلتاف- iltaf): نەرمی و چاكە كردن، ناسكتر، سووكتر.
**العاب**- ع- مص- م(ئیلعاب- il’ab): یاریكردن،خستنە وازی.
**العطش**- ع- ا(ئەل ئەتەش- eleteş): تینوێتی، تەژنەیی.
**الغاء**- ع- مص- م(ئیلغاء- ’ilxa): لەغوكردنەوە، هەڵوەشاندنەوە، فتكردنەوە.
**الغاز**- ع- ا(ئەل غاز- elxaz): مەتەڵ، لوغز.
**الف**- ع- ا(ئەلف- elf): هەزار.
**الفت**- ع- مص- ل(ئولفەت- ulfet): هۆگری، دۆستایەتی، ئولفەت، هاودەمی، خوو پێوەگرتن.
**الفختن**- ع- مص- م(ئەلفەختەن- elfexten): كۆم كردن، پاشەكەوت كردن.
**الفیه**- ع- ا- ص(ئەلفییە- elfiye): هەزار، نێوی كتێبێكە لەمەڕ دەستووری زمانی عەرەبی.
**القاء**- ع- ف- مص- م(ئیلغاء- ’ilxa): فڕێدان.
**القاب**- ع- ا(ئەلغاب- elxab): لەقەب، نازناو.
**القاح**- ع- مص(ئیلغاه- ilxah): ئاوسكردن.
**الك**- ا(ئەلەك- elek): هێڵەگ، ئارد بێژ.
**الك دولك**- ا(ئەلەك دولەك- elek dûlek): گەمەی هەلوكێن.
**الكا، اولكا، اولكه**-ا(ئەلكا، ئولكا، ئولكە- ulka): زەمین، مەڵبەند، وڵات، مەیدان.
**الكترامان**- فر-ا(ئیلكتروئیمان- iliktrüiman): موگناتیسی كارەبایی.
**الكتروتراپی**- فر- ا(ئیلكتروتراپی- iliktru tirapî): مالیجەی نەخۆش بە كارەبا.
**الكتروفر**- فر- ا(ئیلكتروفۆر- iliktrufur): ئامێرێكە بۆ كەڵەكەكردنی كارەبا.
**الكترولیت**- فر- ا(ئیلكترولیت- iliktrulit): هەر تەنێك بەهۆی هێزی كارەباوە بەش بەش ببێ، یان جیابكرێتەوە.
**الكترولیز**- فر- ا(ئیلكترولیز- iliktrulîz): جیاكردنەوەی تەنێك بە هۆی تەزووی كارەباوە، وەكو جیاكردنەوەی ئوكسیژین و هایدرۆژین لە ئاو.
**الكترومتر**- فر- ا(ئیلكترومیتر- iliktrumitr): كارەباپێو، ئامێرێكە بۆ دیاریكردنی تەزووی كارەبا.
**الكتروموتور**- فر- ا(ئیلكتروموتۆر- iliktrumutur): ئامێری گۆڕینی تەزووی كارەبا بۆ تەزووی میكانیكی.
**الكترون**- فر(ئیلكترون- iliktrun): ئەلكترۆن.
**الكتریزه**- فر- ص(ئیلكتریزە- iliktrîze): بە شەوق هاتوو، هەر شتێ قوەتی كارەبایی تێدابێ.
**الكتریسیته**- فر- ا(ئیلكتریسیتە- iliktrîsîte): كارەبا، تەزووی كارەبا.
**الكتریسین**- ف- ا(ئیلكتریسین- iliktrîsîn): پسپۆری كارەبا.

**الکتـــریک**- فـــر- ا(ئیلکتـــریک- iliktrîk): کارەبا، کارەبایی.

**الکل**- ا(ئەلکول- elkul): شـــەراب و عەرەق، سپرتۆ.

**الکلاتور**- ا(ئەلکولاتور- elkulatur): ماددەیەکە لە ئەنجامی خوساندنی تەنێک لە نێو سپرتۆ وەدەست دێت.

**الکلیـــــسم**- فـــر-ا(ئەلکولیـــزم- elkulîzm): راهاتن لەسەر خـواردنەوە بەو رادەیەی نەتوانی دەستەبەرداری ببی.

**الکلیک**- فـــر- ص(ئەلکولیـک- elkulîk): کحول دار، مودمن.

**الکومتر، الکلومتر**- فر- ا(ئەلکومیتەر، ئەلکلومیتر- elkulumîtr): ئامێرێکە بۆ دیاریکردنی رادەی ســـــپـــرتۆ لە مەشروباتدا.

**الگو**- ا(ئولگو- ulgu): نموونەو شێوەی شتێک کە لە کاغەز یان مقەوا بڕدرابێ وەکو نموونەی جل کـە خـەیات قـومـاشی لەسەر دەبڕێ.

**الله**- ع- ا(ئەللا- ellah): خـــــوا، یەزدان.

**اللهم**- ع (ئەللاهومە- ellahumme): خودایە، ئەی خوا، یا ئەڵڵا.

**الم**- ع- ا(ئەلەم- elem): ئازار، ژان، دەرد، رەنج.

**الماس**- ل- ا(ئـــەلمـــاس- elmas): بەردێکی گرانبەهایە، ئەڵماس.

**المپیاد**- فر- ا(ئولمپیاد-ulempiyad): بەو چوار ســالەی نێــوان یاریـیــەکـانی ئۆڵۆمپیاد دەگوترێ.

**المپیک**- فـــر- ص-ا(ئولەمـــپـیک- ulempîk): جـــۆرەکـــانی وەرزش و پێشبڕکێیەکانی یۆنانی کۆن کە هەر چوار ساڵ جارێک ئەنجامیان دەدا.

**المثنی** - ع- ا(ئـەلموســــــــەنـنـا- elmusenna): نوسخەی دووەمی هەر نووسینێک.

**النج**- ا(ئەلنەج- elnec): رەگی جـۆرە گیایەکە لە کۆنا بۆ دکتۆری بەکارهاتووە. گوڵەکەی لەگەڵاو گوڵی گێزەر دەچێت.

**النگ**- فـــــر- ا(ئـولەنـگ- uleng): مێرگوزار، لەوەڕگە، پاوەن.

**النگو**- ا(ئەلەنگو- elengu): بازنگ، موچەوانە، دەستەوانەی زێڕو زیو.

**الو**- ا(ئەلەو- elew): شـــولەی ئاگـر، هالاڤ.

**الوار**- ا(ئەلڤـــار- elvar): تەخــتـــەی گەورە، تەختەدار، لەوح.

**الـوان**- ع- ا(ئـەلڤـــــــان-elvan): رەنگەکان.

**الوف**- ع- (ئولوف- ulûf): هەزاران.

**الوهیـــە**- ع- مص- حغ(ئولوهیـــیــە- uluhîye): خوایی، خودایانە. پایەی خوایی.

**اله**- ع- ا(ئیلاه- ilah): خوا، یەزدان.

**الهـام**- ع- مص- ا(ئیلهام- ilham): شـــتـــێک لە پڕ بکەوێتـــە دڵ، ئیلهـــام، سرووش، سەرۆ.

**الهیات**- ع(ئیلاهیات- ilahîyat): ئەو زانستانەی کە باسی خوا دەکەن.

**الیاف**- ا(ئەلیاف- elyaf): ریشاڵ.

**الیه**- ع- ا(ئیلیە- ilye): دوگ، دوگی مەڕ.

**الیـجـه**- ا(ئەلیـجـە- elîce): جـۆرە پارچەیەکی رێ ڕێیە کە بە دەست لە خوری یان ئاوریشم دەچنرێ.

**الیز**- ا(ئەلیز- elîz): جووتە و لەقە، جفتە، هەڵتیزگان.

**الیز زدن**- مص(ئەلیز زەدەن- elîzzeden): جووتە وەشاندن، هەڵتیزگاندن.

**الیف**- ع- ص(ئەلیف- elîf): هۆگر، ماڵی، یار و دۆست، لف، هاودەم.

**الیم**- ع- ص(ئەلیم- elîm): بەسوێ، ئازاردەر، پڕسۆ، پڕئێش.

**ام**- ع- ا(ئوم- um): دایک، بناوانی هەر شتێک.

**ام الخبائث**- ع- ا(ئوموڵخەبائس- ummul xeba'is): مەی، شەراب.

**ام القری**- ا(ئوموڵغورا- ummulxura): شاری (مەککە).

**ام الکتاب**- ا(ئوموڵکیتاب- ummulkitab): سورەتی فاتیحا، یان قورئان.

ام النجوم- ا(ئوموڵنجوم- ummulnucûm): کەشکەڵان، کاکێشان.

**اماته، اماتت**- ع- مص(ئیماتە، ئیماتەت- imatet, imate): کوشتن، مراندن.

**اماثل**- ع- ص(ئەماسیل- emasil): شەریفتر، باشتر.

**اماج**- ا(ئوماج- umac): جۆرە شیوێکە لە ئاردی گەنم دروستدەکرێ.

**امار**- ا(ئەممار- emmar): ئەمرکەر، هاندان بۆ شەڕ.

**اماره**- ع- ا(ئەمارە- emare): نیشانە، عەلامەت.

**اماره، امارت**- ع- مص(ئیمارە، ئیمارەت- imare, imaret): فەرمانڕەوایی، بوونە میر، میرنشین.

**اماره**- ع- ص(ئیمارە- imare): ژمارە، ئامار.

**اماکن**- ع- ا(ئەماکین- emakin): شوێنان.

**امام**- ع- ق(ئەمام- emam): پێش، بەردەم.

**امام**- ع- ص- ا(ئیمام- imam): پێشەوا، پێشڕەو، پێشنوێژ.

**امامت**- ع- مص- ل(ئیمامەت- imamet): پێشنوێژی، پێشەوایی کردن.

**امامیه**- ع- ص(ئیمامییە- imamîye): ئەو شیعانەی کە باوەڕیان بە دوازدە ئیمام هەیە.

**امان**- ع- ا- مص(ئەمان- eman): پەنا، بێترس بوون، ئەمینی، ئاسایش و ئارامی.

**امانت**- ع- ا-مص(ئەمانەت- emanet): ئەمانەت، شتێک کە بە ئامانەت لای کەسێک دابنرێ، دەستپاکی، پێچەوانەی خیانەت.

**امانی**- ع- ا- (ئەمانی- emanî): ئاوات و ئارەزوو.

**امانیک، امونیاک**- ا(ئەمانیاک، ئەمونیاک- emanîk- emunyak): گازێکی بێڕەنگ و بۆنی کەسکونە.

**امپراتریس**- ل- ا(ئیمپراتیس- impiratrîs): شابانۆ، ژنی ئیمپراتۆر.

**امپراتور**- ل- ا(ئیمپراتۆر- imprator): لەقەبی سەردارانی رومی کۆنە، شاهنشا، قەڕاڵ.

**امـپـریال**- فـر- ص- ا(ئیـمـپـریال- impiryal): شاهنشایی، ئیمپراتۆری.

**امپریالیست**- فر- ص(ئیمپریالیست- impiryalîst): لایەنگری ئیمپریالیزم.

**امپریالیسم**- فـر- ا(ئیـمـپریالیـسم- impiryalîsm): ئیـسـتـیـعـمـار، لایەنگری لە حـوکـمـی ئیـمـپـراتۆری، سـیـاسـەتێک کـە مـەرام و مـەبەسـتـی فراوانخوازی و سەپاندنی دەسەڵاتی خۆی بەسەر وڵاتی تر دابێ.

**امـت**- ع- ا(ئـومـەت- ummet): کـۆمـەڵـە خـەڵکێک، جـەمـاعـەتێک، پەیڕەوانی یەک پێغەمبەر، نەتەوە.

**امـتـثـال**- ع- مص- ل(ئیـمـتـیـسال- imtisal): گـوێڕایەڵی، پەیڕەوکـردنی ڕێبـازێک یان کـارێک، گـوێشـداری، ملکەچی.

**امـتـحـان**- ع- مص- م(ئیـمـتـیـحـان- imtihan): تاقیکردنەوە.

**امـتـداد**- ع- مص- ل(ئیـمـتـیـداد- imtidad): درێژە. درێژی.

**امـتـزاج**- ع- مص- ل(ئیـمـتـیـزاج- imtizac): تێکەڵ بوون، ئاوێتە بوون.

**امتصاص**- ع- مص- ل(ئیمتیساس- imtisas): مـژین، مـژینی شـیلەی شتێک، هەڵمژین.

**امـتـعـه**- ع- ا(ئەمـتـیـئـە- emti,e): کاڵاکان.- شتومەک.

**امـتـلاء**- ع- مص- ل(ئیـمـتـیـلاء- imtila'): پڕبوون، پڕی بـەد هەرسی و ئینتەلا.

**امـتناع**- ع- مص- ل(ئیـمـتـینـاء- imtina'): قەبوڵنەکردن، قایلنەبوون.

**امـتنان**- ع- مص- ل(ئیـمـتـینان- imtinan): منەتباربوون، سوپاس.

**امـتـیـاز**- ع- مص- ا(ئیـمـتـیـاز- imtiyaz): جـیـابوونەوە، باڵاتربوون، هەروەها بەمـانای مـۆڵەت دێت، وەک مـۆڵەتی کـردنەوەی کـارخـانەیەک یان دەرکردن و بڵاوکردنەوەی گۆڤارو ڕۆژنامە، نایابی.

**امـثل**- ع- ص(ئەمـسـەل- emsel): شەریفتر، باشتر، زیاتر.

**امجد**- ع- ص- ت(ئەمجەد- emced): گەورەتر، جوامێرتر، شکۆدارتر.

**امـحـاء**- ع- ف- مص- م(ئیـمـهـاء- imha'): سـڕینەوە. مـەحـوکـردنەوە، لەنێوبردن.

**امـد**- ع- ا(ئەمـەد- emed): کـۆتـایی شتێک، ئەجەل، غەزەب و توڕەیی.

**امداد**- ع- مص- م(ئیمداد- imdad): یاریدەدان، کۆمەک کردن، هیمدادی.

**امدوحه**- ع- ا(ئومدوهە- umdûhe): ستایش.

**امر**- ع- ا(ئەمر- emr): فرمان، حوکم، ئەمر، ڕوداو.

**امراء**- ع- ص-ا(ئومەراء- umera'): میران.

**امرار**- ع- مص- م(ئیمرار- imrar): ڕەتکردن، تێـپـەڕاندنی کـەسـێک لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دی. گوزەراندنی کات.

**امـراض**- ع- ا(ئەمـراز- emraz): نەخۆشیان.

**امرؤ**- ع- ا(ئیـمرەء- imre'): مرۆڤ، پیاو.

**امراه**- ع- ا(ئیمرەئە- imre’e): ژن، ئافرەت.

**امرد**- ع- ص(ئەمرەد- emred): لاوێک کە هێشتا مووی لێ نەهاتبێ، دەم رووت، لوسکە، هیز.

**امرود**- ا(ئەمرود- emrüd): هەرمێ.

**امروز**- ق(ئیمروز- imrûz): ئەمڕۆکە.

**امزجه**- ع- ا(ئەمزیجە- emzice): مجێز، سروشت، میزاج.

**امساء**- ع- مص- ل(ئیمسائ- imsa’): ئێوارەکردن.

**امساک**- ع- مص- ل(ئیمساک- imsak): نان نەخواردن، پیسکەیی.

**امسال**- ع- ا(ئیمسال- imsal): ئەمساڵ.

**امسیه**- ع- ا(ئەمسییە- emsîye): ئێواران.

**امشاسپیند، امشاسفند**- پە- ا(ئەمیشاسپەند- ئەمیشاسفەند- emişaspend): فریشتە، لەقەبی حەوت فریشتەی گەورە بووە.

**امشب**- ق(ئیمشەب- imşeb): ئەمشەو.

**امصار**- ع- مص- ا(ئەمسار- emsar): شاران.

**امضاء**- ع- مص- ا(ئیمزا- imza): رەوانکردن، گوزەراندن، نیشانەو ناوێک کە لە پایینی نامە یان قەواڵە دەدرێ، واژوو.

**امعاء**- ع- ف- ا(ئەمئا- em’a): ریخۆڵەکان.

**امعان**- ع- مص- م(ئیمئان- im’an): وردبوونەوەو بیرکردنەوە لە کارێک، دوور ئەندێشی.

**امغیلان**- ا(ئەموغەیلان- emuxeylan): موغەیلان، جۆرە درەختێکە.

**امکان**- ع- مص- م(ئیمکان- imkan): توانا بوون بەسەر کارێکدا، چەسپاندن.

**امکنه**- ع- ا(ئەمکینە- emkine): شوێنان.

**امل**- ع- ا(ئەمەل- emel): هیوا، ئاوات، ئومێد، هیڤی.

**امل**- ع- ص(ئوممول- ummul): کەسێک کە ئاشنایی ئادابی تازەبوونەوەو شارستانیەت و مەدەنییەت نەبێ، زیاتر بە ژنان دەگوترێ.

**املاء**- ع- ف- مص- م(ئیملائ- imla’): پڕکردن، خوێندنەوەی شتێک بۆ کەسێک تابینوسێت، چۆنیەتی نووسینی وشە، دروست نووسین.

**املاح**- ع- ا(ئەملاه- emlah): خوێ، نمەک.

**املاق**- ع- مص- ا(ئیملاغ- imlax): برسێتی و دەستکورتی، هەژاری، قەلەندەری.

**املاک**- ع- ا(ئەملاک- emlak): موڵک.

**املال**- ع- مص- م(ئیملال- imlal): مەلول کردن، ماندووکردن، بێزارکردن.

**املت**- ا(ئوملیت- umlit): هێلکەو رۆن، هێک رۆن.

**املح**- ع- ص(ئەملەح- emleh): بەخوێتر، شۆرتر، سوێرتر.

**املس**- ع- ص(ئەملەس- emles): لووس، نەرم، نیان، ناسک.

**امم**- ع- ا(ئومەم- umem): میللەتان.
**امن**- ع- ا- مص(ئەمن- emin): ئاسایش، دڵنیایی.
**امنع**- ع- ص- ت(ئەمنەء- emne’): قایمتر، بەرقەرارتر، پایەبەرزتر.
**امنه**- ا(ئەمنە- emne): کۆڵە چیلکە و دار.
**امنیت**- ع- مص- جم(ئەمنیەت- emnîyet): ئەمینی.
**امنیه**- ع- ا(ئومنییە- umniye): ئارمانج، هیوا، ئاوات، خۆزیا.
**اموات**- ع- ا(ئەمڤات- emvat): مردووان.
**امواج**- ع- ا(ئەمڤاج- emvac): شەپۆلان، پێڵێن.
**اموال**- ع- ا(ئەمڤال- emval): ماڵ و سامان.
**امور**- ع- ا(ئومور- umür): کاروباران، رووداوان.
**اموی**- ع- ص- ن(ئومەڤی- umevî): بنەماڵەی ئومەیە.
**امهات**- ع- ا(ئومەهات-ummehat): دایکان، داڵگەیل.
**امهال**- ع- مص- م(ئیمهال- imhal): مۆڵەتدان، دەلیڤە پێدان.
**امی**- ص- ن(ئوممی- ummî): نەخوێندەوار، بێسەواد.
**امید**- ا(ئومید- umîd): هیوا، ئومێد، ئاوات، هیڤی.
**امیر**- ا(ئەمیر- emîr): فەرماندە، فەرمانڕەوا، میر.
**امیرال**- ا(ئەمیرال- emîral): دەریا سالار، میراڵا.
**امیرالمومنین**- ع- ا(ئەمیرول موئمینین- emîrul mu’minîn): میری ئیمانداران، لەقەبی حەرزەتی عەلی کوڕی ئەبی تاڵیبە.
**امین**- ع- ص(ئەمین- emîn): جێی باوەڕ، دروستکار، ئەمین، مایەی متمانە، دەسپاک.
**اناء**- ع- ا(ئینا ء- ina’): دەفرو ئامان.
**انابه، انابت**- ع- مص- ل(ئینابە، ئینابەت- inabe, inabet): گەڕانەوە بەرەو خوا، تۆبەکردن، تۆبەو پەشیمانی، گەڕانەوە لە گوناح و خەتایان.
**انابیب**- ع- ا(ئەنابیب- enabîb): بۆڕی، لوولە.
**اناث**- ع- ا(ئیناس- inas): ژنان، مێیان.
**اناجیل**- ع- ا(ئەناجیل- enacîl): ئینجیلەکان، مزگێنی.
**انار**- ا(ئەنار- enar): هەنار.
**اناره**- ع- مص- م(ئینارە- inare): روناکردنەوە، شکۆفەکردنی درەخت، پرشنگدار.
**انارگیرا**- ا(ئەنارگیرا- enargîra): خەشخاش.
**اناشید**- ع- ا(ئەناشید- enaşîd): سروودان.
**اناطه**- ع- مص- م(ئیناتە- inate): راسپاردن، پێ سپاردن.
**انام، انام**- ع- ا(ئەنام، ئانام- anam enam): خەڵکی، مەردم.
**انامل**- ع- ا(ئەنامیل- enamil): سەری قامکان، نووکی پەنجەکان.

**انانیت**- ع - مص- جع(ئەنانیـــیـــەت- enanîyet): خۆپەرستی ، لوت بەرزی و غرور، خۆپەسندنی.

**اناهید**- ا(ئەناهید- enahîd): ناهید، ئەستێرەی زوهره.

**انباء**- ع- ا(ئەنباء- enba'): هەواڵان، سالوخێن، نووچە.

**انبـاء**- ع- مص- م(ئینبـاء- inba'): خەبەردان، ئاگادارکردن، سالوخدان.

**انبار**- پە- ا(ئەنبار- enbar): عەمار، پوش و پەڵاش و ســەرگــینی لەســەریەک کەڵەکە بوو.

**انبــــاردن**- مص- (ئـەنبـــــاردەن- enbarden): عەمارکردن.

**انبـاره**- فــر- ا(ئەنبــارە- enbare): ئاکــومــولاتور، مــەخــزەنی هێــزی کــارەبا، دەزگــایەکــە کــە هێــزی کــارەبای تیــا خــڕ دەکرێتەوە بۆ کاتی پێویست.

**انبـاز**- پە- ص- (ئەنبـاز- enbaz): هاوکار، هاوتا، شەریک، هاوئامێز.

**انبـازی**- ا- مص(ئەنبـازی- enbazî): هـاوکــاری، شـــەریکی، هاوئامـــێـــزی، ئامبازبوون.

**انبــاشتن**- مص- م(ئەنبــاشـــتـــەن- enbaşten): عەمارکردن. پڕکردن.

**انباشته**- امف(ئەنباشتە- enbaşte): پڕکراو، کەڵەکە کراو.

**انبــاغ**- ص- ا(ئەنبــاغ- enbax): شەریک، هەوێ.

**انبــان**- پە- ا(ئەنبــان- enban): هەنبانە، هەمبانە.

**انبـانچـه، انبـانک**- پە- ا(ئەنبـانچـە- ئەنبـانـەک- enbançe, enbanek): هەنبانەی بچووک.

**انبر**- ا(ئەنبور- enbur): مقاش، گاز.

**انبــره**- ا(ئەنبــورە- enbure): ئەسپ و حوشتری ئاوکێش، حوشتری کۆلک رژاو، حەیوانێک کەمووی وەری بێ.

**انبـــســـاط**- ع- مص-(ئینبـیـــســـات- inbisat): رووخۆشی، شادی.

**انبـعــاث**- ع- مص- ل(ئینبـیـئــاس- inbi'as): بووژانەوە، ناردن، ڤەژین.

**انبله**- مــــر- ا(ئەنبـــەلە- enbele): خورما، تەمر هندی.

**انبـــوئیـــدن**- مص- (ئەنبـــوئیـــدەن- enbu'îden): بۆنکردن.

**انبـوب**- ا(ئەنبـوب- enbûb): فـەرش، رایەخ.

**انبـــوب**- ع- ا(ئونبـــوب- unbûb): بۆڕی، لوولە، هەر شــتــێکی نێــو بەتاڵی وەک قامیش.

**انبـوبه**- ع- ا(ئونبــووبە- unbûbe): بۆڕی، لوولە.

**انبـــــودن**- مص- م(ئـەنبـــــوودەن- enbûden): کـەڵـەکـەکـردن، هەڵچنین لەسەریەک.

**انبوه**- ص- ا(ئەنبـوهـ- enbûh): چڕ، پڕ، زۆر، قەرەباڵغ، هەیشەت.

**انبوهی**- ا- مص(ئەنبوهی- enbuhî): چڕی، پڕی، قەرەباڵغی.

**انبـیـاء**- ع- ا(ئەنبـیـاء- enbîya'): پێغەمبەران.

**انبـیس**- ا(ئەنبـیس- enbîs): جـێـز، خەرمانی سورکراو، خەرمانی شەنکراو.

**انبـــیق**- یو- ا(ئەنبـــیغ- enbîx): ئامێرێکە بۆ پاڵاوتنی شلەمەنی و عەرەق و

مەشروبات.
**انتاج**- ع- مص- ل(ئینتاج- intac): بەرهەمهێنان، گەیشتنی کاتی زایینی وشترو چێلان.
**انتباه**- ع- مص- ل(ئینتیباه- intibah): بێداربوونەوە.
**انتحار**- ع- مص- ل(ئینتیهار- intihar): خۆکوژی.
**انتخاب**- ع- مص- ل(ئینتیخاب- intixab): هەڵبژاردن.
**انتر**- ا(ئەنتەر- enter): مەیموونی بچووکی کلکداری قون سوور، عەنتەر.
**انتراکت**- فر- ا(ئەنتراکت- entrakt): وچانی نێوان دوو پەردەی شانۆنامە، ماوەی وچانی نێوان دوو پارچە مۆسیقا بەمەبەستی ئیسراحەت و پشوودان، وچان.
**انترسان**- فر- ص)(ئینتەرسان- intersan): بەسوود. سەرگەرمکەر، سەرقاڵکەر، مایەی سەرنج، سەرنج ڕاکێشان.
**انترناسیونال**- فر- ا(ئینتەرناسیونال- internasyunal): نێونەتەوەیی، جیهانی.
**انترناسیونالیسم**- فر- ا(ئینتەرناسیونالیزم- internasyunalîsm): لایەنگری ڕێبازی یەکێتیی کرێکارانی جیهان.
**انتریگ**- فر- ا(ئینتریگ- intrîg): فیتنە، دووزمانی، دەسیسە، شۆڤاری.
**انتزاع**- ع- مص- م(ئینتیزاع- intiza’): دەرهێنان، لە شوێنێک، هەڵکێشان، هەڵکەندن، ڕووتەڵکردن.
**انتزاعی**: ڕووتەڵگەرایی، تەجریدی.
**انتساب**- ع- مص- ل(ئینتیساب- intisab): خزمایەتی، کەسایەتی، هاوپەیوەندی.
**انتساخ**- ع- مص- (ئینتیساخ- intisax): نەسخبوون.
**انتشار**- ع- مص- ل(ئینتیشار- intişar): بڵاوبوونەوەی شتێک، بڵاوبوونەوەی هەواڵ.
**انتصاب**- ع- مص- م(ئینتیساب- intisab): هەستان، ڕەپبوون.
**انتصاح**- ع- مص- م(ئینتیساه- intisah): نەسیحەت وەرگرتن، قەبوڵکردنی ئامۆژگاری.
**انتصار**- ع- مص- م(ئینتیسار- intisar): سەرکەوتن.
**انتصاف**- ع- مص- ل(ئینتیساف- intisaf): هەق وەرگرتن، وەرگرتنی نیوەی شتێک، گەیشتن بە نیوە.
**انتظار**- ع- مص- م(ئینتیزار- intizar): چاوەڕوانی.
**انتظام**- ع- مص- م(ئینتیزام- intizam): ڕێکخستن، ڕازاندنەوەو ڕێک و پێک کردن.
**انتعاش**- ع- مص- ل(ئینتیئاش- inti’aş): بووژانەوە، ڤەژین، ژیانەوە.
**انتفاء**- ع- مص- ل(ئینتیفاء- intifa’): نەمان، دوور بوون.
**انتفاخ**- ع- مص- ل(ئینتیفاخ- intifax): باکردن، ئاوسان، هەڵایسان.
**انتفاع**- ع- مص(ئینتیفاء- intifa’): سوود وەرگرتن.
**انتقاد**- ع- مص- م(ئینتیغاد- intixad): ڕێزگرتن، وەرگرتنی پارەی

نەقد، جیاکردنەوەی پارەی قەڵب و چاک لە یەکدی، دەرخستنی خەوشی شیعر، هەڵسەنگاندنی گوتار یان کتێبێک بەمەبەستی دەرخستنی لایەنی چاک و خراپی، رەخنەگرتن.

**انتقال**- ع- مص- ل(ئینتیغال- intixal): گواستنەوە، دانانی شتێک لە ماڵی خۆت لای کەسێکی دی، تێ گەیشتن و دەرک کردنی بابەت و مەبەستێک.

**انتقام**- ع- ا- مص- ل(ئینتیغام- intixam): تۆڵە، کینە کێشی.

**انتکاس**- ع- مص- ل(ئینتیکاس- intikas): بەسەراکەوتن، نسکۆ، سەرنگون بوون، ساتمە.

**انتهاء**- ع- ا- مص- ل(ئینتیهاء- intiha’): کۆتایی، تەواوبوون، کۆتایی هاتن.

**انتهاز**- ع- مص- م(ئینیهاز- intihaz): دەرفەت قۆزتنەوە، هەلپەرستی، دەلیڤەپەرست.

**انتیم**- فر- ص- (ئینتیم- intîm): پەنهانی، باتینی، میهرەبانی، دڵسۆزی، هوندوری.

**انثی**- ع- ا(ئونسا- unsa): مێ، ژن.

**انجاء**- ع- مص- م(ئینجاء- inca’): نەجاتدان، رزگارکردن، ئاشکراکردن.

**انجاح**- ع- مص- م(ئینجاه- incah): سەرکەوتن، جێبەجێ کردنی پێویستی.

**انجاز**- ع- مص- م(ئینجاز- incaz): ئەنجامدان.

**انجاس**- ع- مص- م(ئینجاس- incas): پیسکردن، لەوتاندن، گلاوکردن.

**انجال**- ع- ا(ئەنجال- encal): نەوەو نەژاد.

**انجام**- ا(ئەنجام- encam): کۆتایی، ئاقیبەت، ئاکام.

**انجامیدن**- مص- ا(ئەنجامیدەن- encamîden): ئەنجامدان، کۆتایی هێنان، بە کارێک.

**انجبار**- ا(ئەنجەبار- encebar): جۆرە گیایەکە لە کاری پزیشکی دا وەکو دەرمان بەکار دەبرێ، بۆ مالیجەی مایەسیری و ئیسهال و قورگ یەشەو ئاوسانی پوک.

**انجخ**- ا(ئەنجوخ- encux): چرچ و لۆچی پێست لە ئەنجامی پیریدا.

**انجخت**- ا(ئەن جەخت- encext): تکا، تەماح، ئارەزوو، تاسە.

**انجذاب**- ع- مص- ل(ئینجیزاب- incizab): چوون بەرەو کەسێک یان شتێک.

**انجرار**- ع- مص- ل(ئینجرار- incirar): راکێشان.

**انجره**- ا(ئەنجەرە- encere): جۆرە گیایەکە.

**انجلاء**- ع- مص- ل(ئینجیلاء- incila’): رون بوونەوە، دەرکەوتن، ئاشکرابوون.

**انجم**- ع- ا(ئەنجوم- encum): ئەستێران، هەسارەکان.

**انجماد**- ع- مص- ل(ئینجیماد- incimad): بەستان، بەستەڵەک، جەمەدین.

**انجمن**- ا(ئەنجومەن- encumen): کۆڕ، ئەنجوومەن، مەجلیس، جڤات.

**انجـــمن ارا**- افـــا (ئەنجـــومـــەن ئارا- encumen ara): گـــوڵی مـــەجلیس، کەسێک کەمایەی زینەتی مەجلیسە.
**انجـوخیـدن**- مص- ل(ئەن جـوخیـدەن- encuxîden): چـرچ و لـــۆچ بـــوونـــی پێـــستی دەمـــووچو یان بەدەن لە ئەنجـامی پیرییەوە.
**انجـــیـــدن**- مص- م(ئەن جـــیـــدەن- encîden): ئەنجنین، جنین، هەنجنین.
**انجـیـر**- ا(ئەنجـیـر- encîr): هەنجـیـر، هەژیر.
**انجیر**- ا(ئەنجیر- encîr): کون، کونی کۆم.
**انجیره**- ا(ئەنجیرە- encîre): هەنجیر، هەژیر، کون، کونی قون.
**انجـــیل**- (ئینجـــیـل- incîl): مـــژدە، مزگێنی، نێوی چەند کتێب و نامەیەکە کە دەربارەی شەرحی ژیانی حەزرەتی عیساو ئامـــۆژگـــارییـــەکـــانی، ئەو نووسـراون کـــە گـرینگترینیـان چوار ئینجـیلی یاسـاییـە (مەتی، مەرقوس، لوقا، یوحەنا).
**انجین**- ا- فا(ئەنجین- encîn): جنەر.
**انچوچک**- ا(ئەنچوچەک- ençuçek): ناوکی هەرمێ کێـویلە، تۆوی گـوڵەبەڕۆژە، بە بنیادەمی کۆڵە بالاو وردیلەش دەگوترێ، کولەبن، گزگل.
**انحـــاء**- ع- ا(ئەنهـــاء- enha): ڕێ و ڕێبازان، لاوکەناران، دەڤەران.
**انحـدار**- ع- ا- مص- ل(ئینهـیـدار- inhidar): نشـــێـــوی، لێـــژی، نشێوبوونەوە.
**انحـــراف**- ع- مص- ل(ئینهـــیـــراف- inhiraf): لادان، خوار بوون، کەچڕەوی.
**انحـــصـــار**- ع- مص- ل(ئینهـــیـــســـار- inhisar): کـــــــەوتـنـە تـەنـگـانـە، سنووردرابوون، تایبەت بوونی کـارێک یان شتێک بە کەسێکەوە.
**انحطاط**- ع- مص- ل(ئینهـیـتـات- inhitat): دابەزین، نزم بوون.
**انحلال**- ع- مص(ئینهیلال- inhilal): حەل بوون، کرانەوە، ڤەبوونی گرێ، توانەوە، (توانەوەی شەکر لە ئاودا)، بوهژین.
**انحـنـاء**- ع- مـص- (ئـیـنـهـــیـنـاء- inhîna’): چەمـــینەوە، خـــوار بوون، نوشتانەوە.
**انخـسـاف**- ع- مص ل(ئینخـیـسـاف- inxisaf): ئاوابوون، گیـران، کـوێربوون، مانگگیران.
**انخـفـاض**- ع- مص- ل(ئینخـیـفـاز- inxifaz): کەوتنە نشێوی. نزم بوونەوە.
**اند**- پهـ- عـــدد(ئەند- end): هەند. ژمـارەیەکی نادیارە، لە ٣- ٩ دەگرێتەوە. کـــەم، چەند، قـــســـەی ئالۆز، ئومـــێـــدو هیواداری.
**اندائـیـــدن، اندایـیـــدن**- مص- ل(ئەندائـیـــدەن، ئـەندایـیـــدن- enda’iden, endayiden): ســـواغ دانـی ســــــەربـان یـان دیـوار، لـەوتـانـدن، سەرسواغ.
**انــدایــش**- ا- مــص(ئــەنــدایــش- endayiş): گـڵکاری، کـەف مـاڵی گڵ، سواغی قوڕ.
**اندایشگر**- ص- شـــغل(ئەندایشگەر- endayişger): سپیکار، کەفماڵ کار.
**انداچه**- ا(ئەنداچە- endaçe): فـیکر، ئەندێشە، هزر.

**انداختن**- پهـ- مص- م(ئەنداختن- endaxten): توڕدان، پەرت کردن، راخستن، فڕێدان.
**اندازنده**- اف (ئەندازەندە- endazende): توڕدەر، کەسێک کە شتێک لە شوێنێکەوە فڕێ بدات، بهاوێ، توڕبدات، فڕێدەر. هاوێژەر.
**انداد**- ع- ا(ئەنداد- endad): کوێ ند/ ندە: هاوتا، هاوتایان، هەڤڕک.
**اندار**- ا(ئەندار- endar): سەرگوزشتە، ئەفسانە، چیرۆک، داستان.
**اندازه**- پهـ- ا(ئەندازە- endaze): پێوەر، پەیمانە، ئەندازە.
**اندام**- پهـ- ا(ئەندام- endam): بەدەن، تەن، قەدوقامەت.
**اندام دادن**- مص- م(ئەندام دادەن- endam daden): رازاندنەوەو رێکخستن.
**انداوه، اندایه**- ا(ئەنداڤە، ئەندایە- endave, endaye): مالە، مالەی بەنایی، غەیبەت، شکایەت.
**اندخس**- ص- (ئەندەخس- endexs): پشتیوان، پشت و پەنا.
**اندخسواره**- ا(ئەندەخسڤارە- endexsvare): قەلا، حەسار، پەناگا.
**اندر**- پهـ- حرف(ئەندەر- ender): کە، ناو، نێوان، ناخ، هوندور، کودیلە.
**اندراج**- ع- مص- ل(ئیندیراج- indirac): داخڵ بوون، هوندوربوون.
**اندراس**- ع- مص- ل(ئیندیراس- indiras): لەنێو چوون، کۆن بوون.
**اندرباری**- ص(ئەندەرباری- enderbarî): پێویست، زەروری، گەرەکبوو.
**اندربایست**- ا-مف- ص(ئەندەربایست- enderbayist): پێویست، زەرووری، گەرەکبوو.
**اندرخور**- ص(ئەندەرخور- enderxür): لایەق، شایستە، شایانی، هەژ.
**اندرز**- ا(ئەندەرز- enderz): پەند، ئامۆژگاری، نەسیحەت.
**اندروا**- پهـ- ص(ئەندەرڤا- enderva): سەروخوار، هەڵواسراو، سەرگەردان، سەرسام، حەیران، مۆڵەق، ئاوەژوو، دەمەو قەڵپ.
**اندروب**- ا(ئەندەروب- enderub): گەڕی ، گولی.
**اندرون**- ا- ق(ئەندەرون- enderun): ناو، دەرون، حەرەم سەرا، هوندور، ناخ.
**اندرونه**- ا(ئەندەرونە- enderune): ناوەوە، دەرونی، هەناو، جل و بەرگی ژێرەوە.
**اندفاع**- مص- ل(ئیندیفا- indifa’): کەنار کەوتن، دەرکردن، پێشڤەچوون.
**اندک**- ق- ص(ئەندەک- endek): کەم، کورت، ماوەیەکی کورت، کێم.
**اندک اندک**- ق- مر(ئەندەک ئەندەک- endek endek): کەم کەم.
**اندکس**- فر- ا(ئەندیکس- endiks): پێڕست، ئەندیکاتور.
**اندماج**- ع- مص- ل(ئیندیماج- indimac): چونە ناویەک،تێکەڵ بوون.
**اندمال**- ع- مص- ل(ئیندیمال- indimal): سارێژبوونەوەی برینان.
**اندمه**- (ئەندەمە- endeme): گێڕانەوەی بەسەرهاتی ناخۆش و خەماوی.

**اندوب، اندوج**- (ئەندوب، ئەندوج- endûb, endûc): گەڕی و گولی.
**اندوختن**- پە- مص- م(ئەندوختەن- enduxten): پاشەکەوت کردن.
**اندوختە**- ا- مف(ئەندوختە- enduxte): پاشەکەوتکراو.
**اندود**- ا(ئەندود- endud): سواغ، وەکو سەر سواغ.
**اندودن**- مص- م (ئەندودەن- enduden): سواغ دان.
**اندوزیدن**- مص- م(ئەندوزیدەن- enduzîden): پاشەکەوت کردن.
**اندوە**- پە- ا(ئەندوە- enduh): خەم، خەفەت، دڵتەنگی، کۆڤان، کەسەر.
**اندوهناک**- ص(ئەندوهناک- enduhnak): خەمناک، خەمین.
**اندە**- ا(ئەندە- endeh): سوکەڵەی اندوە/ ئەندوهـ-ـە: خەم، خەفەت، دڵتەنگی.
**اندەگسار**- ص- ف(ئەندوهگوسار- enduhgusar): خەمخۆر، دڵسۆز، کەسێک کە خەمی کەسێکی دی بخوات و دڵسۆزی بەرانبەر بکات، خەمڕەوین.
**اندی**- ا(ئەندی- endî): سەیر، عەجایەب، ئومێد، هیوا.
**اندیدن**- مص(ئەندیدەن- endîden): تەعەجوبکردن، حەسودی بردن، ئیرەیی بردن.
**اندیشە**- ا(ئەندیشە- endîşe): فیکر، گومان، ترس، خۆف، خەیاڵ.
**اندیشیدن**- مص- ل(ئەندیشیدەن- endîşîden): بیرکردنەوە، خەیاڵکردن.
**اندیکاتور**- فر- ا(ئەندیکاتور- endîkatur): ئەو دەفتەرەی کە پوختەی نووسراوی هاتوو نێردراوی تێدا تۆمار دەکرێ.
**انذار**- ع- مص- م(ئینزار- inzar): ترساندن، ئاگادارکردنەوە، ئینزار.
**انر**- ص(ئەنەر- ener): بەدو ناشیرین، دزێو، سامناک، کرێت.
**انرژی**- فر- ا(ئینیرژی- inirjî): نیرو، هێز، توانا، وزە، تاسا.
**انروب**- ا(ئەنروب- enrub): گەڕی و گولی.
**انزال**- ع- مص- ا(ئینزال- inzal): هێنانە خوارەوە، دابەزاندن، داگرتن.
**انزجار**- ع- مص- ا(ئینزیجار- inzicar): بێزاربوون، ڕەوینەوە، دوورکەوتنەوە.
**انزروت**- ا(ئەنزەروت- enzerut): عەنزەروت.
**انزعاج**- ع- مص- ل(ئینزیئاج- inzi’ac): بێئارامی بوون، لە شوێن هەڵکەندران.
**انزواء**- ع- ا- مص-(ئینزیڤاء- inziva’): گۆشەگیری، گۆشەنیشی، کونجگیری.
**انژکسیون**- فر- ا(ئەنیژکسیون- enjiksîyun): دەرزی لێدان، شرینقە لێدان.
**انژە**- ا(ئەنژە- enje): نیسک.
**انس**- ع- ا- مص(ئونس- uns): هاودەمی، هۆگری، ئولفەتگرتن.
**انس**- ع- ا(ئینس- ins): ئینسان، خەڵکی، بەشەر، مەردم.
**انس**- ع- ص(ئەنەس- enes): خەڵکی یەک شوێن.

**انســـان**- ع- ا(ئینســـان- insan): مرۆڤ.

**انسانیت**- ع- مص- جع(ئینسانیەت- insanîyet): تەربیـــەت و ئەدەب و ئاکاری چاک، مرۆڤایەتی.

**انسب**- ع- ص- تفض(ئەنســـەب- enseb): گونجاوتر، لە بارتر.

**انسبـاک**- ع- مص- ل(ئینسیبـاک- insibak): لە قالّبدان، قالّبە زێڕو زیو، سەبیکە.

**انستیتو**- فر- ا(ئینستیتو- instîtü): ئەنجومەن. بنکەی ئەدەبی یان زانستی، پەیمانگە.

**انسجـام**- ع- مص- ل(ئینسیحـام- insicam): گونجان، پێکەوە هەڵکردن، شێلگیری، تەبایی.

**انســداد**- ع- مص- ل(ئینســیداد- insidad): گـــیـــران، ڕەوان بوون، قسەڕەوانی، لەبەر ڕۆیشتن.

**انسلاخ**- ع- مص- ل(ئینسیلاخ- insilax): پێست فڕێدان، کەوڵکردن، رووت بوونەوە، پێست داملّکان.

**انسلاک**- ع- مص- ل(ئینسیلاک- insilak): تێکەڵ بوون، بە دەستەیەک یان کۆمەڵێک خەڵکی.

**انســـولین**- انگل- ا(ئینســـولین- insulîn): مـادەیەکـە لە بەدەندا پەیدا دەبێ و شەکری خوێن ڕێک دەخات.

**انشـاء**- ع- مص- م(ئینشـا- inşa): داهێنان، دەستپێکردن.

**انشــاءالله**- ع- ئینشـــائەڵلا- inşa’ellah): گـەر خـوا بیـەوێ، ئینشەڵلا.

**انشــراح**- ع- مص- ل(ئینشــیراه- inşirah): کرانەوە.

**انشـعـاب**- ع- مص- ل(ئینشیئاب- inşiab): جیابوونەوە. (پەڕاگەندەیی).

**انشـقـاق**- ع- مص- ل(ئینشیغاغ- inşixax): درزبردن، پارچە پارچە بوون، جیابوونەوە.

**انشـوده**- ع- ا(ئونشـوده- unşude): سروود، نەشید.

**انصـاب**- ع- ا(ئەنسـاب- ensab): بت، پەیکەر، کۆتەڵ، سەنەم.

**انصــار**- ع- ا(ئەنســار- ensar): لایەنگر، دۆست، یاریدەدەر، ئەو تاقـمـە خـەڵکەی مـەدینە کـە یاریدەی حـەزرەتی ڕەسولّیان دا.

**انصاف**- ع- مص- (ئینساف-insaf): عەدالەت، ڕاستیکردن، میانەڕەوی.

**انصــراف**- ع- مص(ئینسـیـراف- insiraf): گـــەڕانـەوە. وازهێـنـان، بەجێهێشتن.

**انصـــرام**- ع- مص(ئینســـیـــرام- insiram): بڕین، تەواوبوون.

**انضـــبـــاط**- ع- مص(ئینزیبـــات- inzibat): زەبت و ڕەبت، دیسپلین.

**انضـــمـــام**- ع- مص- ل(ئینزیمام- inzimam): پەیوەندی کردنی دوو شت یان زیاتر بەیەکەوە.

**انطبـاع**- ع- مص- ل(ئینتـیـبـاء- intiba’): چاپ بوون، نەقـشـبـوونی شتێک لەسەر شتێکی دی، باری سەرنج.

**انطبـاق**- ع- مص- ل(ئینتـیـبـاغ- intibax): بەرانبـەر بوون، یەکـســان بوون.

**انطفـاء**- ع- مص- ل(ئینتیفاء- intifa’): کوژانەوە، خامۆشبوونەوە.
**انطلاق**- ع- مص- ل(ئینتیلاغ- inti-lax): بەربوون، دەرچوون.
**انطماس**- ع- مص- ل(ئینتیماس- intimas): مەحو بوو، نەمان، دیارنەمان.
**انظار**- ع- ا(ئەنزار- enzar): نیگاکان.
**انعام**- ع- ا(ئەنعام- en’am): چارەوایان.
**انعام**- ع- ا- مص م(ئینئام- in’am): بەخشش. چاکەکردن، نیعمەت دان.
**انعدام**- ع- مص- ل(ئینئیدام- in’dam): نەمان.
**انعزال**- ع- مص(ئینئیزال- in’izal): گۆشەگیربوون، گۆشەگیری.
**انعطاف**- ع- مص(ئینعیتاف- in’itaf): چەمینەوە، گەڕانەوە، وەرچەرخان.
**انعقاد**- ع- مص(ئینئیغاد- in’ixad): بەستن، بەستنی شلەمەنی، بەستنی پەیمان.
انعکاس- ع- مص- ل(ئینئیکاس- in’ikas): ڕەنگدانەوە، دەنگدانەوە.
**انف**- ع- ا(ئەنف- enf): دفن، کەپو، لووت.
**انفاد**- ع - مص- م(ئینفاد- infad): تەواوکردن، کۆتایی هاتن، نەهێشتن.
**انفاذ**- ع- مص- م(ئینفاز- infaz): ناردن، جێبەجێکردنی حوکم و فەرمان، ڕاپەڕاندن.
**انفاق**- ع- مص- م(ئینفاغ- infax): نەفەقەدان، خەرج کردن.

**انفال**- ع- ا(ئەنفال- enfal): غەنیمەت، ناوی سورەتێکی قورئانە، دەستکەوت، سود، خەڵات.
**انفت**- ع- مص- ل(ئەنەفەت-enefet): زیان، خەسارەت، شەرم، نەنگ.
**انفجار**- ع- مص(ئینفیجار-inficar): فەجری بەیانی، درز بردن، تەقینەوە.
**انفحه**- ع- ا(ئینفەهە- infehe): هەوێنی پەنیر.
**انفراد**- ع- ا- مص(ئینفراد-infirad): تەنیایی، بە تەنیا کارێک بکەی.
**انفس**- ع- ص(ئەنفەس- enfes): بەنرخ تر، گرانتر، نایابتر.
**انفساخ**- ع- ص(ئینفیساخ-infisax): جیابوونەوە. تەڵاقدان، هەڵوەشانەوەی عەقدی کڕین و فرۆشتن.
**انفست**- ا(ئەنفەست- enfest): تەونی جاڵجاڵۆکە، تەڤنی داپیرۆشک.
**انفصال**- ع- مص- ل(ئینفیسال- infisal): جیابوونەوە، جودایی، لێکترازان.
**انفع**- ع- ص(ئەنفە- enfe’): بەسوودتر.
**انفعال**- ع- ا- مص- ل(ئینفیئال- infi’al): شەرمەزاری، هەڵچوون.
**انفکاک**- ع- مص- ل(ئینفیکاک- infikak): لێکجیابوونەوە، رزگاربوون.
**انفلونزا**- فر- ا(ئەنفلونزا-enflunza): هەڵامەت، پەسیو، ئەنفلۆنزا.
**انفیه**- ع- ص- ن(ئەنفییە- enfîye): برنوتی.
**انفیرمری**- ا(ئینفیرمەری- infîrmerî): پەرستارخانە.

**انفیرمر**- ا(ئینفیرمەر- infîrmer): پەرستار.

**انقاذ**- ع- مص-م(ئینغاز- inxaz): رزگارکردن، رەهاکردن، دەربازکردن.

**انقاس**- ع- ا(ئەنغاس- enxas): مەرەکەب.

**انقباض**- ع- ا(ئینغیباز- inxibaz): قەبز بوون، دڵگیران.

**انقد**- ع- ص(ئەنغەد- enxed): ناقیدتر، رەخنەگرتر.

**انقراض**- ع- مص- ل(ئینغیراز- inxiraz): لە نێوچوون.

**انقسام**- ع- مص- ل(ئینغیسام- inxisam): دابەشبوون، پارچە پارچە بوون.

**انقص**- ع- مص- ل(ئەنغەس- enxes): کەمتر.

**انقضاء**- ع- مص- ل(ئینغیزاء- inxiza’): تەواو بوون.

**انقطاع**- ع- مص- ل(ئینغیتاء- inxita’): دابڕان، پسان.

**انقلاب**- ع- ا- مص- ل(ئینغیلاب- inxilab): کودەتا، گۆڕانکاری، ئاژاوە، شۆڕش.

**انقلاع**- ع- مص- ل(ئینغیلاء- inxila’): لەرەگەوە هەڵکەنران.

**انقیاد**- ع- مص- م(ئینغیاد- inxiyad): رام بوون، گوێڕایەڵی، گۆشداری، کەوییبوون.

**انک**- (ئینک- ink): مەرەکەب.

**انکار**- ع- مص- م(ئینکار- inkar): نکۆڵی کردن. حاشاکردن.

**انکسار**- ع- مص- ل(ئینکیسار- inkisar): شکان، نوشوستی.

**انکساف**- ع- مص- ل(ئینکیساف- inkisaf): خۆرگیران.

**انکشاف**- ع- مص- ل(ئینکیشاف- inkişaf): ئاشکرابوون.

**انگ**- ا(ئەنگ- eng): مارکە.

**انگار**- پە- مص(ئەنگار- engar): خەیاڵ کردن، چمان، وەک بڵێی.

**انگارده**- ا- مف(ئەنگاردە- engarde): ئەفسانە، داستان، سەربوردە، چیرۆک، چیڤانۆک.

**انگاره**- ا(ئەنگارە- engare): خەیاڵ، تەسەور، ئەفسانە، سەربور، پێوەر.

**انگاز**- ا(ئەنگاز- engaz): ئالەت، ئامێر، ئەوزار.

**انگاشتن**- پە- مص- م(ئەنگاشتەن- engaşten): خەیاڵکردن، گومان کردن، تەسەورکردن، چیرۆک و ئەفسانە.

**انگام**- ا(ئەنگام- engam): کات، زەمەن، گاڤ.

**انگامه**- ا(ئەنگامە- engame): هەراوهەنگامە، شەڕ، ئاپۆڕەی خەڵک، کات و زەمان.

**انگبین**- ا(ئەنگوبین- engubîn): هەنگوین.

**انگبینه**- ص- ن(ئەنگوبینە- engubîne): حەلوایەک کە بە هەنگوین دروست بکرێ.

**انگدان**- ا(ئەنگودان- engudan): جۆرە گیایەکە.

**انگرده**- ا(ئەنگوردە- engurde): بۆڵی ترێ، بۆڵ، دەنکە ترێ.

**انگروا**- ا(ئەنگیــرڤــا- engirva): ئاغــەڵ، جــێی داکــردنی پەز لە دەمی سەرمادا.

**انگره مــینو**- ا(ئەنگره مــینو- engremînu): ئەهریمەن، ڕێنوێنی خراپە.

**انگریز**- ا(ئەنگریز- engrîz): گیایەکی دڕکاوی گوڵ زەردە، زەردە سیری.

**انـگـز، انـگـژ**- ا(ئـەنـگـەز، ئـەنـگـەژ- engez, engej): خاکەناز، بێڵ.

**انـگـژد**- ا(ئـەنـگـوژەد- engujed): سەمغ، کەتیرە.

**انـگـژک**- ا(ئـەنـگـەژەک- engejek): بێڵچە.

**انگژوا**- ا(ئەنگیــژڤــا- engijva): ئاغەڵ.

**انگسـبـه، انگشـبـه**- ا(ئەنگەسـبـە، ئەنگەشـبـە- engesbe, engeşbe): وەرزێرو جووتیارێک کە سەرمایەو ئەسباب و تفـاقـی خـۆی هەبێ، سـەوداگـەر، پیـاوی خاوەن سەروەت.

**انـگشـت**- ا(ئـەنـگـوشـت- enguşt): پەنجە، قامک، تل، کلک، ئەنگوس.

**انگشت**- ا(ئەنگیـــــشت- engişt): زوخاڵ، خەڵوز، ڕەژوو.

**انگشــتـــال**- ص(ئەنگیـــشــتـــال- engiştal): نەخـۆش.. بیــمــار، لەڕو لاوازو دەغەزار.

**انگشـتانە، انگشـتوانە**- ا(ئەنگوشـتانە، ئەنگوشــتــڤــانە- enguştane): ئیـسـکیـف- ئەنگوســتـیلەی دوورمــان، کوشتوبان.

**انگشـــتـــانە**- ا(ئەنگوشـــتـــانە- enguştane): جۆرە گوڵێکە، پەنجەخانم.

**انگشـتـر، انگشـتـری**- ا(ئەنگوشـتـەر، ئـەنـگـوشــــــتــــــەری- enguşter, enguşterî): موستیلە، کلکەوانە.

**انگشـــتـــرپا**- ا(ئەنگوشـــتـــەرپا- enguşterpa): بە شتێک دەگوترێ کە پارەی پێ بدرێ و بەکار نەیەت.

**انگشت شــهـــادت**- ا(ئەنگوشـــتـی شـــەهادەت- enguşti şehadet): قامکی شادە، دۆشاو مژە.

**انگشـــتگر**- ص(ئەنگیـــشـــتگەر- engiştger): ڕەژووکەر، خەڵوزفرۆش.

**انگشت نگاری**- ا- مص(ئەنگوشت نیگاری- enguşt nigarî): پەنجەمۆر، وەرگرتنی چاپی پەنجەکان.

**انـگـشـت نما**- ص(ئـەنـگـوشـت نما- enguştnima): نێـودار، مـەنشـور، ناسراو، بەناوبانگ.

**انگشـتـو**- ا(ئەنگیـشـتو- engiştü): چنگاڵ، نانی لە ڕۆن گوشراو.

**انگشـتـه**- ا(ئەنگوشـتـە- enguşte): شەنە، شەن.

**انگل**- ا(ئەنگەل- engel): پارازیت، مێمڵ، توفەیلی، مشەخۆر، کەسێک لەسەر خەڵکی تر بژی.

**انـگـل شـنـاسی**- ا(ئەنـگـەل شـنـاسی- engel şinasi): ناسینی مشـەخـۆرانی زەڕەبینی.

**انگل**- ا(ئەنگول- engul): گـولـێـنـک، دوگمە.

**انگولیون**- ا(ئەنگیلیون- engilyun): ئینجیل.

**انگوپا**- ا(ئەنگوپا- engupa): جـۆرە گیایەکی خۆڕسکە.

**انگور**- ا(ئەنگور- engur): ترێ، هەنگور، مێو.

**انگور فرنگی**- ا(ئەنگور فەرەنگی- engur ferengî): میوەیەکە لە چەشنی ترێ.

**انگورک**- ا(ئەنگوورەک- engûrek): سوک کراوەی ئەنگوورە، جۆرە جاڵجاڵۆکەیەکی ترێ ئاسایە.

**انگورک چشم**- ا(ئەنگورەکی چەشم- engureki çeşm): بیلبیلەی چاو.

**انگول**- ا(ئەنگول- engul): دوگمە.

**انگیختن**- مص- م(ئەنگیختەن- engîxten): جوڵاندن، هاڕوژاندن، دنەدان.

**انگیزانیدن**- مص(ئەنگیزانیدەن- engîzanîden): جوڵاندن، هاڕوژاندن، دنەدان، لڤاندن، بزاڤدان.

**انگیزە**- ا(ئەنگیزە- engîze): هۆ، هاندەر، ئەنگێزە، وروژێنەر.

**انگیزیدن**- مص- م(ئەنگیزیدەن- engîzîden): بڕوانە، **ئەنگیزانیدەن**.

**انگیل، انگیلە**- ا(ئەنگیل، ئەنگیلە- engîl, engîle): توفەیلی، مشەخۆر.

**انملە**- (ئەنمەلە- enmele): سەری قامکان، نوکی پەنجە.

**انموذج، نموذج**- (ئەنموزەج، نموزەج- numuzec): نموونە.

**انواع**- ع- ا(ئەنڤا- enva’): جۆرەکان، چەشنەکان.

**انور**- ع- ص(ئەنڤەر- enver): نورانیتر، رووناکتر، درەخشانتر، گەشتر.

**انوشە**- ا- مر(ئەنوشە- enuşe): نەمری، تازە زاوا، پاشای گەنج، جاویدان، نەمر.

**انوف**- ا(ئونوف- unuf): کەپووان.

**انهاء**- ع- مص- م(ئینهاء- inha’): گەیاندنی پەیام، گەیاندنی هەواڵ، تەواوکردن.

**انهار**- ع- ا(ئەنهار- enhar): رووباران.

**انهاض**- ع- مص- م(ئینهاز- inhaz): هەستاندن، هەڵساندن.

**انهدام**- مص- ل(ئینهیدام- inhidam): وێران بوون، داڕووخان.

**انهزام**- ع- مص- ل(ئینهیزام- inhizam): بەزین، راکردن و هەڵاتن، بەزین و بۆڕخواردنی لەشکر.

**انهماک**- ع-مص- ل(ئینهیماک- inhimak): سەرقاڵی بەکارێکەوە، پژگاڵبوون، گژبوون.

**انیاب**- ع- ا(ئەنیاب- enyab): کەڵپەکان.

**انیران**- ا(ئەنیران- enîran): بە باوەڕی زەردەشتیەکان فریشتەی نیکاحە.

**انیس**- ع- ص(ئەنیس- enîs): یارو هاودەم.

**انیسان**- ا(ئەنیسان- enîsan): ئەفسانە، قسەی درۆ، وتەی بێهودەو نابەجێ.

**انیسون**- یو- ا(ئەنیسون- enîsun): جۆرە رازیانەیەکە.

**انیشە**- ص(ئەنیشە- enîşe): جاسوس، سیخوڕ، شۆفار، خەوەردز، هەواڵدز.

**انین**- ا(ئەنین- enîn): ناڵە، ناڵین، نکاندن.

**او**- پهـ- ا(ئو- u): ئەو.

**اوا**- ا(ئاڤا- ava): دەنگ، ئاواز.
**اوائل**- ع- ص(ئەڤائیل- eva'il): یەکەمەکان.
**اواخر**- ع- ص(ئەڤاخیر- evaxir): کۆتاییەکان، دوامینەکان، بنەتایەکان.
**اوار، اواره**- ا(ئەڤار، ئەڤارە- evar, evare): دەفتەری نووسینی حیساباتی دیوان.
**اوار**- ا(ئوڤار- uvar): گەرما، گەرمای ئاگر یان هەتاو، تینوێتی.
**اوارجه**- ا(ئەڤاریجە- evarice): بڕوانە: **(اوار، اواره)**:
**اوام**- ا(ئەڤام- evam): قەرز، وام، رەنگ.
**اوامر**- ع- ا(ئەڤامر- evamir): فرمان، ئەمر.
**اوان**- ع- ا(ئەڤان- evan): کات، گاڤ، دەم.
**اوانی**- ع- ا(ئەڤانی- evanî): دەفرو ئامان.
**اوبار**- ا(ئەوبار- ewbar): کۆڵکە.
**اوباریدن**- مص- م(ئەوباریدەن- ewbarîden): قووتدان، هەڵلووشین.
**اوباش**- ع- ا(ئەوباش- ewbaş): خوێڕی، ترۆ، بەرەڵلا، عامی و بێ تەربێت، گەجەروگوجەر، هەرچی و پەرچی.
**اوباشتن**- مص- م(ئەوباشتەن- ewbaşten): پڕکردن.
**اوت**- فر- ا(ئوت- ut): مانگی هەشتەمی ساڵی فەرەنگی، ئاب.
**اوتاد**- ع- ا(ئەوتاد- ewtad): سنگ، پێشەواو رابەرانی تەریقەت، مێخ.
**اوتار**- ع- ا(ئەوتار- ewtar): ژێ.

**اوثان**- ع- ا(ئەوسان- ewsan): بت.
**اوثق**- ع- ص(ئەوسەغ- ewsex): مەحکەمتر، توندوتۆڵتر.
**اوج**- ا(ئەوج- ewc): لوتکە، بالاترین پلە، بەرزی، بە عەرەبی کراوی وشەی اوگ/ ئەوگ- ـە، کەشکەلان.
**اوجاع**- ع- ا(ئەوجا- ewca'): دەردو ئازاران، ژان.
**اوجب**- ع- ص(ئەوجەب- ewceb): پێویستر، واجبتر.
**اوحد**- ع- ص(ئەوهەد- ewhed): تەنیا، بێ وێنە، تاقانە.
**اوداء**- ع- ا(ئەڤیدا- evida'): دۆستان.
**اوداج**- ع- ا(ئەوداج- ewdac): شادەماران، دەماری گەردن.
**اودوکلنی**- ا(ئودوکولونی- uduku-lunî): قۆلۆنیا.
**اودیه**- ع- ا(ئەودییە- ewdîye): شیوو دۆلان.
**اور**- ا(ئور- ur): مست، ئەو مستەی بەدەوی کەسێکدا دەدرێ.
**اورا**- ا(ئورا، ئەورا- ura, ewra): قەلا، حەسار.
**هفت اورای چرخ**- ا(هەفت ئورای چەرخ- heft uray çerx): حەوت تەبەقەی ئاسمان.
**اوراد**- ع- ا(ئەوراد- ewrad): وێردو دوعا.
**اورامن**- ا(ئەورامەن- ewramen): یەکێکە لە ئاهەنگە کۆنەکانی مۆسیقا.
**اوران**- ا(ئوران- uran): ئۆکسیدی ئۆرانیوم.

**اورانوس**- ا(ئورانوس- uranus): خوای ئاسمان.
**اورانیوم**- فر- ا(ئورانیوم-uranyum): یورانیوم.
**اورت**- ا(ئوڤەرت-uvert): واز، کراوە.
**اوردە**- ع- ا(ئەوریدە- ewride): ئەو دەمارانەی خوێن بۆ دڵ دەهێننەوە، رەگان خوێنهێنەر.
**اورس**- ا(ئەڤریس- evris): سەرووی کێوی، درەختی ئوورز.
**اورع**- ع- ص(ئەورەء- ’ewre): خواپەرست تر، تەقوادارتر.
**اورک**- ا(ئەورەک- ewrek): دیلانێ، جۆلانە، هەرەزانی، لەیلووک.
**اورمزد، اورمز**- ا(ئورمزد، ئورمز- urmuzd, urmuz): کورتکراوەی - ئاهورا مەزدا-یە: خوای تاق و تەنیا.
**اورنجن**- ا(ئەورەنجەن- ewrencen): بازن، پاوانە، جنجیل.
**اورند**- ا(ئەورەند- ewrend): شان و شەوکەت، فەرشکۆ، ئەقڵ و ئاوەز، فێڵ و دەهۆ، هەڵخەڵەتاندن، خاپاندن.
**اورنگ**- ا(ئەورەنگ- ewreng): تەختی پاشایەتی، فەرشکۆ، عەرش.
**اورندیدن**- مص(ئەورەندیدەن- ewrendîden): فریودان، خاپاندن.
**اورە**- فر- ا(ئورە- ure): جەوهەری میز.
**اوزار**- ا(ئەوزار- ewzar): ئامێر، ئەوزار،
**اوزار**- ع- ا(ئەوزار- ewzar) گوناهان، باری قورس.
**اوزان**- ع- ا(ئەوزان- ewzan): کێش، کێشەکان.
**اوژندن**- مص- م(ئەوژەندەن- ewjenden): توڕدان، فڕێدان، پەرت کردن، راخستنی فەرش و رایەخ.
**اوژولیدن**- مص- م(ئەوژولیدەن- ewjulîden): پەڕاگەندەکردن، پەرێشان کردن، هاڕوژاندن.
**اوساخ**- ع-ا(ئەوساخ- ewsax): زڕو زبڵ، پیسی، قڕێژی.
**اوستاخ**- (ئوستاخ- ustax): گۆستاخ، گوساخ، دلێر، چاوقایم، بێباک.
**اوستاد**- ص- ا(ئوستاد- ustad): ئوستاد، شارەزا، مامۆستا، وەستا، کارزان، کارامە.
**اوستام**- ا(ئوستام- ustam): لغاف، لغاو، زین و قەرپۆز.
**اوسط**- ع- ص(ئەوسەت- ewset): میانە، مام ناوەندی، ناڤین.
**اوسع**- ع- ص(ئەوسەء- ’ewse): فراوانتر.
**اوشال**- -ا(ئەوشال- ewşal): ئاوی کەم کە لە تاوێر یان لە شاخان بتکێ، فرمێسکی چاو، ئەشکی زۆر.
**اوشاندن، اوشانیدن**- مص(ئەوشاندەن، ئەوشانیدەن- ,ewşanden ewşanîden): وەشاندن، تۆو وەشاندن، بڵاوکردنەوە.
**اوشنگ**- ا(ئەوشەنگ- ewşeng): تەناف.
**اوشین**- ا(ئەوشین- ewşîn): گیایەکی کێوی بۆن خۆشە، بۆ تام و بۆن لە ماست و دۆ دەکرێ.

**اوصــاف**- ع- ا(ئەوســاف- ewsaf): وەسف، سیما، ئەدگار.
**اوضــــــاع**- ع- ا(ئەوزاء- ewza’): ڕەوش، بارودۆخ.
**اوضــح**- ع- ص(ئــەوزەھ- ewzeh): ڕوونتر، ئاشکراتر.
**اوطــان**- ع- ا(ئـــەوتـــان- ewtan): وەتەن، وڵات، نیشتمان، وار.
**اوعــیــه**- ع- ا(ئەوئیــیــە- ew’iye): دەفرو‌ئامان.
**اوفــتـــادن**- مص- ل(ئوفــتـــادەن- uftaden): کەوتن، داتەپین، داڕووخان، ڕمان.
**اوقاف**- ع- ا(ئەوغاف- ewxaf): ئەو مــوڵـک و مــاڵانەی کــە بۆ کــۆمــەکی لێــقــەومــاوو بێنەوایان یان بۆ مــەزارو مزگەوتان یان شتی دی تەرخان دەکرێ.
**اوقــیــه**- ع- ا(ئەوغــیــیــە- ewxîye): پێوانەیەکە، بەرانبەر بە حەوت میسقاڵە.
**اوکـنـدن**- مـص- م(ئـەوکـــــــــەنـدەن- ewkenden): هەڵکەندن، توڕدان.
**اوکنیــــدن**- مص(ئـەوکـــــەنیــــدەن- ewkenîden): پەرتکردن، ڕاخــســتنی ڕایەخ، توڕدان، هەڵکەندن.
**اوگ**- ا(ئەوگ- ewg): لوتکە، بەرزی، کەشکەڵان.
**اول**- ع- ا(ئەڤڤەل- evvel): یەکەم.
**اولی**- ع- ل(ئولا- ula): یەکـــــەم (بۆ مێ).
**اولاد**- ع- ا(ئـــــــــــەولاد- ewlad): منداڵان، کوڕان.
**اولتــیــمــاتوم**- ا- فــر(ئولتــیــمــاتوم- ultîmatum): بڕیاری یەکجارەکی، دوا پێشنیــار کــە قــەبوڵ نەکرێ ببێتــە مــایەی پچڕانی پەیوەندییەکانی دوو دەوڵەت، یان ڕوودانی جەنگ، ئینزار.
**اولکه**- ا(ئولکە- ulke): مــەڵبــەند، مەیدان، وڵات.
**اولـنـج**- ا(ئـولـیـنـج- ulinc): دارکـی هێشووە ترێ.
**اولـو**- ع- ا(ئولـو- ulu): خـــــاوەنان، خودانێن.
**اولو الابصــار**- ص- مـر(ئولول ئەبسـار- ulul ebsar): خـــــەڵکی ڕوون بـین، خودانێن بینایی.
**اولو الالبـاب**- ص- مـر(ئولول ئەلبـاب- ulul elbab): ئاقــڵان، خــەڵکانی بە ئاوەز، خودانێن ئاقڤ.
**اولـو الامــر**- ص- مـــر(ئولول ئەمـــر- ulul emr): فــــــەرمـــــانڕەوایـان، پێشەوایان.
**اولو العـــزم**- ص- مـــر(ئولول عـــەزم- ulul ezim): خاوەن عەزمان، خودانێن ڤیان.
**انبیاء اولو العزم**- ا(ئەنبیائی ئولول ئەزم- enbîya’ iululezim): پەیامـبـەرانی نێـردراو، ئەو پێـغـەمـبـەرانەی کـە خـودان کتێب و شەریعەتی سەربەخۆبوونە.
**اولیــاء**- ع- ا(ئەولیــا ء- ewlya’): خاوەنان، خودانێن.
**اومــاج**- ا(ئومــاج- umac): پەڵوڵەی ئاردە گەنم.
**اونس**- فر- ا(ئونس- uns): کێشێکە- نزیکەی (٣٠) گرامە.
**اونیـــفــرم**- فــر- ص(ئونیـــفـــورم- unîfurm): جلک و بەرگی چوون یەک،

یەک شێوە، وەکو یەک، جلکی عەسکەری.
**اونیورسیته**- فر- ا(ئونیڤیرسیتە- unîvirsîte): زانستگە. زانکۆ.
**اوهام**- ع- ا(ئەوهام- ewham): تەسەور، گومان، خەیاڵ، وەهم.
**اویژه**- ص(ئەڤیژە- evîje): خالیسە، تایبەت.
**اویس**- (ئوڤەیس- uveys): گورگ.
**اهابه، اهابت**- ع- مص- ل(ئیهابە، ئیهابەت- ihabe, ihabet): لە نەعرەت دان، ترساندن.
**اهالی**- ع- ا(ئەهالی- ehalî): خەڵکی مەدەنی.
**اهانت**- ع- مص- م(ئیهانەت- ihanet): سوکایەتی پێکردن، سووک کردن.
**اهتداء**- ع- مص- م(ئیهتیداء- ihtida’): هیدایەت، دۆزینەوەی ڕێی ڕاست، ڕێ دۆزینەوە.
**اهتزاز**- ع- مص- ل(ئیهتیزاز- ihtizaz): جولانەوە، شەکانەوە، جوڵە، شادی کردن، لەرانەوە.
**اهتمام**- ع- مص- ل(ئیهتیمام- ihtimam): بایەخ پێدان، خەمخۆری، مشور خواردن.
**اهداء**- مص- م(ئیهداء- ihda’): دیاری ناردن، بەخشین.
**اهدار**- ع- مص- م(ئیهدار- ihdar): بەفیڕۆدان. خوێن ڕشتنی کەسیک، بە هەدەردان.
**اهداف**-ع- ا(ئەهداف- ehdaf): هەدەف، نیشانە، مەبەست، ئامانج.
**اهرام**- ع- ا(ئەهرام- ehram): قوچەک.
**اهرام مصر**- ع- ا(ئەهرامی میسر- ehrami misr): ئەو قەبرو گۆڕانەیە کە میسریانی کۆن لە نزیکی قاهیرەدا بۆ شا- یانی خۆیان دروستیان کردوون.
**اهرامن**- ا(ئەهرامەن- ئەهریمەن)
**اهرم**- ا(ئەهروم- ehrum): نوێڵ، باری، لوسە، مەڵغە، هیم.
**اهرن**- ا(ئەهرەن- ehren): تەشووێ، تەشو.
**اهرین**- پە- ا(ئەهریمەن- ehrîmen): شەیتان، ئەهریمەن، ئیبلیس.
**اهریه**- ا(ئەهریمە- ehrîme): شەیتان.
**اهزون**- ا(ئوهزون- uhzun): نەزۆک، ئەستێور.
**اهزون**- ق(ئەهزون- ehzun): ئێستا.
**اهل**- ع- ا(ئەهل- ehl): شایستە، خاو خێزان، خەڵکی یەک شوێن.
**اهلاک**- ع- مص- م(ئیهلاک-ihlak): لە نێو بردن.
**اهلی**- ع- ص(ئەهلی- ehlî): گیانلەبەرانی ماڵی.
**اهلیت**- ع- مص- جع(ئەهلییەت- ehlîyet): شایستەیی.
**اهلیلج**- ا(ئیهلیلەج- ihlîlec): هەلیلە، بەری درەختێکە لە هیندستان دەڕوێ. ڕەنگی زەرد یان ڕەشە، لە پزیشکیدا بەکار دێت.
**اهم**- ع- ص(ئەهەم- ehem): گرینگتر. پێویست تر.
**اهمال**- ع- مص- م(ئیهمال- ihmal): خەمساردی و بێ موبالاتی، سستی و تەمەڵی کردن، پشت گوێ خستن.

**اهمر**- ا(ئەهمەر- ehmer): چەقەڵ، تۆڕی، تۆڕک.

**اهنوخوشی**- (ئوهنوخووشی- uhnüxûşî): پیشەوەر، ئەهلی پیشە.

**اهواء**- ع- ا(ئەهڤا- ehva’): هەواو هەوەس.

**اهوار**- ع- ا(ئەهڤار- ehvar): هۆڕاو، زەلکاو، زۆنگ.

**اهوال**- ع- ا(ئەهڤال- ehval): ترس و بیم.

**اهورا مزدا**- ا(ئاهورا میزدا- ahura mizda): خوای تاک و تەنیا.

**اهون**- ع- ص(ئەهڤەن- ehven): ئاسانتر، ساناتر.

**اهیب**- ع- ص(ئەهیەب- ehyeb): بەهیبەت تر، ترسناکتر، سامناکتر.

**ای**- (ئەی- ey): ئامرازو پیتی بانگ کردن.

**ایا**- (ئەیا- eya): ئامرازو پیتی بانگ کردنە، هۆ..، هەی، ئەی.

**ایاب**- ع- مص- ل(ئیاب- iyab): گەڕانەوە، زفڕین.

**ایادی**- ع-ا(ئەیادی- eyadî): دەستان.

**ایار**- ع- ا(ئەیار- eyar): مانگی سێیەمی بەهار، مایس.

**ایارده**- ا(ئەیاردە- eyarde): تەفسیرو شرۆڤەی کتێبی زەند.

**ایاره**- ا(ئەیارە- eyare): دەفتەری حیسابات.

**ایارەگیر**- ا- ص(ئەیارەگیر- eyaregîr): حیسابدار، ژمێریار.

**ایاز، ایاس**- ا(ئەیاز، ئەیاس- eyaz, eyas): شنەی شەو، شنەی سارد، بای فێنک.

**ایازی**- تر- ا(ئەیازی- eyazî): سەرپێچ یان رووپۆشی رەشی ژنان، پێچە.

**ایاغ**- تر- ا(ئەیاغ- eyax): جام، پیاڵەی شەرابخۆری.

**ایاق، ایاق**- تر- ا(ئەیاغ، ئایاغ- eyax, ayax): پێ.

**ایالت**- ع- ا(ئیالەت- iyalet): ناوچە، ناوچەیەکی فراوانی وڵاتێک کە چەند شارێک بگرێتەوە.

**ایام**- ع- ا(ئەیام- eyyam): رۆژان، عەیام، رۆژگار، سەردەم.

**ایتام**- ع- ا(ئەیتام- eytam): هەتیوان، سێوی. هەتی، بێ باب.

**ایت ئیل**- تر- ا(ئیت ئیل- itil): ساڵی سەگ.

**ایتکین، ایتگین**- ا(ئیت کین، ئیتگین- itkîn, itgîn): خاوەن ماڵ، خودان ماڵ، ماڵخۆ، خانەدار.

**ایتوک**- ا(ئیتوک- itük): مژدە، مزگێنی.

**ایثار**- ع- ص(ئیسار- isr): لە خۆبردوویی، بەشی خۆ بە کەسێکی دی بدەی، خۆبەخت کردن، قازانجی خەڵکی پێش هی خۆت بخەی.

**ایجاب**- ع- مص- م(ئیجاب- icab): واجب کردن، پێویست کردن.

**ایجاد**- ع- ص(ئیجاد- icad)" ئیجاد کردن، داهێنان، ئەفراندن، هێنانە وجود، پەیداکردن، دروستکردن.

**ایجاز**- ع- ا- مص-م(ئیجاز- icaz): کورت بڕی.

**ئیچ**- ف(ئیچ- iç): هیچ، حەشتەبا.
**ایحاء**- ع- ص(ئیهاء- 'iha): وەحی ناردن، ئیشارەت کردن. خستنە دڵ، ئیلهام پێبەخشین، سرووش بەخشین.
**ایدر**- پە- ق(ئیدەر- ider): ئێرە، لێرە، ئێستا، هەنووکە، ئیرەنگە.
**ایدروژن**- فر- ا(ئیدروژن- idrujin): هایدرۆجین.
**ایدند**- ا(ئیدەند- idend): هەند. لە ٣- ١٠، چەند.
**ایدون**- ق(ئەیدون، ئیدون- eydün, idün): ئێستا، ئەم دەمە.
**ایده**- ا(ئیدە- ide): فیکر، ئەنێشە، خەیاڵ، تەسەور، نیەت، باوەڕ، هزر.
**ایده ال**- فر- ا(ئیدە ئال- ideal): ئارەزووی بەرز، کەماڵخوازی، نموونەیی.
**ایده الیست**- فر- ا(ئیدە ئالیست- idealîst): کەماڵخوازی، ئایدالیست، پەیڕەوی ڕێبازی ئایدیالیزم.
**ایدەالیسم**- فر- ا(ئیدەئالیسم- ide'alîsm): ئایدیالیزم.
**ایدەئولوژی**- فر- ا(ئیدەئولوژی- ideulujî): ئایدولۆژی. زانستی فیکرو مانا، ڕێبازی سیاسی یان کۆمەڵایەتی.
**ایدی**- ع- ا(ئەیدی- eydî): دەستان.
**ایذاء**- ع- مص(ئیزاء- 'iza): ئەزیەتدان، ئازاردان، ئەشکەنجەدان.
**ایر**- ا(ئیر- ir): کێر، دومەڵ، زیپکە.
**ایرا**- جر(ئیرا- ira): چونکە.
**ایراث**- ع- مص- م(ئیراس- iras): کەسیک بکرێت بە میراتگر، میراتی دانان بۆ کەسێک.
**ایراد**- ع- مص- م(ئیراد- irad): بیانوگرتن، هەنجەت، ڕەخنەگرتن، هەڵەگرتن.
**ایرسا**- لا- ا(ئیرەسا- iresa): پەلکە ڕەنگینە، سۆسەنی کێوی.
**ایرسون**- یو- ا(ئیرسون- irsun): جق جقە، کاغەزێکی زەردی ناسکە بۆ ڕازاندنەوەی هەندێ شت بەکار دێت.
**ایرمان**- پە- ا(ئیرمان- irman): میوان، میوانی ناوەخت، هیواو ئاوات.
**ایرمان** سرای- ا(ئیرمان سرای- irman seray): میوانخانە، دنیا، خانوی بەکرێ.
**ایریدیوم**- (ئیریدیوم- irîdyum): جۆرە کانزایەکی سپی سەختە لە پلەی ٢٣٦٠ گەرمیدا دەتوێتەوە.
**ایزد**- پە- ا(ئیزەد- ized): خوا، یەزدان، خوڵا.
**ایزد پناه**- ا- فا(ئیزەدپەناه- izedpe-nah): کەسێک لە پەنای خودا بێت، پەنا بەخوا.
**ایزد گشسب**- ا(ئیزەد گوشەسب- ized guşesb): خوا پەرست، خودان ئەسپ.
**ایزغنج**- ا(ئیزغنج- izxinc): جەواڵ.
**ایستادن**- مص- ل(ئیستادەن- istaden): وەستان.
**ایستاده**- ا- مف(ئیستادە- istade): وەستاو، لەسەر پێ، وسیاگ.
**ایستگاه**- ا(ئیستگاه- istgah): وێستگە، جێی وەستان.
**ایسر**- ع- ص(ئەیسەر- eyser): ئاسانتر. لای چەپ، چەپ.
**ایشان**- ضمیر-(ئیشان- işan): ئەوان.

**ایشـــیک اقـــاسی**- تر- ا(ئیـــشـــیک ئـاغـــاسی- işîk axasî): دارۆغـــەی دیوەخان، پیاوی دەرباری شا.

**ایصـاء**- ع- مص- م(ئیـسـا ء- isa’): وەســێت کــردن، ئامــۆژگـاری کــردن، راسپاردن.

**ایصـال**- ع- مص- م(ئیـسـال- isal): گەیاندن، پەیوەندیکردن.

**ایـضـــا**- ع- ق(ئـەیـزەن- eyzen): دیسان، هەمدیس.

**ایضـــاح**- ع- مص(ئیـــزاھ- izah): روونکردنەوە.

**ایغده**- ا(ئەی غودە- eyxude): بێهودە بێژ، ورێنەکەر.

**ایغـر**- ص(ئەیغـیـر- eyxir): نێـر، ئەسپ، فەحل.

**ایغـــری**- تر- ا- مص(ئەیغـیـــری- eyxirî): جووت بوونی حەیوانات.

**ایفاء**- ع- مص- م(ئیـفـا- ifa): پەیمان و بەڵێن بردنەسەر، هەقدانەوەی خەڵک.

**ایفـاد**- ع- مص- م(ئیـفـاد- ifad): ناردن.

**ایقـاظ**- ع- مص- م(ئیـغـاز- ixaz): بێدارکردنەوە، هۆشیارکردنەوە.

**ایقـاع**- ع- مص- ل(ئیـغـا ء- ixa’): خستن، ریتم، شەبەیخون.

**ایقـان**- ع- مص(ئیـغـان- ixan): دڵنیابوون، باوەڕکردن، گەیشتنە یەقین، بێ گومانی، یەقین.

**ایل**- تر- ا(ئیـل- il): تیـرەو تایفـە، عەشرەت، عێڵ، خێڵ.

**ایـل بیـگـی**- تر- ص- ن(ئـیـل بـەگـی- ilbegî): جێگری سەرەک عێڵ.

**ایلجـــار**- تر- ا(ئیلجـــار- ilcar): کۆبوونەوەی ژمارەیەکی زۆر لە رەعیەت بۆ ئەنجامدانی کارێک.

**ایلچی**- تر- ص- ن(ئیـلچی- ilçî): سەفیر، نێردراوی تایبەتی، باڵیۆز.

**ایلخـان، ایلخـانی**- تر- ا.فـا(ئیلخـان، ئیلخانی- ilxan, ilxanî): سەرخێڵ، سەرەک عێڵ.

**ایلخی**- تر- ا(ئیلخی- ilxî): گـــەلە ئەسپ.

**ایلغار**- تر- ا(ئیلغار- ilxar): هێرش، شەبەیخون.

**ایلول**- ع- ا(ئیلول- ilul): مـــانگی نۆیەمی رۆمی.

**ایم**- ع- ص(ئەییم- eyyim): پیـاوی ژن مــردە، ژنی بێ مـێـرد، بێـوە پیـاو، بێوەژن.

**ایماء**- ع- ص(ئیـــمـــا ء- ima’): ئیشارەتکردن، کینایەو رەمز، ئاماژە.

**ایماق**- تـر- ا(ئـویمـاغ- uymax): قەبیلە، خێڵ، تایفە.

**ایمان**- ع- ا(ئیـمـان- iman): باوەڕ، ئیمان.

**ایمر**- ا(ئیمەر- imer): گاسن.

**ایمن**- ع- ا(ئەیمەن- eymen): راست، یومن، موبارەک، پیرۆز.

**ایمه**- پە- ق(ئیـمـە- ime): بێـهـودە، ئێستا، ئەم دەمە.

**این**- ضمیر(ئین- in): ئەمە.

**اینج**- ا(ئینج- inc): یەک گرێی قامک، نزیکەی دوو سانتیمەتر.

**اینفت**- ا(ئینفەت- infet): پێویستی، تکا، داوا.

**اینک**- ق(ئینەک- inek): ئەمـــــە، ئێستا.

**ایننـد**- عــــدد- (ئینەنـد- inend): هەندێک، **٣- ٩**، چەند.

**ایوار**- ق- ا(ئیـڤـار- ivar): زەردەپەڕ، ئێوارێ.

**ایوارکـــردن**- مص- (ئیـــڤـــارکـــەردەن- ivarkerden): سەفەرکردنی دەمەو ئێوارە.

**ایواز**- ص- (ئیــــڤــــاز- ivaz): رازاوە، خەملێنراو.

**ایـوان**- پـﻬ- ا(ئـەیـڤــــــــان- eyvan): بەرهەیوان.

**ایهــام**- ع- مص- م(ئیــهــام- iham): کەوتنە گومان و دوو دڵی، خستنە گومان و هەڵەوە.

# ب

**(ب- B)**= پیتی دووەمی ئەلفبای فارسییە، بە (با) دەخوێنرێتەوە، بە حەساوی ئەبجەد بەرانبەر بە دووە (٢) لە هەندێ وشەدا دەگۆڕێ و دەبێ بە (واو) وەک: (باز- واز)، (برزیدن- ورزیدن) هەندێ جاریش دەبێ بە (فێ) وەک: (ابزار- افزار). هەندێ جاریش دەبێت بە «م» وەک: (غژب- غژم).

**(با- Ba)** ئامرازی پەیوەندییە. هەندێ جار مانای هاوڕێتی یان دەگەڵ دەگەیەنێت، وەک: «فریدون با بهرام آمد»= فەرەیدون دەگەڵ بەهرامدا هات، هەندی جار مانای موڵکایەتی و خاوەنداری دەدات، وەک: باهنر= بە هونەر، هونەرمەند. هەروەها لە بواری بەراوردکاریدا بەکاردێت وەک: «این کاغز با ان کاغز فرق دارد» واتە: ئەم کاغەزە دەگەڵ ئەو کاغەزەدا جیایە.

**باآفرین**- ص(با ئافەرین- ba aferîn): شایانی ئافرەین، شایانی ستایش.

**بائت**- ا-ع(بائیت- bait): شەومەنە، خواردنی شەو بەسارە، بەیات، شەوەسارە.

**بائر، بایر**- ص- ع(بائیر- bair): وێران، کەلاوە، خراپ و گەندەڵ، بەیار، زەوییەک کە نەکرێ بە کشتوکاڵ.

**بائره**- ص- ع(بائیرە- baire): زەوی بەیار.

**بائس**- ص- ع(بائیس- bais): بێنەوا، هەژار، دەستکورت و نەدارا، کڵۆڵ و کەساس، بەلەنگاز.

**بائن**- ص- ع(بائین- bain): ئاشکرا، دیار.

**بائوباب**- (بائوباب- baubab): دەرختێکی زۆر سەخت و توندوتۆڵ و زەلامە، تیرەکەی دەگاتە بیست مەتر، لە ئەفریقیادا دەڕوێت و دەڵێن تا شەش هەزار ساڵ دەژی.

**باب**- ص- ا(باب- bab): باب، باوک، دەربارە، دەرهەق، شایستە، هەژ، هەروەها بەمانای باوو مۆدیش دێت.

**باب**- ا- ع(باب، bab): دەرگا، قاپی، دەرکی ماڵ، دەروازە، لە تەقسیمبەندی کتێباندا بەهەر فەسڵ و بەشێک دەگوترێ، پاژ.

**بابا**- ا(بابا- baba): باوک، باپیر، پیرەمێردی کامڵ، له عەرەبیدا بەمانای «پاپا»ی دیانانیش بەکار دێت.

**بابا آدم**- ا.م(بابا ئادەم- baba adem): ئادەمی بابی تیرەی بەشەر.

**بابا غوری**- ا- ص(باباغوری- babaxurî): چاوێک کەتەقی بێ و بیلبیلەی دەرهاتبێ. کوێری.

**بابت**- ا(بابەت- babet): دەربارە، جۆر، شایستە، شایان، هەژ.

**بابزن**- ا(بابزەن- babizen): شیشی کەباب.

**بابک**- ا(بابەک- babek): بابی بچووک، پەروەردەکار، دروستکار، ئیوەتکەر، بەخێوکەر.

**بابو**- ا(بابو- babü): بابی بچوک، بچوککراوەی باب، دەروێش، قەلەندەر.

**بابوته**- ا(بابوتە- babûte): گۆزەی گڵێن، گۆزەی پڕ ئاو.

**بابونه**- ا(بابوونە- babûne): گیایەکی بەهاری بۆن خۆشە، پونگە.

**بابیزان**- ا(بابیزان- babîzan): کەفیل، ناوبژیوان.

**بابیزن**- ا(بابیزەن- babîzen): ناوبژیوان، کەفیل، باوەشێن.

**بات**- ا- ع(باتتە- batte): بڕندە، یەکجارەکی.

**باتالیون**- ا(باتالیۆن- batalyon): دەستە، گروپ، بەتالیۆن، بەشێک لە هەنگی پیادە یان تۆپخانە.

**باتره**- ا(باتەرە- batere): دەف، دایەرە.

**باتری**- ا(باتری- batrî): پاتری، پیل.

**باتلاق**- ت(باتلاغ- batlax): باتلاخ، سیاناو.

**باتنگان**- ا(باتەنگان- batengan): باینجان، باجان.

**باتون**- (باتون- batün): دار دەست، عەسا.

**باتیست**- (باتیست- batîst): قوماشی دەزوو ناسک، تول.

**باج**- ا(باج- bac): باج، سەرانە، بارانە، خاوە.

**باج**- ا(باج- bac): سرووتێکی مەزەبی زەرتوشتیانە، خامۆشی و بێدەنگی لە کاتی ئەنجامدانی هەندێ سروتی ئایینی، وێردی هێواش و ژێر لێوی.

**باجناق**- ا- ق(باجیناغ- bacinax): ئاوەڵزاوا، هاولینگ، دووکەس کە دوو خوشکیان خواستبێ، هاوزاوا.

**باجه**- ا(باجە- bace): ڕۆژنە، دەلاقە، شوێنی تایبەتی بلیت برین، شوێنی وەرگرتن و دانی پارە لە سینەماو بانقەکاندا.

**باجی**- ا- ت(باجی- bacî): خوشک، باجی، خوشکی گەورە.

**باحور**- ا- ع(باحور- bahûr): گەرمای چلەی هاوین.

**باختر**- ا(باختەر- baxter): ڕۆژئاوا، خۆرئاوا.

**باختن**- ا(باختەن- baxten): گەمەکردن، لە دەستدانی شتێک، دۆڕاندن لە قوماردا.

**باخته**- ا- مف(باختە- baxte): دۆڕاو لە قوماردا.

**باخسە**- ا(باخسە- baxse): پەناڕێ.
**باخە**- ا(باخە- baxe): کیسەڵ، کێسو.
**بـــاد**- ا(بـــاد- bad): بـــا، هـــەوا، هەڵماسان، ئاوسان.
**بـاد**- (بـاد- bad): لـە چـاوگـی بـوون وەک: (زندەباد= بژی).
**باداباد**- (باداباد- badabad): هەرچی دەبێ بابێ.
**بادارنگ**- ا(بادا رەنگ- badareng): ترنج، گیایەکی بۆن خۆشە.
**بادافـرا**- ا(بادئەفـراه- bad efrah): سزا، جەزای خراپی، تۆڵە لێسەندنەوە.
**بادام**- ا(بادام- badam): درەخـــــتی بادەم، باڤی، بەهیڤ.
**بادام بن**- ا(بادام بون- badambun): بنە بادەم.
**بادامـــــە**- ا(بادامـــــە- badame): قۆزاخەی کرمی ئاورێشم، پینە، هەر شتێ لە ناوکە بادەم بچێت.
**بادآور**- ک(بادئـاڤـــــەر- badaver): شتێ کە با هێنابی، کینایەیە بۆ شتێک کە بە خـۆڕایی و بێـزەحـمـەت بە دەست بیت، باوتۆز.
**بادآور**- ا.فـا(بادئاڤــەر- badaver): با هاوردوو، خـواردنێک کـە مـرۆڤ بای پێبکات.
**بـادبـادک**- ا.مـــــــــــر(بـادبـادەک- badbadek): کۆلارە، قاقەزقوشی.
**بادبان**- ا. مـــر(بادبان- badban): چارۆکـەی کـەشـتی، یەخـە، سـەری قـۆڵی جلک.
**بـادبـدست**- ا.مـــــــــر(بـاد بـدەسـت- badbidest): مــــــرۆڤی بێـکـارە، دەستبەتاڵ، بێ شانس، بەدبەخت، کلۆڵ.
**بادبر**- ا.فـا(بادبور- badbur): بابەر، هەر دەرمانێک باکردنی سک لا ببات.
**بادبر**- ص(بادبەر- badber): فشەکەر، هیچ لە دەست نەهاتوو.
**بـادبـروت**- ک(بـادبـروت- badbrût): غرور، خۆپەسندی، فڕناخی.
**بـادبـریـن**- ا.مـــــــــر(بـادی بـەریـن- badiberîn): بای سەبا، شەماڵ.
**بادبیزن**- ا.فر(بادبیزەن- badbîzen): پانکە.
**بادپا**- ص(بادپا- badpa): تیژ، خێرا، لەز، خـۆشبەز، پـتـر بۆ ئەسـپی خێـرا بەکـار دێت. خۆشڕەو.
**باد پروا**- ا(بادپەرڤـــا- badperva): با درز، دەریچە.
**بـادپــیــچ**- ص(بـادپــیــج- badpîç): بادراو.
**بادپیما**- ص(بادپەیما- badpeyma): ئەسپ یان هێسـتـر، یا وشـتـری خۆشڕەو، مرۆڤی بێکارەو درۆزن و فشەباز.
**بادتخم**- ا.مـر(بادتوخم- badtuxm): رازیانە.
**بادخن**- ا.مـــر(بادخـــەن- badxen): دەریچە، باپەروا، بادرز.
**بــــاددار**- ص(بــــاددار- baddar): ئاوساو، باکردوو، بادار، مرۆڤی بە دەعیەو هەوا، لووتبەرز، فڕناخ.
**بـاددبـور**- ا.فـــــــــر(بـادی دەبـور- badidebûr): بایەک کـە لە باشـووری رۆژاوەوە بێت.
**بـاددژنـام**- ا.مــــــــر(بـادی دژنـام- badidijnam): بای ناشیرین و خراپ،

جۆرە نەخۆشییەکە کە لە ئەنجامیا پێستی لەش بە تایبەتی گۆنا سورهەڵدەگەڕێ. شەرابی ئاڵ و سوور.

**باددست**- ص(باد دەست- bad dest): دەستبڵاو.

**باددم**- ا.مر(باد دەم- bad dem): موشەدەمە.

**بادرم**- ص(بادرەم، بادروم- badrem, badrum): بێهودە، رەعییەت.

**بادرنگ**- ا(باد رەنگ- badreng): ترنج، بێشکە، ئەسپی خۆشبەز، کەبات، بادرەنگ.

**بادرنگبویە**- ا(باد رەنگبویە- badrengbûye): گیایەکی بۆن خۆشە، لە تیرەی پونگەیە و دەخورێ.

**بادرو**- ص(باد رەو- bad rew): کەپر، بادرز.

**بادروج**- ا(باد روج- bad rûc): رێحانەی کێوی.

**بادروزە**- ا(باد روزە- bad rûze): پێداویستی رۆژانە؛ وەک: خۆراک و پۆشاک و ئەو بابەتە شتانە، کاری رۆژانە.

**بادریس، بادریسە**- ا(بادریس- badrîs): سەرەتەشی، ئەستونی خێوەت.

**بادزن**- ا.مر(بادزەن- badzen): پانکە، باوەشێن.

**بادسار**- ک(بادسار- badsar): بێ ئاوەز، ئەقڵ سووک، توندڕۆ، تیژڕۆ، خۆشڕۆ، لە خۆبایی، فڕناخ.

**بادساری**- ا- مص(بادساری- badsarî): سەرکێش، غرور، لە خۆبایی بوون، فڕناخی.

**بادسر**- ص(بادسەر- badser): خۆپەسند، خۆپەرست، لوتبەرز، فڕناخ.

**بادسرخ**- ا.فر(بادی سورخ- badi surx): باسۆر، جۆرە نەخۆشییەکی گرانە.

**بادسنج**- ا.مر(بادسەنج- badsenc): لووت بەرز، بە هەواو دەعییە. خەیاڵ پڵاو.

**بادسنج**- ا.مر(بادسەنج- badsenc): ئامێرێکە بۆ ئەندازەگرتنی گوشارو خێرایی با، ئەنیمۆمەتر، باپێو، بانما.

**بادغر**- ا. فر(بادغەر- badxer): بادرز، بابوێر، با دەلێن.

**بادفر**- ا.مر(بادفەر- badfer): فڕفڕە، فڕفڕۆکە.

**بادفرە**- ا.فر(بادفەرە- badfere): فڕفڕۆکە.

**بادفروردین**- ا(بادی فورووەردین- badi furwerdîn): بای دەبور، بایەک، کە لە رۆژاوا یان لە باشووری رۆژاواوە بێ.

**بادفرە**- ا(بادەفرە- badefer): سزا، تاوان.

**بادکش**- ا(بادکەش- badkeş): بادرز، بادەڵێن، کەڵەشاخ کە حەجامەتکێش خوێنی پی بەر دەدات، خوێن بەردەر.

**بادگانە**- ا.مر(بادگانە- badgane): جۆرە پەنجەرەیەک یان پەردەیەکە کە بە داری ناسک دروستی دەکەن و لەبەر دەرکی ژوور یان پەنجەرە دادەنرێ تا هەوا بچێتە ژوورێ و ناو ژوورەکەش لە دەرێرا نەبینرێ.

**بادگند**- ا.مر(بادی گوند- badi gund): ئاوسانی گون، قۆڕی.

**بادگیـر**- ا.مـر(بادگـیـر- badgîr): بادگیره، بادرز، قەباغی کون کونی سەری سەماوەر.
**بادنجـان**- ا(بادینجـان- badincan): باینجان، بامجان، باجان.
**بادنما**- ا.مـر(بادنەمـا- badnema): باپێو، بانما.
**باده**- ا(بادە- bade): مـەی، شـەراب، مەستەمەنی.
**بادی**- ص- ن(بادی- badî): هەوایی، هەر شتێک بدرێتە پاڵ با وەک: «اسیای بادی»، ئاشیبا.
**بـادی**- ا- ع(بـادی- badî): هـەوەڵ، سەرەتا، ڕێڤ.
**بـادیـان، بـادیـانـه**- ا(بـادیـان، بـادیـانـە- badiyan, badiyane): رازیانە.
**بادیه**- ا- ع(بادییـە- badîye): سارا، بیابان.
**بادیه**- ا(بادییـــە- badîye): بادی، دەفری مسین، کاسەی گەورەی مسین.
**باذل**- ا.فا- ع(بازیل- bazil): سەخی، دلاوا، بەخشندە.
**بار**- ا(بار- bar): کـۆڵ، پەین، منداڵی ناوسکی دایک، جـار، مـیـوەی درەخت، بەر، کەنار، رۆخ.
**بار**- ا.فـر(بارِ- bar): مـەیخـانە، ئەو شـوێنـانەی کـە بەسـەر پێـوە ساردەمـەنی و خواردنی لێ دەخورێت.
**باران**- ا(باران- baran): باران، واران.
**بارانداز**- ا.مر(بارانداز- barandaz): شوێنێ کە باری لێ بخرێت، شوێنی لادانی کاروان، کاروانسەرا، بارەنناز.
**بـارانـی**- ا(بـارانـی- baranî): جـلـی نایلۆنی یان مـشـەمـا کـە ئاو نەدات، لە کـاتی بەفـرو باران لەبەر دەکرێت، بارانی، هەروەها ناوی تیرەیەکی تورکانە.
**بارآور**- ص- فا(بارئاڤەر- baraver): دەرخـتـی بەردار، لە بواری بانکداریدا بە سـەرمـایەیەک دەگـوترێ کـە سـوود بدات، productif.
**بـاراوردن**- مـص(بـا ئـاڤـــــەردەن- baraverden): بـــەردان، مـــنــداڵ پەروەردەکردن و هێنانەبار، بەخێوکردن.
**باربر**- ا. مـــــر(باربـەر- barber): کۆڵهەڵگر، حەماڵ، باربەر.
**باربستن**- مص- م(باربەســـتـــەن- barbesten): باربەستن، کـۆکـردنەوەو بەستنی بار تا لە ئوتومبیل یان ولاخ بنرێ، سەفەرکردن، خۆ ئامادەکردن بۆ سەفەر.
**بارپیچ**- ا- مــــر(بارپیچ- barpîç): بارپێچ، هەر شـتـێک باری پێ بپـێـچـرێ، وەکو پەت و گوریس و کەندرو ئەو شتانە.
**بارجا**- ا- مر(بارجا- barca): تەلارو دەرباری پاشا.
**بارجامه**- ا- مر(بارجامە-barcame): شەڵتە، هەگبە، تەلیس.
**بـارح**- ا- ع(بـاریـح- barih): بـای گەرم، گڕە، بایەکە کە لە هاویناندا دێت.
**بارح، بارحــه**- ا- ع(باریە- باریهـــە- barih, barihe): دوێـنـێ، شــــەوی رابردوو.
**بارخـــانه**- ا(بارخـــانە- barxane): خێوەت و چادرو ئەو پێداویستییانەی کە دەگەڵ خۆدا بۆ سەفەری دەبەن. عەمار.
**بارخـدا**- ا.مـر(بارخـودا- barxuda): خوای مەزن، پاشای گەورە، خودان.

**بارد**- ص- ع(بارید- barid): ساردە، فێنک، تەزی، چێبی.

**باردار**- ا- فا(باردار- bardar): درەختی بەردار، زگپڕ، ئاوس، دووگیان، ئاڤس.

**بارز**- ص- ع(باریز- bariz): دیار، بەرز، ئاشکرا، بەرجەستە.

**بارع**- ص- فا- ع(باریء- bari’): چاک، بالاّ، کارامە.

**بارق**- ص- فا- ع(باریغ- barix): بریقەدار، درەخشان، برووسکەدار.

**بارقە**- ص- فا- ع(باریغە- barixe): هەوری تریشقەدار.

**بارك الله**- ع(بارەکەلاّ- barekella): ئافەرم، ئافەرین، بارەقەلاّ.

**بارکش**- ا- ص(بارکەش- barkeş): بارکێش، بارەبەر، ئیدی حەیوان بێ یان عەرەبانە یان ئوتومبیل.

**بارگاه**- ا.مر(بارگاه- bargah): بارەگا، کۆشک و تەلاری پاشایان، دەربار.

**بارگی**- ا(بارەگی- baregî): یابو، بارگیر، ئەسپی نارەسەن، بارگین.

**بارگیر**- ا. فا(بارگیر- bargîr): بارەبەر، ئیدی حەیوان بێ یان عەرەبانە یان کەشتی.

**بارگین**- ا(بارگین- bargîn): چالاّو.

**بارنامە**- ا(بارنامە- barname): پسوولەی لیستی بار.

**بارو**- ا(بارو- barû): شوورە، دیواری قەلاّ، حەسار، قوللە.

**باروت**- ا(باروت- barût): باروت.

**بارور**- ص(بارڤەر- barver): بەردار، درەختی میوەدار.

**باروزە**- ا(باروزە- barûze): بڕوانە **بادروزە**- badrüze):

**بارومتر**- (بارومیتەر- barûmiter): باپێو، بانما.

**بارون**- (بارون- barun): یەکێکە لە لەقبە کۆنەکانی ئەرستوکراتانی ئەوروپا.

**بارە**- ا(بارە- bare): حەسار، شوورە، دیواری قەلاّ.

**بارە**- ا(بارە- bare): کەڕەت، دەربارە، رەوت و رێباز.

**بارە**- ا(بارە- bare): بارگین، یابو.

**باربند**- ا(بارەبەند- barebend): تەویلە، پشتیر.

**باری**- ع(باری- barî): خوا، یەزدان.

**باری**- ص- ن(باری- barî): هەرشتێک بۆ باردبردن بەکار بێت وەک: ولاّخ، عەرەبانە، ئوتومبیل، قیتار.

**باری**- ص(باری- barî): سووکەڵەی باریک، ناسک.

**باری**- ق(باری- barî): بەڵێ، خۆلاّسە. بە هەر حاڵ.

**باریافتن**- مص- ل(باریافتەن- baryaften): چوونە دەربار، گەیشتن بە حوزوری پاشا.

**باریدن**- مص- ل(باریدەن- barîden): بارین، هاتنە خواری بەفرو باران، داکردنی بەفرو باران و تەرزە، وارین.

**بارش**- ا.مص(باریش- bariş): داکردنی بەفرو باران.

**بارندە**- ص- فا(باریندە- barinde): بارانی، هەوای هەورو بێ هەتاو.

**باریک**- ص(باریک- barîk): زراف، لاواز، باریک

**باریک بین**- ص- فـــا (باریک بین- barîk bîn): ورد، زیرەک، بەکنوکـــۆ، وردبین.
**باریک بینی**- ا.مص(باریک بینی- barîk bînî): دیقـــــەت، وردی، هۆشیاری، زیرەکی، وردبینی.
**باریک میــان**- ص(باریک میــان- barîk mîyan): کـــەمـــەر باریک، ناوقەد باریک.
**باریوم**- (باریوم- baryum): کانزایەکە لە پلەی گەرمی ۸۵۰دا دەتوێتەوە.
**باز**- (باز- baz): پیـــتی ئیــزافــەیە، بەمـانای دووبارە دێت، لە نوێ، جارێکی دی، دیسان، هەمدیس.
**باز**- ص (باز- baz): واز، کـــــراوە، ئاوالە، والا.
**باز**- ا (باز- baz): باز، جـــاران بۆ راوکردنی گیانەوەران بەخێو دەکرا، لە تیرەو توخمی هەڵۆیە.
**باز**- ا (باز- baz): قۆڵ، بازوو.
**بازار**- ا(بازار- bazar): بازاڕ، سوگ، شوێنی سەوداو مامەڵە.
**بازارچە**- ا(بازارچە- bazarçe): بازاڕۆکە، بازاڕچە.
**بازاری**- ص- ن(بازاری- bazarî): بازاڕی، دوکـــــاندار، ئەهلی بازاڕ، مامەڵەچی نیو بازاڕ.
**بازارگـــان**- ا- ص(بازارگـــان- bazargan): سەوداگەر، مالفرۆش، بازرگان، گەورە فرۆشیارو کڕیار.
**بازالت**- (بازالت- bazalt): مەڕمەڕی ڕەش، سەنگی مەحەک.
**بازبین**- ا(بازبین- bazbîn): پشکێنەر، موفەتیش، کەسێک کە لە قیتار، یان موزەخانەو شوینانی دیدا تەمەشای بلیت دەکات، کونترۆلەر.
**بازپرس**- ا- فا(بازپورس- bazpurs): پرسکار، موحەقق، پشکێنەر.
**بازپرسی**- ا- مص(بازپورسی- bazpursî): پرسکاری.
**روزبازپرسی**- روزی بازپورسی- rûzibazpursî): رۆژی قیــامـــەت، رۆژی پساتێ، رۆژا پەسلانێ.
**بازپسین**- ص- ن(بازپەسین- bazpesîn): دوایین.
**بازپیچ**- ا(بازپیچ- bazpîç): بادراو، مـــورویەک کـــە بە بێـــشکەوە بکرێ بۆ سەرگەرمی منداڵ.
**بازجو**- ا. فا(بازجو- bazcû): ماموری تەحقیق لە شتێک یان کارێک.
**بازجـــویی**- ا. مص(بازجـــویی- bazcûyî): تەحقیق، تەحقیقکاری.
**بازخشین**- ا(بازیخەشین-bazixeşîn): بازی کـەوە رەنگ، جـۆرە بازێکی پشت رەشی چاو سوورە.
**بازخـــواست**- ا.مص(بازخــــاست- bazxast): پرسـینەوە، تاقـیب کـردنی هۆی کەمـتـەرخەمی و خەتای کەسێک، رۆژی قیامەت، گلەیی، لێپرسینەوە.
**روز باز خـــواست**- (روزی بازخـــاست- ruzi baz xast): رۆژی پەســـلانێ، رۆژی قیامەت.
**بــــازدار**- ا-ص(بــــازدار- bazdar): کەسێک کە بازی راو بەخێو بکات، بازەوان.
**بــــازداشـــت**- ا.مـــص(بــــازداشـــت- bazdaşt): تەوقیف، حەپسی کاتی.

**بازداشـــتگاه**- ا.مـــر(بازداشـــتگاه- bazdaştgah): زندان، ئەو شوێنەی بە موەقـەت خەڵکی تێدا حەپس دەکرێت، تەوقیفخانە.

**بازداشتن**- مص.م(بازداشـــــتـــــەن- bazdaşten): مـــــەنع کـــــردن، قەدەغەکردن، یاساخکردن.

**بازدم**- ا.مـــر(بازدەم- bazdem): ئەو بایەی کە لە سییەکانەوە دەردەدرێ. زەفیر.

**بـازدیـد**- ا.مـص(بـازدیـد- bazdîd): دیداری دووبارە، دیتن، ئەنجـــامـــدانی کارێک.

**بـازرس**- ا.فـــا(بـازرەس- bazres): موفەتیش، پشکێنەر.

**بازرسی**- ا.مص(بازرەسی- bazresî): تەفتیش، پشکنین.

**بازرگان**- ا.مر(بازەرگان- bazergan): بازرگان، دوکانداری گەورە.

**بـازرنـگ**- ا(بـاز رەنـگ- bazreng): بەروانکە، مـەمک لغ، سـینگپـۆش، مەمکبەند.

**بازغ**- ص- ع(بازیغ- bazix): روناک، پرشنگدار، بریسکەدار.

**بازگرد**- ا- مص(بازگەرد- bazgerd): گەڕانەوە، زفڕین، هاتنەوە.

**بازگـــرداندن**- مص.م(بازگـــەرداندەن- bazgerdanden): گـــــەڕانـدنـەوە، دیسان ناردنەوە.

**بازگـردانیـدن**- مص.م(بازگـەردانیـدەن- bazgerdanîden): گەڕاندنەوە.

**بـازگـــــشـت**- ا.مـص(بـازگـــــەشت- bazgeşt): گەڕانەوە، هاتنەوە، زفڕین.

**بازگـەشتن**- مص- ل(بازگــەشـتــەن- bazgeşten): گــەڕانەوە، تۆبەکــردن، وازهێنان، زفڕین.

**بازگـــو**- ا.مص(بازگـــو- bazgû): گـــوتنەوە، دووبارە کـــردنەوەی قـــســـە، گێڕانەوە.

**بازمـــــاندن**- مص- ل(بـازمـــــاندەن- bazmanden): مـانەوە، دواکـەوتن، ماندووبوون، پاشکەفتن.

**بـازمـــــانده**- ا- مـف(بـازمـــــانـدە- bazmande): پاشـــمـــاوە، زیندووی کەسـو کـار مـردوو، پاشـمـەندە، مـاندوو، دواکەوتوو.

**بازنشـستن**- مص- ل(بازنشـەسـتـەن- baznişesten): دەسـت لـە کـــــــار هەڵگرتن لە زەمـانـی پیـریدا، خـانەنشین بوون.

**بازنشـسـتـه**- ا.مف(بازنیـشـەسـتـە- baznişeste): خانەنشین.

**بـــازنمـــودن**- مـــص- م(بـــازنمـــودەن- baznimuden): بـەیـان کـــــــردن، پیشـاندان، نواندن، دەربڕین، شەرح کردن، شرۆڤەکرن، راڤەکردن.

**بازو**- ا(بازو- bazû): باهۆ، بازو

**بازوبـند**- ا(بازوبـەنـد- bazûbend): بازوبەن، نوشتە، دوعا.

**بازه**- ا(بازە- baze): دۆڵ، گـــــەلی، شـیـو، دەرە. مـەودای نێـوان دووکـێـو، داردەست.

**بـازی**- ا(بـازی- bazî): وازی، بـازی، گـەمـە، یاری، کـایە، وەرزش، قـومـار، گەمان.

**بـــازیـــکــــردن**- (بـــازیـــکــــەردەن- bazîkerden): وازی کـــــــــــردن،

خۆخافلاندن، قوماركردن.

**بـــــازی دادن**- (بـــــازیــــــدادەن- bazîdaden): خـافـلاندن و فـریـودانی كەسێك، تەفرەدان، خاپاندن.

**بازیار**- ا(بازیـار- bazyar): بـازەوان، كەسێك كە باز بەخێو بكات، جـووتیار، وەرزێر، قوشچی.

**بازیافتن**- مص- م(بـازیافــــتــــەن- bazyaften): پەیداكردنەوە، دۆزینەوە، وەدەست هێنانەوەی شتێكی لەدەستچوو.

**بازیافت**- ا.مـر(بازیافت- bazyaft): شتێك بەبێ زەحمەت بەدەست بێ.

**بازیافــــتی**- ص.ن(بـازیافـــــتی- bazyaftî): شـتـێك بەبێ زەحـمـەت بەدەست بێ.

**بازیچە**- ا(بازیچە- bazîçe): گەمەی منداڵان، وازی زارۆكان، كایەی بچووكان.

**بازیدن**- مص. م(بازیدەن- bazîden): گەمەكردن، لە دەسـتـانی شـتێك، دۆڕاندن لە قوماردا.

**بازیگر**- ص.فـا(بازیگەر- bazîger): وازیكەر، كـەسێك كـە لە شـانۆدا وازی بكات، ئارتیست، ئەكتەر.

**بازیگوش**- ص(بازیگوش- bazîguş): عـاشـقەگەمە، هەرزە، وازیدۆست، شۆخ و شەنگ.

**باژ**- ا(باژ- baj): باج.

**بـاژبـان**- ص(بـاژبـان- bajban): بـاجـەوان، كـۆكـەرەوەی بـاج و خـەراج، باجگر، باجڤان.

**باژگون، باژگونە**- ص(باژگون، باژگونە- bajgun, bajgune): ئـــــــاوەژوو، بەرەواژی، ژێروبان، واژی.

**باژن**- ا(باژون- bajun): نێــری، بزنە كێوی، تەگە، ساورێن.

**بـاسـتـار**- (باسـتـار- bastar): فـلان، یارۆ، هێن، كـابرا، ئامـاژەیە بۆ كـەس یان شتی نادیارو نەناسراو.

**بـاسـتـارو بیـسـتـار**- (باسـتـارو بیـسـتـار- bastarû bîstar): فلانو فیسار.

**بـاسـتـان**- ا- ص(باسـتـان- bastan): كەونارا، دێرین.

**باسـتـان شناس**- ا.ص(باسـتـانشـیناس- bastanşinas): ئاركـۆلۆگ، شـارەزاو پسـپـۆڕ لە زانسـتی كـەوناراناسـیـدا، كەونارازان، مەنەرناس.

**باستان شناسی**- ا.مص(باستانشیناسی- bastanşinasî): ئـاركـــــــــولـۆژی، مەنەرناسی.

**باسـتـیـان، باسـتـیـون**- ا(باسـتـیـان، باسـتـیـون- bastiyan, bastiyon): بورج، قوللە، دیواری قەڵات، وەردە.

**بـاسـتـیل**- ا.فـر( باسـتـیل- bastîl): قـەڵا، زیندان، ناوی زیندانێكی كـۆنی پاریسە كە لە شۆڕشی مەزنی فەرەنسدا لە ١٧٨٩/٧/١٤دا لەلایەن جـەمـاوەرەوە روخێنرا.

**باسرە**- ا(باسەرە- basere): مێرگ و بژوین، زەوییـەك كـە بۆ كـشـتـوكـاڵ ئامادەكرابێ.

**باسق**- ص- ع(باسـیغ- basix): بەرز، درێژ، درەختی بەرز، بڵند.

**باسک**- ا(باسوک-basuk): باوێشك.

**باسكول**- ا(باسكول- baskûl): قەپان.

**باسلیق**- ع(باســـــیلیغ- baslîx): شادەماری بازوو.

**باســــــیل**- ا(باســــــیل- basîl): گــیـانەوەرێکی وردە بەزەرەبین دەبینرێ، گیانەوەرێکی یەکخانەییە. میکرۆب.
**باســــیل کخ**- ا(باســــیل کـــــوخ- basîlkux): مـــیکرۆبی ســـیل، کـــە لەلایەن کـوخ-ی زانای ئەڵمانی لە ساڵی ١٨٨٢دا دۆزرایەوە.
**باشـــام**- ا(باشـــام- başam): پەردە، پەردەی دەرگا، پەردەساز.
**باشامە**- ا(باشامە- başame): عەبا، چارشێو، لەچک.
**باشق**- ا- ع(باشەغ- başex): باشوکە، واشە، باشو.
**باشگاە**- ا.مـــر(باشگاە- başgah): یانە، پارک و سەیرانگە.
**باشگون**- ص.مر(باشگون- başgun): ئاوەژوو، بەرەواژی، سەرەونخون.
**بـاشـگـونـە**- ص.مـــــــــر(بـاشـگـونـە- başgune): ئـــــاوەژوو، بـــــەرەواژی، سەرەونخون.
**بـــاشـــلــق**- (بـــاش لـــوغ- başlux): سەرکڵاوی گەورە کە لە کـاتی بەفرو باران لەسەر کڵاوەوە لەسەر دەکرێ.
**باشـنـگ**- ا(باشـــــەنگ- başeng): هێشـوەترێ، هێشـویەک کـە بە مێـوەکـەوە هاتبێتە خوارێ، هێشویەک کە بە دارەکەوە هیشک بووبێ.
**باشــو**- ا(باشــو- başû): مـارمــێلکە. ماریلە.
**باشومە**- ا(باشومە- başûme): عەبای ژنان.
**باشـە**- ا(باشـە- başe): واشـە، باشـو، باشوکە.

**باشی**- (باشی- başî): لە تـورکـیـیـەوە وەرگیراوە. بە مانای سەروەر، سەردەستە، بەرپرس، وەک: وەستاباشی= سەروەستا.
**باصر**- ا.فا- ع(باسیر- basir): بینا، بینەر.
**باصـرە**- ا.فـا- ع(باسـیـرە- basire): چاو، ئامێری بینین، بینا (بۆمێ).
**باطل**- ص- ع(باتیل- batil): بەتاڵ، ناهەق، بێـهـودە، ناڕاست، بێ فـایدە، بێ کارە.
**باطن**- ا- ع(باتین- batin): پەنهــان، ناوەوە، حەقیقەت، ئەسڵ، دڵ، یەکێکە لە ناوەکانی خوا.
**باعث**- ا.فـــا- ع(باعـــیس- ba'is): بایس، هۆ، سۆنگە،مایە، هەتاو، ناوێکی خوایە.
**باغ**- ا(باغ- bax): باخ، دارســـتـــانی میوە، رۆژگار، گێتی، بێستان.
**بـاغ وحـش**- ا(بـاغـی ڤـــــــــــەحـش- baxi vehş): باخچەی ئاژەڵان.
**باغـبـان**- ص.ا(باغـبـان- baxban): باخەوان.
**باغـچ**- ا(باغــەچ- baxeç): ئەنگوری هێشتا نەگەییوو، بەرسیلە.
**باغـچـە**- ا(باغـچـە- baxçe): باخی چکۆلە، باخچە.
**باغرە**- ا(باغرە- baxre): لو، ئالو.
**باغ شــیــریـن**- ا(باغی شــیـــرین- baxişîrîn): یەکـــێکە لـە ئاهەنـگە کـۆنەکـانی مـۆسـیـقـای ئێـرانی، ناوی ئاوازێکە لە سی ئاوازەکەی باربەد.
**باغنج**- ا(باغـــەنج- baxenc): ترێی باش نەگەییوو.

**بکاء**- ص. ع(بەکـاء- bekka’): زۆر گریان، گرینۆک، نووزن.
**بکـارت**- مـص. ل. ع(بـەکـــــارەت- bekaret): کـچـێنی، پەردەی کـچـێنی، دوێتێنی.
**بکبکه**- ا(بەک بەکـــە- bekbeke): چێـــشـــتی کـــەشک و رۆن، جـــولاّندن، گـێـڕانەوەی کـالاّ، قـەرەباڵغی، هاتن و چوون.
**بکتـاش**- ا.تر(بەکـتـاش- bektaş): غـولاّمی مـیـر، گـەورەی دەسـتـەیەک، سەردارو گەورەی عێڵ، بەگ.
**بکتر**- ا(بەکتەر- bekter): زرێ، جلی جەنگ.
**بکر**- ص، ع(بیـکر- bikr): کـــچی شـــوونەکـــردوو، نۆبەرە، تازە، دەست لێنەدراو، نوخشە، سەرمۆر.
**بکران**- ا(بوکران- bukran): بنکڕ.
**بکم**- ا(بەکـەم- bekem): بڕوانە **بقم**؛ جۆرە درەختێکە.
**بکم**- ا.ع(بوکم- bukm): لاڵان.
**بکمان**- ا.ع(بوکمان- bukman): کۆی بکیم (بەکیم) لاڵ.
**بکـنـک**- ص(بـەک نـەک- beknek): حەیوانی کلک بڕاو.
**بکوک**- ا(بەکـــوک- bekûk): بادەی شەرابخۆری، ساغر.
**بکی**- ص. ع(بـەکـــــیـی- bekyî): گرینۆک، کەسێ کە زۆر بگرێ.
**بکیم**- ص- ع(بەکیم- bekîm): لاڵ.
**بگ**- ص. ت(بیگ، بەگ-big, beg): بەگ، سەردار، گەورە.
**بگاه**- ق(بیـگاه- bigah): لەوەخت، بەیانی زوو، بەرەبەیان.
**بگلر**- ا.ت(بەگلەر- begler): بەگەلەر، بەگان.
**بگم**- ا. ت(بیـگوم- bigum): بەگم، خانم، خاتوون، بانۆ.
**بگمـاز**- ا.ت(بیـگمـاز- بەگـمـاز- bigmaz, begmaz): شـەراب، بادە، شەرابخۆری، پیاڵەی شەراب.
**بگنی**- ا(بەگـەنی- begenî): جـۆرە شەرابێکە، کە لە برنج و هەرزن و جۆو ئەو جۆرە دانەوێڵانە دروست دەکرێ.
**بگونیا**- ا(بیگونیا- biguniya): جۆرە گیایەکە.
**بـل**- ص- ا(بـەل- bel): هـاووازی، پاژنەی پێ.
**بل**- ع- حـــرف عطف(بەل- bel): بەڵکە، بەڵکو.
**بـلاء**- ا. ع(بـەلاء- bela’): بـەلاّ، نسـیـبـەت، گـرفـتـاری، ئەزمـوون، تاقیکردنەوە، ساوکە.
**بلابه**- ص(بەلابە- belabe): بەدکـار، فـاسق، رووسـپی، قـەحـپـە، خـراپەکـار، فیتنەچی.
**بلاج**- ا(بەلاج- belac): حەسیر.
**بلاچین**- ا.فاک(بەلاچین- belacîn): بەلاّوەگێڕ، سەدەقە، قوربانی.
**بلاد**- ا. ع(بیـــلاد- bilad): ولاّت، شاران.
**بلادانه**- ا. مر(بەلادانە- beladane): جۆرە گیایەکە.
**بـــلادت**- مـــص. ل. ع(بـــەلادەت- beladet): کەوەدنی، گێلی، گەلحۆیی، زەین کوێر، درەنگ حاڵی.

**بـــــلادر**- ا(بـــــەلادەر، بـــــەلادور- belader, beladur): دەوەنـێـکـە لەتیرەی سماق.

**بلادن**- ا(بیــلادون- biladun): جــۆرە گیایەکە.

**بلادە**- ص(بەلادە- belade): بەدکــار، رووسپی، فیتنەگێڕ.

**بلارج**- ا(بەلارەج- belarec): لەقلەق.

**بلارک**- ا(بەلارەک- belarek): جــۆرە پۆلایەکی جەوهەرداره، جەوهەری شمشێر.

**بــلاغ**- مــص. م. ع(بــەلاغ- belax): پەیام، تەبلیغ، بەلاغ، راگـــەیاندن، گەیاندن.

**بلاغت**- ا. مص. ل. ع(بەلاغەت- belaxet): زمانڕەوانی، زمان پاراوی، رەوانبێژی، رەوانپەیڤین.

**بلاغی**- ص.ن. ع(بەلاغی- belaxî): کەسێک بتوانێ بە رەوانی و جوانی مەبەستی خۆی دەربڕێ.

**بلاگـــردان**- افـا. ک(بەلاگەردان- bela gerdan): بەلاوەگێڕ، قوربانی، سەدەقەو خێر.

**بـــلال**- ا(بـــەلال- belal): زوڕات، گەنمەشامی.

**بلالک**- ا(بەلالەک- belalek): پۆلای جەوهەردار.

**بـــلاهـــت**- ا. مـــص. ع(بـــەلاهـــەت- belahet): بێ ئەقلّی، ساویلکەیی.

**بلایا**- ا. ع(بەلایا- belaya): بەلا، نسیبەت.

**بلایە**- ص(بەلایە- belaye): سۆزانی، رووسپی، قەحپە.، بەدکار.

**بلبـشـو**- ا(بیلبەشوو، بەلبەشوو- bilbeşû): ئاژاوە، هەراو هەنگامە، کەس بە کەس نەبوون.

**بلبل**- ا.ع(بول بول- bul bul): بولبل، هوزار، عەندەلیب، شالوور.

**بلبله**- ا.ع(بولبولە- bulbule): جەزوە، گۆزەی شەراب، سوراحی.

**بلبن**- ا(بەلبەن- belben): گاگۆز.

**بلخ**- ا (بەلخ- belx): قـــەرابە، کولەکەیەک کە شەرابی تێ بکەن.

**بلخچ**- ا(بەلخەچ- belxeç): زاخی رەش، شەب.

**بلخم**- ا(بەلخەم- belxem): قوچەقانێ، بەردەقانی، قەلّماسنگ.

**بلد**- ا.ع(بەلەد- beled): شار، ولات، بەلّەد، شارەزا.

**بـــلـــدان**- ا. ع(بـــولادان- buldan): شاران، ولاتان.

**بلدە**- ا.ع(بەلدە- belde): شـــار، شارۆچکە.

**بـــلـــدرچـــین**- ا. ت(بـــەلـــەدەرچـــین- belederçîn): پـــۆڕ، هـــەوێـــردە، کەرەواڵە.

**بلدیە**- ا. ع(بەلەدییـــە- beledîye): شارەوانی.

**بلســان**- ا.ع(بەلەســان- belesan): جۆرە دەوەنێکە.

**بـلـسـک**- ا(بـەلـەسـک- belesk): پەڕەسێلکە، پلسری.

**بلشک**- ا(بولوشک- buluşk): شیش تەنور، شیش کەباب، تەنوور شێون.

**بلشویک**- ا(بولشیڤیک- bulşivîk): بۆلّشەوی، زۆرینە، پەیرەوانی (لینین)، کە زۆرینەی دەنگیان هێنا.

**بلع**- مص. م.ع(بەلء- bel’): قووتدان.
**بلعم**- ص. ع(بەلئەم- belem): زۆرخۆر.
**بلعوم**- ا.ص. ع(بولئوم- bul’um): گەرو، ئەوک، قورگ، مرۆڤی زۆر خۆر.
**بلعیدن**- مص- م(بەلعیدەن- bel’îden): قووتدان.
**بلغاء**- ص- ا. ع(بولەغا- ’bulexa): بەلیغان، زمان پاراوان، رەوانبێژان.
**بلغار**- ا(بولغار- bulxar): پێستی خۆشەکراوی رەنگینی بۆن خۆش.
**بلغاک**- ا(بولغاک- bulxak): ئاژاوە، فیتنە.
**بلغده**- ص(بەلغەدە- belxede): بوخچە، دۆڕان، هێلکە دۆڕاندنی مریشک، زایەکردن.
**بلغس**- ا(بەلغەس- belxes): جۆرە گیایەکە.
**بلغم**- ا.ع(بەلغەم- belxem): بەڵغەم، تفی خەست.
**بلغندر**- ص(بەلغەندەر- belxender): بێ دین، بێ سەروبەر.
**بلغنده**- ا(بەلغوندە- belxunde): جانتا، بوخچە.
**بلغور**- ا(بولغوور- belxûr): ساوەر، قسەی گەورە، قسەی زل.
**بلفرخج**- ص(بولفەرخەج-bulferxec): خراو، ناشیرین، ناپاک، کرێت، دزێو.
**بلک**- ا(بیلەک- bilek): دیاری، نۆبەرەی میوە، توحفە، کەم وێنە.
**بلکامه**- ص(بولکامە- bulkame): پڕ ئارەزوو.
**بلکس**- ا(بەلکەس- belkes): مەنجەنیق، تەوژمی گەرما.
**بلکفد**- ا(بولکەفد- bulkefd): بەرتیل، خاوە، ریشوەت.
**بلکک**- ا(بیلکەک- bilkek): شیرتێن، شلەتێن.
**بلکن**- ا(بەلکەن- belken): مەنجەنیق، تەوژمی گەرما.
**بلکنجک**- ص(بولکەنجەک- bulkencek): عەجیب، غەریب، هەر شتێ مایەی پێکەنین بێ، سەیروسەمەرە.
**بلکه**- ح. ر(بەلکی- belki): بەڵکە، بەڵکو، بە هەرحاڵ، تەقو، شایەتا.
**بلم**- ا.ع(بەلەم- belem): بەلەم، قایەغ، لۆتکە.
**بلماج**- ا(بولماج- bulmac): پەڵوڵە.
**بلمه**- ا(بەلمە- belme): ردێنی درێژو چڕ.
**بلمه**- ص(بەلمە- belme): پیاوی ردێن درێژ.
**بلنج**- ا(بەلەنج- belenc): ئەندازە، بڕ.
**بلند**- ص(بولەند- bulend): بەرز، باڵا، هەڵکشاو.
**بلنداختر**- ص (بولەندئەختەر- bulendexter): شادمان، بەختیار، خۆشبەخت، بەتالح، بە شانس و یەغبال.
**بلنداوازه**- ص. ک(بولەند ئاڤازە- bulend abaze): مەنشور، ناسراو، ناودار.
**بلندپرواز**- ص(بولەند پەرڤاز- bulendpervaz): بەرزەفڕ، خۆپەسن، لاف لێدەر، خۆ هەڵکێش، تەرەقی خواز.
**بلندگرای**- ا. فا(بولەندگرای- bulend-geray): بەرزەفڕ، شکۆخواز،

پلەوپایەخواز.
**بلندگـو**- ا(بولەندگـوو- bulendgû): بلّندگۆ. سەماعە.
**بـلـنـدیـن**- ا(بـەلـەنـدیـن- belendîn): چوارچێوەی دەرگای ماڵ، ئاستانە.
**بـلـوی**- ا. ع(بەلـڤـــا- belva): بـەلا، نســـیـــبـــەت، دژواری، هەرا، ئاژاوە، قەرەباڵغی، سەرکێشی، هەنگامە.
**بـلـوایـه**- ا(بـەلـڤـــایـە- belvaye): پەڕەسێلکە، پلسری.
**بـلـوچ**- ا (بـولـوچ- bulûç): پـۆپـنـەی کەڵەشێر، ناوی تیرەیەکی بلوجستانە.
**بلور**- ا.ع (بولوور- bulûr): بلوور.
**بــلــوط**- ا. ع(بــەلــلــووت- bellût): درەختی بەڕوو.
**بـلـوط دریـایـی**- (بـەلـووتـی دەریـایـی- belûti deryayî): توتیا، دەرمانێکی چاوانە.
**بلوغ**- مص. ل. ع(بولووغ- bulûx): بولوق، بالق بوون، خـۆ ناسین، شـەیتـانـی بوون.
**بلوف**- (بولوف- bulûf): بلۆف، فـێڵ، درۆ.
**بـلـوک**- ا(بـولـووک- bulûk): بـلـۆک، دەڤــەرێک کـــە چەند گـــوندو دێیـــەک بگرێتەوە.
**بلوک**- ا(بولووک- bulûk): جماعەت، دەستە دەستە.
**بـلـوک**- ا(بـولـوک- bulûk): بـلـۆک، کۆمەڵە ولاتێک یەک بگرن و یەک مەرام و ڕێبازی سیاسییان هەبێ.
**بـلـونـک**- ا(بـەلـونـەک- belûnek): شمشێری دارین.

**بـــلـــه**- ق. ع(بـــەلـــی، بـــەعـــلـــی- belî, be'lî): بەڵێ، ئەرێ.
**بله**- ا. ع(بولهـ- bulh): کـەم ئەقـلان، گێلان، ئەبلەهـ.
**بلهاء**- ص. ع(بەلها- belha): ئافرەتی بێ ئەقڵ، ئافرەتی گێل، ئافرەتی ئەبلەهـ.
**بلهـــوس**- ص. ع(بـولـهـــەڤـــەس- bulheves): هـەوەسـکـار، پـڕ هـەوەس، بە هەوەس.
**بلی**- ق.(بەلی. belî): بەڵێ.
**بلیـــاد**- ا(بەلیـــاد- belyad): جلی سادەی بێ نەخش و نیگار.
**بلیارد**- ا(بیلارد، بیلیارد- bilyard): جۆرە یارییەکە، بلیارد.
**بلیت**- ا. ع(بەلییەت- belîyet): بەلا، کۆست، ئازار، تاقیکردنەوە.
**بلیـه**- ا. ع(بەلیـیـە- belîye): بەلا، نسیبەت، ڕەنج، گرفتاری.
**بلیـد**- ع. ص(بەلیـد- belîd): بەلیـد، کەودەن، گێل، زەین کوێر.
**بلیغ**- ص- ع(بەلیغ- belîx): بەزمان، قـــســـەزان، بەدەمـــو زمـــان، زمـانپـــاراو، ڕەوانبێژ.
**بلیله**- ا(بەلیله- belîle): بەلالۆک.
**بم**- ا(بەم- bem): دەنگی بەرز.
**بمب**- ا(بۆمب- bomb): بۆمبا.
**بمب افکـن**- ا.فـــا(بـۆمب ئەفـکـەن- bomb efken): فـڕۆکـەی جـەنگی، فڕۆکەی بۆمباهاوێژ.
**بمـبـــــــاران**- ا(بـۆمـب بـاران- bombbaran): بۆردومان.
**بمبـــاردمـــان**- ا(بۆمب باردومـــان- bombardumn): بـۆردومـــــان،

بۆمباباران.

**بن**- ا(بون- bun): بن، بنی بیر، ڕەگ، ژێر.

**بن**- ا. ع(بون- bun): قاوە.

**بناء**- ا. ع(بیناء- bina’): تەلار، بینا، ساختمان، ئەپارتمان.

**بناء**- ص. ع(بەنناء- benna’): بەنا، وەستای بینا.

**بنات**- ا.ع(بەنات- benat): کیژان.

**بنات النعش**- ا. ع(بەناتونەئش- benatunniş): حەوتەوانە.

**بنادر**- ا. ع(بەنادیر- benadir): بەندەران، شارانی کەنارێن دەریا.

**بناغ**- ا(بەناغ- benax): هەوێ.

**بناگوش**- ا(بوناگوش- bunagûş): نەرمەی گوێ. پەناگوێ، لاجانگ.

**بنام**- ص(بینام- binam): هاوناو، بەنامێ، ناودار، ناسراو، بەنێوبانگ.

**بنام ایزد**- (بینام ئیزەد-binamized): پەنا بە خوا، بۆ سەرسامی و چاوی پیس و سوێند بەکاردێت.

**بنان**- ا. ع(بەنان- benan): سەری پەنجە.

**بنان**- ا(بەنان- benan): مۆز.

**بنانج**- ا(بەنانج- benanc): هەنە، هەڤی، هەوێ.

**بناور**- ص(بوناڤەر- bunaver): ریشەدار، بندار، قووڵ.

**بن بست**- ا. ص(بون بەست- bunbest): کوێرەکۆڵان، کاری دژواری بێ چارە.

**بنت**- ا. ع(بینت- bint): کچ، کیژ، دوێت، قز، کناچە، کەنیشک.

**بنج**- ا. (بەنج- benc): بەنگ، بەنج.

**بنجاق، بنچاق**- ا. ت(بونجاغ، بونچاغ- buncax, bunçax): قۆچان، قەواڵە، کۆنە سەنەدان.

**بنجشک**- ا(بینجیشک- bincişk): پاساری، چۆلەکە، چێشکە. کێشکە.

**بنجک**- ا(بونجەک- buncek): گلۆڵەپەموو، پەمووی شیکراوەی ئامادە بۆ رستن.

**بنجل**- ص(بونجول- buncul): عەمارەپۆ، بێ کەڵک، کاڵای خراپ، کاڵای بێ بازاڕ.

**بند**- ا(بەند- bend): بەند، پەت، بەربەست، جومگە.

**بند امدن**- مص. ل(بەند ئامەدەن- bend ameden): وەستانەوە، راوەستان.

**بند اوردن**- مص. م(بەند ئاڤوەردەن- bendavûerden): راگرتن.

**بندبودن**- مص. ل(بەندبوودەن- bendbûden): گیربوون، گرفتار بوون.

**بندشدن**- مص-ل(بەند شودەن- bendşuden): ئارام بوون، مەحکەم بوون. گیربوون، داسەکران.

**بندکردن**- مص. م(بەندکەردەن- bend kerden): پەخسیرکردن، توندکردن، جووت بوون، دیلکردن.

**بنداد**- ا(بونداد- bundad): بونیاد، بناغە، بنچینە، هێم، پشتیوان، رەچەڵەکی هەر شتێک.

**بندار**- ا. ص(بوندار- bundar): رەگوریشەدار، خاوەن موڵک، سەرمایەدار، گرانجان، گومرگچی، رەسەن، بەهۆش، دانا.

**بنداناز**- ا(بەندئەنداز- benendaz): دەموچاو هەڵگر.

**بندباز**- ا. ف(بەند باز- bendbaz): پەتباز، ئاكرۆبات.

**بندر**- ا(بەندەر- bender): بەندەر.

**بندزدن**- مص.م(بەندزەدەن- bendzeden): چاككردنەوەی قاپی شكاو بە قەید.

**بندزن**- ا.فا(بەندزەن- bendzen): ئەو كەسەی قاپی شكاو چاك دەكاتەوە.

**بندش**- ا(بەندەش- bendeş): گلۆلە پەمووی شیكراوەی ئامادە بۆ رستن.

**بندق**- ا.ع(بوندغ- bundux): فندق(كەرەزاتە).

**بندك**- ا(بەندەك- bendek): لۆكەی بژاركراو بۆ رستن.

**بندكش**- ا.فا(بەندكەش- bendkeş): درزكار، ئەو كرێكار یان وەستایەی درزی نێوان خشت یان بەردی بینایان دەكات.

**بندكشی**- ا.مص(بەندكەشی- bendkeşî): پڕكردنەوەی درزی نێوان خشت یان بەردی رووكاری بینایان بە چیمەنتۆ.

**بندمه**- ا(بەندیمە- bendîme): قۆپچە، دوگمە.

**بن دندان**- ا(بونی دەندان- bunidendan): بێخی دان، پووك، كینایەیە لە گوێ رایەڵی.

**بندوز**- ا(بوندوز- bundûz): بەنی جەواڵ درون

**بنده**- پھ- ا.ص(بەندە- bende): خولام، نۆكەر، كۆیلە.

**بندی**- ص(بەندی- bendî): گیرۆدە، دیل، زیندانی، یەخسیر.

**بندیخانه**- ا.م(بەندیخانە- bendîxane): بەندیخانە، زیندان، حەپسخانە.

**بندیمه**- ا(بەندیمە- bendîme): قۆپچە، دوگمە.

**بنزوات**- ا(بەنزوئات- benzuat): جۆرە خوێیەكە.

**بنزین**- فر.ا(بەنزین- benzîn): بەنزین.

**بنساله**- ص(بونساله- bunsale): كۆن، بەساڵاچوو، پیر.

**بنشاختن**- مص. م(بینشاختەن- binşaxten): دانیشاندن

**بنشن**- ا(بونشەن- bunşen): دانەوێڵە، نۆك و نیسك و ماش و لۆبیاو پاقلەو...

**بنصر**- ا. ع(بینسیر- binsir): قامكی برا تووتە.

**بنفسج**- ا(بەنەفسەج- benefsec): وەنەوشە.

**بنفش**- ا- ص(بەنەفش- benefş): وەنەوشەیی.

**بنفشه**- ا- پھ(بەنەفشە-benefşe): وەنەوشە.

**بنفوز**- ا(بونفوز- bunfûz): دەم و قەپۆز، لمۆز.

**بنكدار**- ا.فا(بونەك دار-bunekdar): جوملەفرۆش، ئیدی بازرگانی بێ یان بەقاڵی و عەتاری.

**بنكران**- ا(بون كەران- bunkeran): بنكرِ.

**بنكشیدن**- مص(بونكوشیدەن- bunkuşîden): هەڵلوشین، قووتدان بە نەجوراوی.

**بنـگ**- ا(بـەنـگ- beng): بـەنـگ، شادانە.

**بنگان**- ا(بەنگان-bengan ): فینجان.

**بنگاه**- ا.مــر(بون گــاهـ- bungah): بنکە، دەزگا، عەمار، بارەگا، شوێنی کڕین و فرۆشتن.

**بنگره**- ا(بـەن گـــــەرە- bengere): بالۆرە، لایـلایە، ئەو ئاوازەی کـــە ژنـان منداڵی پێ دەکەنە خەو.

**بنگلک**- ا(بونگولەک- bungulek): بنجی گوڵ.

**بنگن**- ا(بەنگەن- bengen): کەردو.

**بنگو**- ا(بەنـگوو- bengû): جـــۆرە گیایەکە.

**بنلاد**- ا(بونلاد- bunlad): بناغــەی دیوار، پشتیوان.

**بنو**- ا(بونوو- bunû): خـەرمانی گـەنم یان جۆ یان کا و ئەو شتانە.

**بنـوان**- ا(بـونـڤـــــــان- bunvan): خـەرمـانەوان، پاسـەوانی خـەرمـان یان زەرعات.

**بنوسرخ**- ا(بونووسورخ- bunûsurx): نیسک.

**بنوسیاه**- ا(بونوسیياهـ- bunûsiyah): ماش.

**بنون**- ا.ع(بەنوون- benûn): کوڕان.

**بنه**- ا(بونە- bune): بنە، ناو مـــاڵ، موڵک و دارایی، بنەوبارگە.

**بنه**- ا(بەنە- bene): پـەتی بـاریـک، درەختێکە لە جۆری درەختی سماق.

**بنی**- ا.ع(بونەی- buney): کـــوڕک، کوڕێژگە، رۆڵە.

**بـــنـــی ادم**- ا.ع(بـــەنـــی ئـــادەم- benîadem): بنیـادەم، کـوڕێن ئادەم، رۆڵەیێن ئادەم.

**بنی فـاطـمـه**- ا.ع(بەنی فـاتیـمـە- benîfatime): رۆڵەیێن فاتیمە.

**بنی اســرائیل**- ا(بەنی ئیـســرائیل- benî isra'il): رۆڵەیێن ئیسرائیل.

**بنیاد**- ا.م(بونیاد- bunyad): بونیاد، بناغە، تەمەڵی دیوار، هێم، بنەڕەت.

**بنیـان**- ا.ع(بونیـان- bunyan): بینا، بونیاد، بناغە.

**بنیه**- ا. ع(بونیە- bunye): فیـترەت، بوون، سروشت.

**بنیـچه**- ا(بونیـچـە- bunîçe): بەش، دیاریکردنی بەش و قـەرزی هەر دەسـتـەو هاوپیشەگەلێک.

**بنیــز**- ق(بینیــز- binîz): هەرگـیـز، حاشا، خیرا، بەلەز، دیسان، هەروەها.

**بو**- ا(بوو- bû): بۆن.

**بـوکـــــردن**- مص. ل٠بوو کـــــەردەن- bûkerden): بۆنکردن.

**بوگـرفتن**- مص. ل(بووگـیــریفــتنەن- bûgiriften): بۆن گـرتن، بۆگـەن بوون. هەستکردن بە شتێک.

**بـوبـردن**- مـص. کـنـایـە(بـووبـوردەن- bûburden): هەست کـردن، پەی بردن، زانین.

**بـودادن**- مـص٠بـودادەن- bûdaden): بۆندان.

**بو**- ا.ع(بو- bû): ئەبوو، وەکـــو ئەبول قاسم، باوکی...

**بوا**- مـر ا(بوڤـا- buva): مـارێکی گـەورەی بێ ژەهرە لە ئەمـریکای باشـوور هەیە.

**بواب**- ص. ع(بەڤـڤـاب- bevvab): دەرگاوان، پاسەوان.

**بواد**- (بوڤـاد- buvad): وشـەی دوعـايە، لە وشـەی (بودن= بودەن)ەوە وەرگيراوە، ببێ...

**بوادی**- ا.ع(بەڤادی- bevadî): سارا، دەشت، بيابان.

**بوار**- مص. ل- ع(بەڤـار- bevar): نەمان، لەناوچوون، بەيار، زەوی وێران.

**دارالبـوار**- ا(دارولبـەڤـار- darulbevar): دۆزەخ.

**بوارد**- ا.ع(بەڤـاريد- bevarid): شمشێری بڕندە، ساردەمەنی، فێنكەوات.

**بواسير**- ا.ع(بەڤاسير- bevasîr): مايەسيری.

**بواشه**- ا(بەڤاشە- bevaşe): شەنە.

**بواعث**- ا.ع(بەڤـائيس- beva'is): سۆنگە، هۆ.

**بوئيدن، بوييدن**- مص. م(بوئيـدەن- bûiden): بۆن كردن.

**بوينده**- ص.فا(بويەندە- bûyende): بۆنكەر، هەستی بۆن كردن.

**بويا**- ص(بويا- bûya): موعەتەر، بۆن خۆش.

**بويان**- ص. فـا(بويان- bûyan): بۆنكەر.

**بوب**- ا(بووب- bûb): فەرش، رايەخ.

**بوبرد**- ا(بووبورد- bûburd): بلبل، هوزار، شالوور.

**بـووبـك**- ا(بـووبـەك- bûbek): پەپوەسلێمانكە، شانەسەر.

**بوبه**- ا(بووبە- bûbe): شانەسەر.

**بوبين**- فر.ا(بوبين- bûbîn): داينەمۆ.

**بوته**- ا(بووتە- bûte): بنچك، دەوەنی چڕ.

**بوتيمار**- ا(بووتيمار- bûtîmar): ماسيگرە، جۆرە باڵندەيەكی كلك كورتی دەنووك و مل درێژی سپی و كەسك و شينە. شينە شاهۆ، خەمخۆرەك.

**بوجار**- ص. ا(بووجار- bûcar): كەسێك كە دانەوێڵە لە بێژنگ دەدا، شەنەباچی.

**بوجاری**- ا. مص(بووجاری- bûcarî): پاككردنەوەی دانەوێڵە لە خۆڵ بە بێژينگ.

**بوجارلنجان**- ك(بوجارلينجان- bûcarlincan): هەلپەرست، دەليڤە پەرست.

**بوخل، بوخله**- ا(بوخەل، بوخەلە- bûxel): پۆلكە، گاگۆز، گيايەكە.

**بودار، بويدار**- ص(بوودار- bûdar): بۆندار، قسەی بە توێكڵ.

**بودجه**- فر. ا(بودجە- bûdce): بودجە، ميزانييە.

**بودن**- مص(بوودەن- bûden): هەبوون، بوون.

**بوش**- ا.مص(بوڤيش- bûviş): بوون، هەبوونی.

**باشنده**- ص. فا(باشندە- başinde): هەبوو.

**بونده**- ص. فا(بوڤەندە- bûvende): هەبوو.

**بودوباش**- ا(بودوباش- bûdûbaş): وجود، بوون، ماڵ و سوكنە.

**بودونبود**- ا.مر(بودونەبود- bûdû nebûd): بوون و نەبوون، وجودو عەدەم.

**بور**- ا.ص(بوور- bûr): زێرین، زەرد یان سووری کاڵ. سووربوونەوە لە شەرمەزاریدا، تەریق بوونەوە.
**بورابرش**- ص(بووری ئەبرەش- bûri ebreş): بەرشە، ئەسپی سوور کە خاڵی سپی تێدابێ.
**بوربیجادەرنگ**- ا.مر( بوری بیجادە رەنگ- bûri bîcade reng): هەتاو، خۆر، رۆژ.
**بور**- ا(بوور- bûr): ئامێرێکی مۆسیقای کۆنە.
**بورشدن**- مص. ل(بوورشودەن- bûrşuden): تەریق بوونەوە، خەجاڵەت بوون، شەرمەزاری، بێ ئومێد بوون.
**بورات**- ا(بورات- bûrat): ئەسیدی بوریک.
**بورات دو سود**- فر.ا(بوراتدو سود- bûratdûsûd): جۆرە خوێیەکە.
**بوراکس**- فر.ا(بوراکس- bûraks): جۆرە خوێیەکە.
**بوران**- ا(بووران- bûran): بۆران، باران یان بەفر بەباوە، زریان، بارۆڤە.
**بورانی**- ا(بورانی- bûranî): جۆرە خواردنێکە، لە سپیناخ یان کولەکە یان باینجانی سوورەوەکراو دروست دەکرێ.
**بورت**- ا(بورت- bûrt): شەربەی بچووکی قوڵفدار.
**بورژوا**- فر.ا(بورژوا- bûrjuwa): شاریی، دەوڵەمەند، سەرمایەدار، بۆرژوا.
**بورژوازی**- فر.ا(بورژوازی- bûrjuwazî): چینی سەرمایەدار، خاوەن کەرەستەی بەرهەمهێنان.
**بورس**- فر.ا(بوورس- bûrs): بۆرسە، بازاری کرین و فرۆشتن (بەتایبەتی پارەی بەنرخ و بەهادار).
**بورق**- ا.ع(بوورەغ- bûre¨x): کەرو، ژەنگ، پرگ، کەری.
**بورک**- ا(بوورەک- bûrek): کەرووی سەرنان.
**بورنگ**- ا(بورەنگ- bûreng): ریحانەی کێوی.
**بوره**- ا(بوورە- bûre): جۆرە خوێیەکە.
**بوریاء**- ا.ع(بووریاء- bûrya’): حەسیر.
**بوز**- ص(بووز- bûz): ئەسپی خۆشبەز، پیاوی بە زەین، زیرەک.
**بوزگند**- ا(بووزگەند- bûzgend): هەیوان، دالان.
**بوزه**- ا(بووزە- bûze): شەراب، شەرابێ کە لە ئاردی برنج و هەرزن و جۆ دروست بکرێت.
**بوزینه**- ا(بووزینە- bûzîne): مەیموون.
**بوژ**- ا(بەوژ- bewj): گێژاو، گێژەنگە.
**بوژنه**- ا(بووژنە- bûjne): شکۆفەو بەهار، درەختی هێشتا نەپشکوتو.
**بوستان**- ق- ا(بووستان- bûstan): بێستان، گوڵزار، باخی میوە، گوڵستان.
**بوسلیک**- ا(بوسەلیک- bûselik): ناوی ئاهەنگێکی مۆسیقای ئێرانییە.
**بوسه**- ا(بووسە- bûse): ماچ، راموسان، بۆسە.
**بوسیدن**- مص. م(بووسیدەن- bûsîden): ماچکردن.
**بوش**- ا. مص(بوڤیش- bûviş): بوون، گەردوون، کەون، چارەنووس، یازی.
**بوش**- ا(بەوش- bewş): خۆنوێنی،

کەروفەڕ.
**بوش**- اا(بووش- bûş): دەم، زار.
**بوشاسب**- اا(بووشاسب- bûşasib): خەون، خەون دیتن.
**بوغ**- اا(بووغ- bûx): بۆقی، کەرەنا.
**بوغنج**- اا(بووغەنج- bûxenc): سیادانە.
**بوف**- اا(بووف- bûf): کوند، کوندەپەپو، بایەقوش، جوغد.
**بوفە، بوفت**- اا(بوفە، بوفەت- bûfe, bûfet): جانتا، باوڵ، شوێنی نان خواردن، لە سەیرانگایان یان وێستگەی قیتاران.
**بوق**- ع(بووق- bûq): بۆقی، شەیپوور، کەرەنای.
**بوقلمون**- اا(بووغەلەموون- bûxelemûn): قەلەموون، عەلی شیش.
**بوک**- (بووک- bûk): بریا، خۆزیا، کاشکێ، خۆزگە.
**بوکس**- فر.اا(بوکس- buks): بۆکس، مشت.
**بوکسور**- ص.اا(بوکسور- bûksur): بۆکسەر، بۆکس وەشێن، مشتباز.
**بوکند**- اا(بوکەند- bûkend): لاولاو.
**بوگان**- اا(بووگان- bûgan): پزدان، منداڵدان.
**بوگلک**- اا(بوگولەک- bûgulek): بنجی گوڵ، قەزوان.
**بول**- ا.ع(بەول- bewl): میز، پێشاو.
**بولاغ اودی**- ا.ت(بوولاغ ئودی- bûlax udî): جۆرە رووەکێکە، وەکو کوزەڵە.

**بولنجک**- ص(بولەنجەک- bûlencek): سەیر، هەرشتێکی سەیرو پێکەنیناوی، کۆمیدی.
**بولوار**- فر.اا(بولڤار- bûlvar): بولوار، شەقام و مەیدانی بەدارو درەخت بۆ سەیران و تەماشا.
**بوم**- اا(بووم- bûm): شوێن و ماوا، زەوی بەیار، شار، دەڤەر، زێد.
**بومی**- ص. ن(بوومی- bûmî): هاوشوێنی، خەڵکی یەک شوێن.
**بومبر**- ا.م(بوم بەر- bûmber): زەمین، شوێن، سەرزەمین.
**بوم، بومە**- ا.ع(بووم- بوومە- bûm, bûme): کوندەپەپو، بایەقوش، جوغد.
**بومادران**- اا(بوومادەران- bûmaderan): هەزارپەڕ.
**بومهن**- اا(بوومەهەن- bûmehen): بوومەلەرزە.
**بون**- اا(بوون- bûn): پزدان، منداڵدان.
**بوناک، بويناک**- ص(بووناک، بووییناک- bûnak, bûynak): بۆگەن، هەر شتێک کە بۆنی ناخۆش بێ.
**بووارد**- فر.اا(بووڤارد- bûvard): کاغەزی مەرەکەب یان ئاو وشک کردنەوە، کاغەز
**بوهمان**- اا(بوهمان- bûhman): فلان و فیسار، منداڵدان، پزدان.
**بويا**- ص(بوویا. bûya): بۆندار، بۆنخۆش، موعەتەر.
**بويائی**- اا(بوویایی- bûyayî): هەستی بۆنکردن، کەپوو، لووت، دفناک.

**بوی افـــــــزار**- (بـووی ئـەفـــــــزار- bûyefzar): بەهارات و ئالـەتی تیـژی وەک بیبەرو زەردەچەوەو دارچین.
**بویدان**- ا.مـــر(بوویدان- bûydan): گولاودان، گولاوپژێن.
**بوی سـوز**- ا(بووی سـوز- bûysûz): ئاگردان، بخوردان.
**بوی کوهی**- ا(بوی کوهی- bûykûhî): جۆرە رووەکێکە.
**بـوی گـلـک**- ا(بـوی گـــــــــولـەک- bûygulek): بنجەگوڵ.
**بویه**- ا(بوویە- bûye): ئومـێـدەواری، خۆزی خوازی، ئارەزوو.
**به**- ص(بیـــــــه- bih): باش، چاک، پەسەند.
**بهتر**- ص(بیـهتـەر- bihter): باشـتر، چاکتر، پەسەندتر.
**بـەشـــــدن**- مـص(بیـــــه شـــــودەن- bihşuden): باش بوون.
**بهی**- ص(بیهی- bihî): باشی، چاکی.
**به**- ا(بیه- bih): بەهێ.
**به**- (بەه- beh): پەه!، پەح!.
**بهـــا**- ا(بەها- beha): بەها، نرخ، قیمەت.
**بهــاء**- ع.ا(بەهاء- beha’): رەونەق، جوانی، عەزەمەت، فەڕ، شکۆ.
**بهـــائم**- ا.ع(بەهائیم- beha’im): حەیوانات، ئاژەڵان.
**بهـــائی**- ص. ت(بەهائی- behaî): بەهایی، پەیڕەوی ئاینی بەهایی.
**بهــادر**- ص، ت(بەهادور- behdur): دلاوەر، ئازا، دلێر، بوێر.
**بهار**- ا(بەهار- behar): وەرزی بەهار، بت، بتـــخـــانە، ئەتەشگەدن، ناوی پەرستگەیەک بووە لە بەڵخ.
**بهـاربند**- ا(بەهاربەند- beharbend): تەویلەی بێ ئاسمانە کە بەهاران و هاوینان ولاخی لێ دەبەستنەوە.
**بهـارســـتـان**- ا. مـر(بەهاریســتـان- beharistan): باخی مـیـوەو گـولان، بتخانە.
**بهـاره**، بهـاری- ص.ن(بەهارە، بەهاری- behare, beharî): بەهارە، بەهاری.
**بهـاز**- ا(بیـهـاز- bihaz): ئەسـپـی رەسەن.
**بهاگـیـر**- ا.فـا(بەهاگـیر- behagîr): گرانبایی، بەنرخ.
**بهـــامین**- ا(بەهامین- behamîn): وەرزی بەهار.
**بهـانه**- ا(بەهانە- behane): بیـانوو، پەڵپ.
**بهـــانەجـــو**- ا.فـــا(بەهانەجـــوو- behanecû): بیانووگر.
**بهــبـود، بهــبـودی**- ا.مص(بیـهـبـود، بیـــهـبــودی- bihbûd, bihbûdî): باش، باشی، سـەلامـەت، سـەلامـەتی، تەندروستی.
**بـــهـــت**- ع. مــص(بــوهــت- bûht): حەیرمان، سەرسوڕمان.
**بهـــتــــان**- مص. ل. ع(بوهتـــــان- bûhtan): بوختـان، درۆ، ئیـفـتـیرا، درۆ هەڵبەستن.
**بهـــجت**- مص. ل. ع(بـەهجـــــەت- behcet): شادی، شادمانی.
**بهـداری**- ا(بیـــهـــداری- bihdarî): تیمارخانە، دایەرە یان وەزارەتی تەندروستی.

**بهدار**- ا.فا(بیهدار- bihdar): فەرمانبەری تەندروستی.
**بهداشت**- ا.مص(بیهداشت- bihdaşt): مەرکەزی تەندروستی، تەندروستی، پاراستنی ساغڵەمی.
**بهدانه**- ا.م(بیهدانه- bihdane): تۆوی بەهێ.
**بهدین**- ا.ص(بیهدین- bihdîn): ئاینی زەردەشتی، بەدین، ئایندار.
**بهدینان**- ا.ص(بیهدینان- bihdînan): پەیڕەوانی ئاینی زەردەشت.
**بهر**- ا(بەهر- behr): بەش، هەند، نەسیب.
**بهرام**- ا(بەهرام- behram): ئەستێرەی مەریخ، رۆژی بیستەمی هەر مانگێکی هەتاوی، ناوی فریشتەیەکە.
**بهرامج**- ا(بەهرامەج- behramec): ئاوریشم، جلی کەسک، شۆڕەبی.
**بهرامن**- ا(بەهرامەن- bahramen): یاقووتی سوور، ئاوریشمی رەنگاورەنگ، سووراو.
**بهرامه**- ا(بەهرامە- behrame): ئاوریشم.
**بهرک**- ا(بەهرەک- behrek): چەرمی ناو لەپ یان بنی پێ کە لە ئەنجامی زۆر کارکردن غارا بێ و رەق بووبێ.
**بهرمان**- ا(بەهرەمان- behreman): جۆرە گوڵێکە، یاقووتی سوور.
**بهرمه**- ا. ا(بەهرەمە- behreme): درێل.
**بهروج**- ا(بیهروج- bihrûc): جۆرە بلورێکی شینباوی تەنکی هەرزان بەهایە.

**بهروز**- ا. ص(بیهروز- bihrûz): رۆژی باش، بەختەوەر، بەختیار.
**بهروز**- ا(بیهروز- bihrûz): بلور، جۆرە بلورێکی شینباوە.
**بهره**- ا(بەهرە- behre): سوود، قازانج، میوە، حاسلات.
**بهرهور**- ص(بەهرەڤەر- behrever): بەهرەدار، بەسوود، کامەران.
**بهرهمند**- ص(بەهرەمەند- behremend): کەسێک کە سوودی لە شتێک یان کارێک بردبێ، بەهرەوەر، بەهرەمەند.
**بهزاد**- ص(بیهزاد- bihzad): ئەسڵزادە، رەسەن، نەجیب.
**بهش**- ا.ع(بەهش- behş): شۆکەی جۆرە دارێکە.
**بهشت**- ا(بیهیشت- bihişt): بەهەشت، جەننەت، باخی بێ هاوتا.
**بهشت ایین**- ص(بیهیشت ئایین- bihişt ayîn): بەهەشت ئاسا.
**بهک**- ا(بەهەک- behek): بەڵەک، بەڵەکی، نەخۆشییەکی پێستە.
**بهگزین**- ص.فا(بیهگوزین- bihguzîn): کەسێک کە شتی باش هەڵبژێرێ، هەڵبژاردە، ناوازە.
**بهل**- ص(بیهیل- bihil): بهێڵە، لە زاراوەی بانکداریدا بەو کەسە دەگوترێ کە حیسابی خۆی دابێ و قەرزدارنەبێ.
**بهلول**- ص- ع(بوهلول- buhlûl): پیاوی رووخۆش، چاکەکار، گەورەو سەرداری قەوم، روو بە پێکەنین، بالولی دانا.
**بهله**- ا(بەهلە- behle): دەستکێشی چەرم، بەزۆری راوچییان لە دەستی دەکەن

و بازو سیخوڕو ئەو شتانەی پێ دەگرن.
**بهمان**- ا(بەهمان- behman): فیسار، یارۆ، فلان.
**بهم برامدن**- مص. ل(بیهەم بەرئامەدەن- bihem ber ameden): تووڕەبوون، غەمگین بوون، دڵتەنگ بوون.
**بهم امدن**- مص. ل(بیهەم ئامەدەن- bihem ameden): پەیوەست بوونی دوو شت، ڕێک کەوتن.
**بهمن**- ا(بەهمەن- behmen): مانگی یازدەیەمی ساڵی هەتاوی، مانگی دووەمی زستانە، ڕەنوو، هەرەسی بەفر.
**بهمنجنه**- ا(بەهمەنجەنە- behmencene): جەژنێکی کۆنی ئێرانییە دەکەوێتە ڕۆژی دووەمی مانگی بەهمەنەوە.
**بهنام**- ص(بیهنام- bihnam): ناوچاک، ناو خۆش، خۆشناو.
**بهنانه**- ا(بیهنانە- bihnane): کولیچەی سپی، نانی سپی.
**بهو**- ا(بەهو- behû): هەیوان، کۆشک، باڵەخانە، بەرهەیوان.
**بهی**- ا(بیهی- bihî): بەهێ.
**بهی**- ص. ع(بەهی - behî): جوان، ڕووناک، پرشنگدار.
**بهیه**- ص. ن.ع(بەهییە- behîye): جوان، ڕووناک، پرشنگدار.
**بهیج**- ص. ع(بەهیج- behîc): شادمان، خۆشحاڵ، باش، چاک.
**بهیمه**- ا.ع(بەهیمە- behîme): وڵاخ و ڕەشە وڵاخ، حەیوانات، چارەوێ، چارەوا.
**بهین، بهینه**- ص.ن(بیهین، بیهینە- bihîn, bihîne): چاک، باش، هەڵبژاردە، باشترین، هەڵبژاردەترین، هەفتە.
**بی**- (بی- bî): نیشانەی نەفی و پێشگرە. زیاتر دەچێتە سەر ناو مانای سیفەتی دەداتێ وەکو «بی باک= بێ باک».
**بیابان**- ا(بییابان- bîyaban): بیابان، سارا، دەشتی بی ئاوو ئاوەدانی.
**بیات**- ا(بەیات- beyat): ناوی ئاوازێکی مۆسیقی ئێرانییە، ناوی تایفەیەکی تورک نەژادی ئێرانە.
**بیات**- مص. ل. ع(بەیات- beyat): شەومانەوە لە جێیەک، هێرشی شەوانە، شەبەیخون، لە فارسیدا بە نانی شەومەنەش دەگوترێ بەیات.
**بیاج**- ا(بییاج- biyac): بڕک.
**بیاره**- ا(بەیارە- beyare): بڕکی کولەکە و کاڵەک و شوتی، بڕک.
**بیاستو**- ا(بیاستوو- biyastû): باوێشک، بۆنی دەم.
**بیاض**- ا.ع(بەیاز- beyaz): سپی، دەفتەری باخەڵ، بەیاز، دەفتەری بیرەوەری نووسین.
**بیاع**- ص. ن. ع(بەیاء- beya’): فرۆشیار، معامەلەچی، دەلاڵی کڕین و فرۆشتن.
**بیان**- مص- ل. ع(بەیان- beyan): ئاشکرابوون، دەرکەوتن، کفش بوون.
**بیانک**- ا(بیانەک- bîyanek): جۆرە ڕووەکێکە.
**بیاوار**- (بیاڤار- bîyavar): کار، ئیش.

**بیب**- ا(بیب- bîb): جۆره مێرووویه‌كه.
**بیباک**- ص(بیباک- bîbak): دلاوەر، جـوامـێـر، ئازا، بێ ترس، بێ پەروا، بێ باک.
**بی برگ**- ص(بیبـەرگ- bîberg): بێ گـەڵا، دارێک گـەڵای وەری بێ، بێنەوا، هەژار، دەست کورت، بێدەست.
**بی بی**- تر. ا(بی بی- bîbî): خـاتوون، کەیبانۆ، داپیره، نەنک، دایه گەوره.
**بـی پـایـاب**- ص(بـی پـایـاب- bîpayab): قـوول، بۆ دەریاو رووباران، بێ بن.
**بی پروا**- ص(بی پەرڤـا- bîperva): بێ باک، بێ ترس، دلێـر، رەشـیـد، چاونەترس.
**بیت**- ا.ع(بەیت- beyt): بەیتی شیعر، خانوو، ماڵ.
**بیـتـاب**- ص(بیـتـاب- bîtab): بێ تاقەت، بێ ئۆقره، نەسرەوتوو.
**بیت الحـرام**- ا.ع(بەیتـول هەرام- beytul heram): کـەعـبـە، بۆیه پێی گوتراوه بەیتول حەرام، چونکه چوونه ناوی له گاوران حەرام بووه.
**بیت الحـزن**- ا.ع(بەیتـول حـوزن- beytul huzn): ماڵی بەخەمو پەژاره.
**بیت العـتـیق**- ا.ع(بەیتـول ئەتیخ- beytuletîx): ماڵی کۆن، ماڵی ئازاد، ماڵی کەعبه کە کۆنترین پەرستگەیه.
**بیت العنکبوت**- ا.ع(بەیتول ئەنکەبوت- beytul enkebût): داوی جاڵجاڵۆکه که هێمایه بۆ سستی و بێ سەباتی، تەونی داپیرۆشک.
**بیت الغـزل**- ا.ع(بەیتـول غـەزەل- beytul xezel): شابەیتی غەزەل.
**بیت القصـیده**- ا.ع(بەیتـول غـەسـیده- beytul xesîde): شابەیتی چامه، ئەو بەیتەیه که مەبەستی شاعیر دەنوێنێ.
**بـیـت الـلـه**- ا.ع(بـەیـتـولـڵـلاه- beytullah): خـانەی خوا، مـاڵی خـوا، کابه، کەعبه.
**بیـتـوته**- مص. ل. ع(بەیتـوته- beytûte): مـانەوەی شەو، شـەونشـینی، بەسەربردنی شەو له شوێنێ.
**بیجاده**- ا(بیجاده- bîcade): یاقوت، کارەبا.
**بیجک**- ا(بیجەک- bîcek): فاکتۆر، لیست، وەسڵ.
**بیچاره**- ص(بیچاره- bîçare): داماو، بێ چاره، بێ دەرمـان، دەست کـورت و موحتاج.
**بیـچون**- ص(بیـچوون- bîçûn): بێ هاوتا، بێ نەزیر، یەکێکه له سیفەتەکانی یەزدان.
**بیـچون و چرا**- ق. مـر(بی چوون و چرا- bîçûnuçira): بـێ چەنـدو چوون، بـێ گفتوگۆ، بێ قسه.
**بیـخ**- ا(بیـخ- bîx): بـن، رەگ، بێـخ، ریشه.
**بیـختن**- مص. م(بیـختـەن- bîxten): بێژان.
**بیـزنده**- ص. فـا(بیـزینده- bîzinde): بێژەکار.
**بیـزیده**- ا. مف(بیـزیده- bîzîde): بێژراو.
**بی خرد**- ص(بی خیرەد- bîxired): بێ ئاوەز، گێل، گەوده‌ن، بێ ئەقڵ.

**بیخ کــــوهی**- ا(بیـــــخی کـــــوهی- bîxikûhî): جۆره رووەکێکه، رازیانه.

**بیـخــو**- ص(بی خــوو- bîxû): زەوی بژارکراو له گیاکەڵه.

**بیــخــود**- ص(بی خـــود- bîxûd): بێهۆش، بێ حاڵ ، بێ دەستەڵات، بێهودە، تێکچوو.

**بیــخــویشتن**- ص(بی خــیــشـــتــەن- bîxîşten): بێـــهـــۆش، بێ خـــۆ، ئاگالەخۆبراو.

**بید**- ا(بید- bîd): درەختی بی.

**بیـــد مـــجنون**- ا(بیـــدی مـــەجنون- bîdimecnûn): شۆڕەبی.

**بیداء**- ا.ع(بیداء- beyda’): بیابان، سارا.

**بیداد**- ا.ص(بیـداد- bîdad): سـتـەم، زوڵم.

**بیـــدادگـــر**- ص. فـــا(بیـــدادگـــەر- bîdadger): ستەمکار، زۆردار.

**بیدار**- ا.ص(بیـدار- bîdar): بێـدار، بەخەبەر، ئاگادار، هوشیار.

**بیــــدار دل**- ص. ک(بیـــــدار دل- bîdar dil): دڵ ئاگا، هۆشیار، بەهۆش.

**بیدانجیر**- ا(بید ئەنجیر- bîdencîr): گەرچەک.

**بیـدبرگ**- ا(بیـد بەرگ- bîdberg): گەڵای بی، هەندێ تیری وەکو گەڵای بی.

**بیدبن**- ا(بیدبون- bîdbun): درەختی بی.

**بیدخ**- ا. ص(بیدەخ- bîdex): ئەسپی خۆشبەز.

**بیـدخت**- ا(بەی دوخت- beyduxt): ئەستێرەی زوهرە، ناهید.

**بیدر**- ا.ع(بەیدەر- beyder): خەرمان؛ خەرمانی جۆ، گەنم.

**بیدستر**- ا(بیـدەسـتـەر- bîdester): سەگلاو، سەگی ئاوی، سەگاڤی.

**بیدق**- ا.ع(بەیدەغ- beydex): پیادە، ئەستێرە، ڕێنوێن لـه سـەفـەردا، یەکێکه له بەردەکانی شەترەنج.

**بیـــدل**- ل.ص. ک(بیــــدل- bîdil): دڵتـەنگ، غـەمگین، ئاشق، شـەیدا، دڵ له دەستداو.

**بیدلا**- ا.ص(بیـدیلا- bîdila): وڕینە، قسەی بێ سەروبەر.

**بیـــد مـــشک**- ا(بیـــد مـــیـــشک- bîdmişk): درەخـتـێکه له جـۆری بی، شابی، شۆڕەبی.

**بیـر**- ا(بیـر- bîr): هەوره تریشـقـه، تۆفان.

**بیرانه**- ا.ص(بیرانه- bîrane): وێرانه.

**بیراه**- ص.ک(بیراه- bîrah): کەچڕەو، گومـڕا، بێ ویژدان، کەسێک کە ڕێی گوم کردبێ، له ڕێ دەرچوو، کەسێک کە کاری ناپەسند بکات.

**بیـــراهه**- ا.ص(بیــــراهه- bîrahe): کـوێرەڕێ، ڕێیـەک کـه مـرۆڤ نەگـەیەنێـتـه مەنزڵ. ڕێی غەڵەت.

**بیـرزد**- ا.ع(بیـرزەد- bîrzed): جـۆره گیایەکه.

**بیـــرق**- ا.ع(بەیرەغ- beyrex): ئاڵا، بەیداخ.

**بیــــرگ**- ص- ک(بی رەگ- bîreg): کینایەیه له بێ غیرەت.

**بیــرم**- ا(بەیرەم- beyrem): جـــۆره قوماشێکی کەتانی ناسکه.

**بیرن**- ا(بیرون- bîrun): دەرەوە.

**بیرو**- ص(بی رو- bîrû): بێ شەرم، بێ چاوو روو.

**بیـــرون**- ا(بیـــرون- bîrûn): دەرەوە، روالەتی شتێک

**بیـزار**- ص(بیـزار- bîzar): بێـزار، بێ مەیل، کەسێک کە رقی لە شتێک بێ و خۆی لێ دوور بگرێ، وەڕس.

**بیـزیدن**- مص(بیـزیدەن- bîzîden): بێزان.

**بیـــژه**- ص(بیـــژە- bîje): بێ غـــەل و غەش، پاک، خاڵیسە، تایبەت، پەتی.

**بیستاخ**- ص(بیستاخ- bîstax): دلێر، دلاوەر، ئازا.

**بیـســتـــار**- ا(بیـــســتـــار- bîstar): فیسارەشت، فیسارە کەس.

**باستاروبیستار**- ا(باستارو بیستار- bastarû bîstar): فلان و فیسار.

**بیستگانی**- (بیستگانی- bîstganî): ئەرزاقی سـوپاییـان، ئازوقـەو مـوچەی سوپاییان.

**بیسـراک**- ا(بیـسـوراک- bîsurak): خـوێری، بەرەڵلا، بێ سـەروبەر، دەنی، هەرچی و پەرچی.

**بیـــسکویت**- فـــر. ا(بیـــسکویت- bîskuwît): پسکێت.

**بیسموت**- فر. ا(بیسموت- bîsmût): جۆرە کانزایەکە.

**بی سنگ**- ص.ک(بی سـەنگ- bîseng): سـووک، بێ قـەدر، بێ حورمەت، بێ نرخ، بێ پایە، بێ ئیحتوبار، شوێنێ بەردی نەبێ.

**بیـسـیکلیت**- فـر.ا(بیـسـیکلت- bîsîklit): پاسکیل.

**بی سیم**- ا(بیسیم- bîsîm): بێتـەل، ئامـێرێکە بە بێ تەل شـەپۆلی دەنگ بۆ دوور دەنێرێ، تەلەگرافی بێ تەل.

**بیش**- ق. ص(بیش- bîş): زیاد.

**بیشـتـر**- ص. تف(بیشـتـەر- bîşter): زیاتر.

**بیش**- ا(بیش- bîş): جـۆرە گـیـایەکی ژەهراوییـە لە چین و هیندسـتـان دەڕوێت، گەڵاکانی لە گەڵای کاهو دەچێت.

**بیشمار**- ص- بی شومار- bîşumar): بێ حەساو، بێ ئەندازە، یەجگار زۆر.

**بیـشـه**- ا(بیـشـە- bîşe): بێـشـە، جەنگەڵی بچووک، لێڕەوار.

**بیص**- ا.ع(بەیس- beyis): تەنگانە، گیرۆدەیی، گرفتاری.

**حـیص و بیص**- ا(حـەیس و بەیس- heysû beys): گیرودار، گرفتاری.

**بیـض**- ا. ع(بەیز- beyz): هێـلکە، خایە.

**بیـضـاء**- ص. ع(بەیزاء- beyza’): سپی، چەرموو، چەرمگ.

**بیـضـه**- ا.ع(بەیزە- beyze): گـون، هێلکە، کلاوخود، خایە.

**بیضوی**- ص. ن(بەیزەڤی- beyzevî): هێلکەیی.

**بیطار**- ا. ص. ع(بەیتـار- beytar): بەیتـاڵ، پزیشکی ولاغـان، دکـتـۆری ئاژەڵان.

**بـیـع**- مـص. م. ع(بـەیء- bey’): فرۆشتن.

**بیعانه**- ع. ا.مر(بەیئانە- bey’ane): بێعانە، پێش بەها.

**بيعت**- مص. ل. ع(بەيئەت- bey’et): پەیمانی دۆستی و ئەمەکداری، تازەکردنەوەی پەیمان، بەڵێندان.

**بیغار**- ا(بیغار- bîxar): سەرزەنشت، تانە، لۆمە، گازندە.

**بیغال**- ا(بیغال- bîxal): نێزە، رم.

**بیغوش**- ا(بی غوش- bîxuş): بایەقوش، کوند، کوندەپەپو، جوغد.

**بیغوله**- ا(بەیغولە- beyxûle): کونج، گۆشە، سووچی ماڵ، وێرانە، کەلاوەی دوور لە ئاوەدانی.

**بیفتک**- فر.ا(بیفتەک- bîftek): توێیەکی گۆشتی گا کە ببرژێنرێ. جۆرە خواردنێکە.

**بیکاره**- ص(بیکارە- bîkare): کەسی بێکار، بێ کەڵک، بەڕەڵڵا، بێ فایدە، بێ سوود.

**بیکران**- ص(بیکەران- bîkeran): بێ پایان، بێ سنوور.

**بیکس**- ص(بیکەس- bîkes): بێکەس، بێ نەوا، هەژار، داماو.

**بی‌کیار**- ص(بی کیار- bîkiyar): گورج و گۆڵ، چاپوک، چالاک، چوست.

**بیک**- ا.تر(بەیک- beyk ): بەگ، میر، سەرکردە، سەردار.

**بیگار**- ا(بیگار- bîger): بێگار، کاری بێ هەقدەست، کاری خۆڕایی، سوغرە.

**بیگانه**- ص(بیگانە- bîgane): بێگانە، غەوارە، غەریب، نەناس، ئەجنەبی، فەرەنگی.

**بیگاه**- ق(بیگاه- bîgah): ناوەخت، درەنگ، شەوەکی.

**بیگلر**- ا.ص. تر(بەیگلەر- beygler): گەورەی شار یان قەوم، گەورە، میر.

**بیگم**- ا. تر(بیگوم- bîgum): خانم، خاتوون.

**بیل**- ا. ا(بیل- bîl): بێڵ، خاکەناز.

**بیلان**- فر.ا(بیلان- bîlan): دەفتەری دەرامەت و خەرجیات.

**بیلسته**- ا(بیلەستە- bîleste): بست، وژە.

**بیلک**- ا(بیلەک- bîlek): بێڵچە، بێڵی بچووک، تیری دوو لقە، تیری راو.

**بیله**- ا(بیلە- bîle): رمی بێڵ ئاسا، سەوڵی کەشتیوانان.

**بیلیون**- فر(بیلیون- bîlyûn): بیلیۆن، هەزار میلیۆن.

**بیم**- ا(بیم- bîm): ترس، سام، تۆقین.

**بیمار**- ص(بیمار- bîmar): نەخۆش، بیمار، دەردەدار.

**بیمارسان**- ص(بیمارسان- bîmarisan): نەخۆش ئاسا.

**بیمارستان**- ا.م(بیمارستان- bîmaristan): نەخۆشخانە.

**بیمارغنج**- ص(بیمار غەنج- bîmar xenc): دەردەدار، **نەخۆش**، دەغەزار.

**بیمر**- ص(بی مەر- bîmer): بێ شومار، بێ سنوور، بێ ئەندازە، بێ پایان.

**بیمناک**- ص(بیمناک- bîmnak): ترسناک، مەترسیدار، ترسێنەر، سامناک.

**بیمه**- ا(بیمە- bîme): بیمە، زەمانەت.

**بین**- ا.ع(بەین- beyn): نێوان، ناوەند.

**بـــین**- ص. ع(بـــەیـــن- beyyin): ئاشکرا، دیار، کفش.
**بینا**- ص- فـــا(بینا- bîna): بینەر، کـەسـێک کـە هەردوو چاوی سـاغ بێ، پێچەوانەی کوێر.
**بینائی**- ا. مص(بینایی- bînayî): بینایی، دیتن، بەسیرەت.
**بینات**- ا.ع(بەیینات- beyyinat): ئاشکرایان، بەڵگە، دەلیل.
**بیناس**- ا(بیناس- bînas): دەریچـە، دەلاقە، پەنجەرەی ماڵ.
**بیـنـه**- ا.ع(بـەیـیـنـە- beyyine): بەڵگەی ئاشکرا، بورهان.
**بینش**- ا. مص(بینش- bîniş): دیتن.
**بی نمازی**- ا. مص(بی نەمـــــازی- bînemazî): بێ نـوێـژی، عــــادەی مانگانەی ژنان.
**بینوا**- ص(بی نەڤـــا- bîneva): بێ نەوا، هـەژار، دەســـتکورت، بێ تـوانا، بەدبەخت، کەساس، داماو.
**بیـنـونـت**- ا. مـص. ع(بـەیـنـوونـەت- beynûnet): جیابوونەوە، جیایی.
**بینه**- ا. ع(بەیینە- beyyine): دەلیل و بەڵگە، بەڵگەی ئاشکرا.
**بینی**- ا(بینی- bînî): کـەپوو، لووت، دفن.
**بی نیـــاز**- ص(بی نیـــاز- bîniyaz): دەوڵەمەند، خاوەن شت، دارا.
**بیـور**- ا(بی ڤـەر- bîver): ژمـارەیەکـە بەرامبەر بە دەهەزار.
**بیو**- ا(بەیوو- beyû): بووک.
**بیـواره**- ص(بیـڤـارە- bîvare): بێـوار، بێ‌شوێن، بێکەس، بێ‌قەدر، بێ ئیحتوبار.
**بیواز**- ا(بیـڤـاز- bîvaz): شـەمشـەمـە کوێرە.
**بیوت**- ا.ع(بیوت- byût): ماڵان.
**بیـــوتات**- ا. ع(بیـــوتات- byûtat): ماڵان.
**بیـور**- ا(بی ڤـەر- bîver): ژمـارەیەکـە بەرانبەر بە دە هەزار.
**بیـــوس**- ا. مص(بەیووس- beyûs): چاوەڕوانی، تەماداری، تەماحکاری.
**بیـــوســـیـــدن**- مص. م(بەیوســـیـــدەن- beyûsîden): تـەمـــــــاح هـەبـوون، چاوەڕوان کردن، بە تەمابوون.
**بیـــوسنده**- ص- فـــا(بەیـوسندە- beyûsende): چاوەڕوان، تـەمـــادار، تەماحکار.
**بیـوک**- ص(بویوک- buyûk): گـەورە، سەردار.
**بیـــوگـــانی**- ا. مص(بەیوگـــانی- beyûganî): بـوکـــانـێ، زەمـــاوەند، زەوجین.
**بیـــوگـــراف**- فـــر. ا(بیـــوگـــراف- bîyûgraf): ژیننامەنووس.
**بیـــوگـــرافی**- فـــر.ا(بیـــوگـــرافی- bîyûgrafî): نـووســـــینـەوەی ژیـانـی کەسێک.
**بیـولوژی**- فـر.ا(بیـولۆژی- bîyûlûjî): بایولۆژی، زیندەوەرزانی.
**بیـــولوژیک**- فـــر. ص(بیـــولوژیک- bîyûlûjîk): پەیوەست بە بایولۆژی.
**بیـوند**- ا(بیـڤـەند- bîvend): غـەدر، خیانەت، بێ وەفایی، فێڵ و حیلە.
**بیـــوه**- ا. ص(بیـــڤـــە- bîve): بێـوە، بێوەپیاو، بێوەژن.

**بیـــهـــده**- ص(بی هوده- bîhude):
بێهوده، ناهەق، بێ سوود.

**بیـهـمـال**- ص(بی هەمال- bîhemal):
بێ هاوتا، بێ وێنه، بێ شەریک.

**بی همتا**- ص(بی هەمتا- bîhemta):
بێ هاوتا، بێ نەزیر، بێ هەڤڕک.

**بیـهن**- ا(بیـهـەن- bîhen): سـیـچەر، سیخور.

**بیهـود**- ا. ص(بیـهـود- bîhûd): نیـوه سووتاو.

**بیـــهـــوده**- ص(بیـــهـــوده- bîhûde):
بێهوده، بێ سەمەر، بێ فایده، ناهەق.

**بیـــهـــوش**- ص(بیهووش- bîhûş):
بێـهـۆش، گەوج، کـەم حـاڵی، زەین کـۆڵ.

# پ



**پ**- حر(پ- p):
پیتی سێیەمی ئەلفبای فارسییە کە (با)ی فارسیشی پێ دەگوترێ بە حیسابی ئەبجەد دەکاتە (٢).

**پا، پای**- ا(پا، پای- pa, pay): پا، پێ، لاق، لنگ.

**پافزار**- ا(پائەفزار- paefzar): پێڵاو.

**پا انداز**- ا. مر(پا ئەنداز-pa endaz): رایەخی ژێرپێیـان، فـەرشی بەر دەرگـای ژوور، دەلاڵی ئاشقێنی.

**پـا اورنجـن**- ا(پـا ئـەورەن جـــەن- pa ewrencen): حـەجل، خـڕخـاڵ، پاوەن.

**پائیـدن**- مص(پائیـدەن- pa'iden): جاویدان، ماتەڵ بوون.

**پائیـر، پاییـز**- ا(پاییـز- paîz)" وەرزی پاییز، وەرزی خەزان.

**پائـین، پـایـین**- ص.ن(پائـین- paîn): پایین، خوارەوە.

**پابپا**- ق(پابەپا- pabepa): پێبەپێ، بەرانبەر.

**پـابـپـــــابـردن**- مـص(پـابـەپـابـوردەن- pabepaburden): پـێ‌بـەپـێ بـردن، دەسـتی کەسێک بگری و پێ‌بەپێی خۆتی ببەی.

**پابپـــاکـــردن**- مص(پابەپاکـــەردەن- pabepakerden): مـــاتەڵ کـــردن، دواخستن، دوو دڵ بوون.

**پابرجـــا**- ص(پابەرجـــا- paberca): بەرقەرار، پایەدار، هەمیشە.

**پابـسـت**- ا.ص(پابـەسـت- pabest): پابەند، بونیـادی تەلار، عـاشق، بناخـە، تەمەڵ.

**پـــای‌بـــســـت**- ا.ص(پـــای بـــەســـت- paybest): پابەند، دڵبـەند، بونیـادی تەلار، بناخە.

**پاماه**- ص. ک(پابەماه- pabemah): ئاوسـێک کـە زایینی نزیک بێ، مـانگی خۆی، پاومانگ.

**پـابـنـد**- ا.ص(پـابـەنـد- pabend): پاوەند، قـوماتی منداڵ، عاشق، گـرفتـار، خاوەن هاوسەر، پێوەند.

**پابوس**- ا. مص(پابوس- pabûs): پێ ماچکردن، چوونە دیدەنی کەسێکی گەورە.
**پاپ**- فــر. ا(پاپ- pap): ســەرۆکی کڵــێسای کــاسۆلیکی رۆما کــە لەلایەن کــۆمــەڵێک کــاردینالەوە هەڵدەبژێردرێ، پاپا، قەشە.
**پاپا**- فر.ا(پاپا- papa): بابە، باوک.
**پاپاسی**- (پاپاسی- papasî): پارەی بچووک و کەم بەها، پولێکم نییە.
**پاپژ**- ا(پاپەژ- papej): زەوی بەرزو نزم و ناهەموار، گڵی کۆن و نەرم. پاخوا قوڕ.
**پاپوش**- ا(پاپووش- papûş): پێــڵاو، هەر شتێک پێ بپۆشێ، هەر شتێک لە پێ بکرێ، پاپوج، نەعل.
**پــاپــوش دوخــتن**- مــص.ک(پــاپــووش دووختــەن- papûş dûxten): پیــلان گێڕان.
**پاپیتال**- ا(پاپیتال- papîtal): جۆرە گیایەکە.
**پاپیچ**- ا.ص(پاپیچ- papîç): پێتاوە، پێپۆش، کاڵەو زەنگاڵ.
**پاپیــروس**- ا(پاپیــروس- papîrûs): جۆرە گیایەکە.
**پاپیـــــون**- ا(پاپیـــــون- papîyûn): پەروانە، پەپوولە، جـۆرە بـۆینبـاغـێکە لە شێوەی پەپولەدا.
**پاتابە**- ا(پاتابە- patabe): پێــتــاوە، پاتاوە.
**پــاتلە**- ا(پاتــیلە- patile): پاتــیلە، مەنجەڵ، مەنجەڵی بچووک.
**پاتــوە**- ا(پاتــووە- patûwe): پاتــاوە، پێتاوە.
**پــاتــوغ**- ا(پــاتــوغ- payûx): پــاتــۆق، شوێنی خڕبوونەوە، مەقەڕ، بنکە.
**پاتیل**- ا(پــاتیل- patîl): مــەنجــەڵ، پاتیلە.
**پاجــامــە**- ا(پاجــامــە- pacame): بیجامە، بیژامە. جلیماڵەوە.
**پاجـــــوش**- ا(پاجـــــووش- pacûş): پاجــۆش، ئەو لقــە باریکەی لە بنی دار دەردەچێت.
**پاچال**- ا(پاچال- paçal): پێــچــاڵ، قوڵکەی بن پێی جۆلا.
**پاچایە**- ا(پاچایە- paçaye): پیــسی، گلاوی، میز، گوو.
**پاچراغ**- ا(پاچیراغ- paçirax): شوێنی چرا، شــوێنێ کــە لە تەکــیــەو مــزگــەوت و زۆرخانەدا چرای تیا دابنرێ و هەڵبکرێ.
**پاچک**- ا(پاچەک- paçek): تەپاڵە، سەرگین، لاس.
**پــاچــنــگ**- ا(پــاچــەنــگ- paçeng): کلاورۆژنە، دەریچە، کونی دیوار.
**پاچە**- ا(پاچە- paçe): کــەللەپاچە، سەروپێ.
**پاچەورمــالیــدە**- ص(پاچەڤــەرمــالیــدە- paçevermalîde): فێڵباز، زرینگ، زۆردار.
**پاچیــدن**- مص(پاچیــدەن- paçîden): پێداپرژان، پێداڕشتن.
**پــاچــیــلــە**- ا(پــاچــیــلــە- paçîle): مصحەف.
**پاچین**- ا(پاچین- paçîn): ئاوەڵکراس، تەنورەی چینداری ژنانە.
**پاخــــــرە**- ا(پاخــــــەرە- paxere): بەرهەیوان، بەرتاق.
**پاد**- ا(پاد- pad): پاسەوان، نیگابان،

دژ، تەخت، جێی نووستن.
**پادار**- ص(پادار- padar): پایەدارو بەرقەرار، ئابڕومەند، وەفادار، دەوڵەمەند،
**پادار**: (پادار بگرە، بێ پا هی خۆمانە).
**پاداش**- ا(پاداش- padaş): پاداشت، قەرەبوو، تۆڵەی چاکە.
**پاداشن**- ا.مص(پاداشەن- padaşen): پاداشت، رۆژی قیامەت، پەسلان.
**پادام**- ا(پادام- padam): داو، پاداو، تەڵە، تەپکە.
**پادراز**- ا(پادەراز- paderaz): پادرێژ، مەلێکی ئامال سووری لاق درێژی دەنووک خـــوارە لە گـــوێ ئاوو زەلکاوان دەژێ و ماسی دەخوا.
**پادرخـــــــتی**- ص(پادیرەخـــــــتی- padirextî): مـیـوەی باوەرێن، مـیـوەی کـرمـۆڵی باوەرێن، کـە دەکـەوێتـە بنی درەختان.
**پادرهوا**- ص.ک(پادەرهەڤـــــــــا- paderheva): بێ بنج و بناوان، بێ بناغە، قسەی قۆڕو بێ بناغە.
**پـادری**- ا(پـادەری- paderî): ئـەو فەرشەی لەبەر دەرگا رادەخرێ، ئەو بەردەی کە دەیدەنە بەر دەرگا تا با نەیجولێنێ.
**پـادزهـر**- ا(پـادزەهـر- padzehir): ئەنتی ژەهر، دژە ژەهر، تلیاک، بەنگ.
**پادشاه**- ا(پادشاه- padşah): پاشا، فەرمانڕەوای دەسەڵاتداری خودان تەخت و تاج، مەلیک، میر، حوکمڕان.
**پادگـــان**- ا(پادیگان- padigan): دەســتــە پیـــادەی ســەربازی ســەردەمی ساسانیان، ساخلو، قشڵە.
**پادگـانە**- ا(پادیگانە- padigane):
سەربان، پەنجەرە، دەلاقە.
**پادنگ**- ا(پادینگ- pading): دینگی برنج کوتان، سندۆڵ، چاڵک.
**پادو**- ا.ص(پادەو- padew): شاگرد، کەسێک بە پێیان بەدووی کاراندا دەچێت، وەکو شاگردی موغازان و نانەواخانە.
**پادە**- ا(پادە- pade): مـــێگەل، پەز، گاگەل و، لەوەڕگە، دارعاسا.
**پادەبان**- ص. ا(پادەبان- padeban): شوان، پاسەوان، نیگابان.
**پادیاب**- ا(پادیاب- padyab): دوعـا خـــوێندن، بە مـــەبەســـتی پاک بوونەوەی شتان.
**پادیاو**- ا(پادیاو- padyaw): پادیاب.
**پادیر**- ا.ص(پادیر- padîr): دیرەک، کـۆڵەکـە، ئەو ئەســتــوونەی دەدرێتــە بەر دیواری خوار بوو تا نەڕوخێت، پشتەوانە.
**پاراتیـــروئیـــد**- فــر. ا(پاراتیـــروئیـــد- paratîrû'iyd): غودەی سەرو دەرەقی.
**پارازیت**- فــر.ا(پارازیت- parazît): مفتەخۆر، مشەخۆر.
**پاراشـوت**- ا(پاراشـوت- paraşût): پەڕەشتووت.
**پاراف**- فـر.ا(پاراف- paraf): ئیـمـزا، واژوو.
**پارافین**- فـــر. ا(پارافین- parafîn): رۆنی گەنەگەرچەک، دەرمانی عەمەل.
**پاراگـــــراف**- فـــر. ا(پاراگـــــراف- paragraf): پەرەگراف، بەند، بڕگە.
**پارالل**- (پارالەل- paralel): هێــڵــی هاوتەریب، هاوتەریب.
**پارانشـــــیم**- فـــر. ا(پارانشـــــیم- paranşîm): بەشی چالاکی ئەندامی

غودەیی.
**پاراو**- ص(پاراو- parav): پیـــــر، پیرەژن، پیرەمێرد.
**پاراوان**- فـر.ا(پاراڤـان- paravan): ناوبەند، دیوارێکی بزۆز کـەلە تەختـەو قـومـاش دروس بکرێ، بۆ جـیـاکـردنەوەی بەشێک لە ژوورێک یان دوکانێک، تیغە.
**پارتی**- فـر. ا(پارتی- partî): بەش، دەسـتـە، گـروپ، کـۆمـەڵە، لایەنگر، پشتیوان.
**پارتیزان**- فر. ا(پارتیزان- partîzan): لایەنگر، پێشمەرگە، بارتیزان.
**پارچ**- ا(پارچ- parç): قـــاپی ئـاو خواردنەوەی گەورەی دەم پەل.
**پارچە**- ا(پـارچـە- parçe): پـارچـە، قوماش، پارچە بەرد، پاژ، لەت.
**پاردسو**- فر.ا(پاردسو- pardsû): جبە، جلێک کە لەسەر جلی ترەوە لەبەر دەکرێت، جلێک کە وەکو پاڵتۆیە.
**پاردم**- ا(پاردوم- pardum): پـاڵـدو، پاڵدم، پالو، پاردو، پاردن.
**پارس**- ا(پارس- pars): وەڕینی سەگ، حەپین، حەپەی سەگ، سەگوەڕ.
**پارسـا**- ص(پارسـا- parsa): دیندار، خواناس، دوورەگوناح، بەدین.
**پارســای**- ص(پارســای- parsay): بڕوانە: (**پارسا**).
**پارســال**- ا(پارســال- parsal): پار، ساڵی رابردوو.
**پــارس ئــیــل**- ا. ت(پــارس ئــیــل- pars'îl): ساڵی پڵنگ.
**پارسنگ**- ا(پارســەنگ- parseng): پارسەنگ.
**پارسە**- ا(پارسە- parse): دەرۆزەکردن، دەرۆزە، سواڵ.
**پــارســی**- ص.ن(پــارســی- parsî): خـــەڵکی پارس، فـــارسی، ئێـــرانی، زەردەشتی دانیشتووی هیندوسان.
**پارشــمــیــنە**- فــر.ا(پارشــومــیــنە- parşumîne): پێـست ئـاسـا، وەکـو پێست.
**پارک**- فـــر.ا(پارک- park): پارک، سـەیرانگە، باخی گـەورەی پڕ درەخت بۆ پیاسەو گەڕان و سەیران، پارک.
**پارکـە**- فـر. ا(پارکـە- parke): داد سەرا.
**پارگین**- فـــر. ا(پارگین- pargîn): زێراب، زەڵکاو.
**پارلمان**- فر. ا(پارلومان-parluman): پەرلەمان، ئەنجوومەنی نیشتمانی.
**پارلمانتــر**- ا.فــر(پارلومــانتــیــر- parlûmantêr): ئەندامی پەرلەمــان، پەرلەمانتار.
**پــارنج**- ا(پــارەنج- parenc): هـەقـی هاتن، ئەو پارەیەی دەدرێ بە شـــایەرو گۆرانی بێژان تا لە ئاهەنگ و شاییان حازر بن.
**پارنجن**- ا(پارەنجــەن- parencen): خڕخاڵ، پاوانە، حەجل.
**پارو**- ا. ا(پاروو- parû): ســـەوڵ، بەفرماڵ.
**پـــاروب**- ا. ا(پـــارووب- parûb): سەوڵ، بەفرماڵ، بێڵی دارین.
**پارە**- ا.ص(پارە- pare): پاژ، پارچە، بەش، پینە، پوول و پارە، بەرتیل، خـاوە، رەشوەت.

**پارەدوز**- ص. فــــــــا (پارە دووز- paredûz): پینەدۆز، پینەچی.
**پارەزرد**- ا(پــارەزەرد- parezerd): پارچەیەکی زەردە کە جولەکەکان لە کۆندا، بۆ خۆ جیاکردنەوە لە موسڵمانان، بەسەر شانی خۆیانەوە دەدوری.
**پاریا**- فر. ا(پاریا- parya): چینێکی کۆمەڵایەتیین لە هندوستان.
**پاریـاب**- ا(پـاریـاب- paryab): کشتوکاڵی بەراو.
**پارین، پارینە**- ص.ن(پارین، پارینە- parîn, parîne): کـۆن، دێرین، هی پار.
**پازاج**- ا(پازاج- pazac): مامان.
**پازن**- ا(پازەن- pazen): نێـری، بزنە کێوی.
**پازند**- ا(پازەند- pazend): چیلکە بخرێتە سەر ئاگر تا گڕ بگرێ، دەسەچیلە.
**پازهری**- ص(پازەهری- pazehrî): سەوزی تۆخ.
**پازخ**- ا(پازەخ- pazex): ئازار.
**پاژنـگ**- ا(پـاژەنـگ- pajeng): هێشووی ترێ، بۆڵی ترێ.
**پاژە**- ا(پاژە- paje): شپرزە، هەراسان.
**پاس**- ا(پاس- pas): بەش، بەشێک لە شەو یان لە رۆژ، پاژ، پاسەوانی، حورمەت.
**پاس**- فر.ا(پاس- pas): پاس پاسێن لە یاری فوتبۆڵدا، گوزەر، پەڕینەوە.
**پاسارکردن**- مص(پاسارکەردەن- pasarkerdne): پایەمـاڵ کـردن، پێشێلکردن.
**پاساژ**- فـر. ا(پاساژ- pasaj): قەیسەری، رێبازگەی سەخت و دژوار.

**پاسبان**- ا. ص(پاسبان- pasban): پاسەوان، نیگابان، حەرەس، حەسحەس، یاساوڵ، قەرەوڵ.
**پاسبانی**- ا. مص(پاسبانی- pasbanî): پاسەوانی، نیگابانی.
**پاسبخش**- ا. فـا(پاس بەخش- pasbexş): مـامـووری گـۆڕینی پاسەوانان.
**پاسپار**- ص. مف(پاسپار- paspar): پێ خوست، پێ شێلکراو.
**پاسپورت**- فـر.ا(پاسپورت- paspûrt): پاسەپۆرت، گوزەرنامە.
**پاستوریزە**- فـر.ا. مف(پاستوریزە- pastûrîze): پاستورێندراو، ئەو شتەی کە بە گوێرەی رێبازی زانستی پاستور، میکرۆبی تیا نەهێڵرابێ.
**پاسخ**- ا(پاسوخ- pasux): وەڵام، بەرسڤ.
**پاسخانە**- ا.م(پاسخانە- pasxane): پاسەوانخانە، یاساوڵخانە.
**پاسدار**- ا.ص(پاسدار- pasdar): پاسەوان، نیگابان، حەرەس، چاودێر.
**پاسداری**- ا.مص(پاسداری-pasdarî): پاسەوانی، نیگابانی، رێز، حورمەت، رێزگرتن.
**پاسک**- ا(پاسک- pask): باوێشک، باووشک.
**پاسگاە**- ا.م(پاسگاە- pasgah): جێی پاسەوانان، شوێنی حەرەسیات گرتن.
**پاسنگ**- ا(پاسەنگ- paseng): پارسەنگ.
**پاسور**- ا(پاسوور- pasûr): جـۆرە گەمەیەکی وەرەقە.

**پاسـیـار**- ا(پاسـیـار- pasyar): سەرهەنگی ئاسایش.

**پاسیدن**- مص(پاسیدەن- pasîden): پاسکردن.

**پاشا**- ا(پاشا- paşa): نازناوێکی لەشکری و کارگێڕییە کە سوڵتانانی عوسمانی دەیاندا بە مەسئوولانی ژێر دەستی خۆیان.

**پاشنگ**- ا(پاشەنگ- paşeng): هێشووەترێ، بۆڵەترێ.

**پاشنه**- ا(پاشنە- paşne): پاژنەی پێ، پاژنوو، پاینەی پا.

**پاشویه**- ا(پاشوویە- paşûye): ئاوی گەرمی خاڵیسە، یان ئاوی گەرمی خوێیاوی بۆ شۆردنی پێی نەخۆش، شوێنی پێ شتن لە قەراخی حەوز.

**پاشیب**- ا(پاشیب- paşîb): پلە، پێپیلکەی ئاوی حەوز.

**پاشیدن**- مص(پاشیدەن- paşîden): وەشاندن، رشتن، تۆودان.

**پاشنده**- ا. فا(پاشندە- paşinde): رشێنەر.

**پاشان**- ص. فا(پاشان- paşan): لە حاڵی رشتندا.

**پاشیده**- ا. مف(پاشیدە- paşîde): رژاو، بڵاوکراو.

**پاشیر**- ا(پاشیر- paşîr): حەوزی ژێر شێرەی ئاو.

**پاغر**- ا(پاغەر- paxer): کۆڵەکە، ئەستون.

**پاغره**- ا(پاغورە- paxure): نەخۆشییەکە دەبێتە هۆی ئاوسانی پێ، داء الفیل.

**پاغند**- ا(پاغوند- paxund): گلۆڵە.

**پاغوش**- ا(پاغوش- paxûş): خۆنقوم کردن لە ئاو.

**پافشاری**- ا.مص(پافیشاری- pafişarî): پێ داگرتن، سووربوون، عینادی.

**پافشردن**- مص(پافەشوردەن- pafeşurden): پێ داگرتن، سووربوون.

**پاک**- ص(پاک- pak): پاک، بێ غەل و غەش، نوێژی داوێن پاک، دیندار.

**پاک**- ا(پاک- pak): جەژنێکی ساڵانەی جولەکەیە، جەژنێکی ساڵانەی مەسیحیانە.

**پاکار**- ا.ص(پاکار- pakar): خزمەتکار، وەرزێر، سەپان، نۆکەر، شاگرد وەستا.

**پاکباز**- ص(پاکباز- pakbaz): قوماربازێک کە هەرچی هەیە دۆڕاندبی، ئاشقی پاک، خواناس، تەرکەدنیا.

**پاکت**- فر. ا(پاکەت- paket): زەرفی نامە، پاکەتی جگەرە، زەرف.

**پاکتن**- ص(پاک تەن- pak ten): خواناس، پاک، پاکژ.

**پاکدامن**- ص. ک(پاکدامەن- pakdamen): پاک، خواناس، نەجیب، داوێن پاک.

**پاکدل**- ص(پاک دیل- pakdil): دڵپاک، بێ حیلەو حەواڵە، بێ غەل و غەش، بێ بوغزو کینە.

**پاکرای**- ص(پاکە رای- pakeray): دانا، خاوەن بیری پاک، پاکفیکر.

**پاکـــرو**- ص. فـــا (پاکرو- pakrû): خواناس، پاک.

**پاکـــــــروان**- ص(پاک رەڤـــــــان- pakrevan): ویژدان پاک، بەئینساف، دەروونپاک، داوێن پاک.

**پاکـــزاد**- ص(پاکـــزاد- pakzad): نەجیب، رەسەن، حەڵاڵزادە، خانەدان.

**پاکســرشت**- ص(پاک ســیــریشت- paksirişt): پاک سـروشت، ئەسـیـڵ، ئەسڵزادە.

**پاکگـــهــــر**- ص(پاک گـــوهـەر- pakguher): پاکنـەژاد، حـــەڵاڵزادە، نەجیب، پاک جەوهەر.

**پاکند**- ا(پاکەند- pakend): یاقوت.

**پاک نژاد**- ص(پاک نیژاد-paknijad): پاک جەوهەر، ئەسڵزادە، نەجیب.

**پاکنویس**- ا(پاک نویس- paknivîs): پاکنووس، نـووســـینەوەی دووەم لەســـەر رەشنووس.

**پاکنه**- ا(پاکەنە- pakene): پلە، جێی پا لە ناو کـــارێز، یان بیـــردا، پاکـــەنە، پاکورە.

**پـاک نـهـــــــاد**- ص(پاک نـەهـاد- paknehad): خانەدان، ئەسڵزادە، پاک سروشت، جەوهەرپاک.

**پاکـــوب**- ص(پاکـــووب- pakûb): پێکوت، هەر شتێ لە بن پێیـان بکوترێ، سەماکەر.

**پاکوتاه**- ص(پاکوتاه- pakûtah): پێ کورت، پێ کوڵ.

**پاکـــوفتن**- مص(پاکـــووفـــتـــەن- pakûften): هەڵپەرکێ، شایی، سەما، رەقسین، پێ بە عاردا دان.

**پای کـــوبان**- ص. فـــا (پای کـــووبان- paykûban): هەڵپەڕین.

پاکـوبی- ا.مص(پایکوبی- pakûbî): هەڵپەڕکێ.

**پـــایــکـــوبــی**- ا.مـص(پـــایــکـــوبـــی- paykûbî): هەڵپەڕکێ.

**پاکی**- ا. ا(پاکـی- pakî): تیـــــغـی سەرتاشین.

**پاکیـزه**- ص(پاکیـزە- pakîze): پاک، خاوێن، تەمیز، بێ غەل و غەش.

**پاکـــیـــزه تخم**- ص(پاکـــیـــزە توخم- pakîzetuxm): حەڵاڵزادە.

**پاگـاه**- ا(پاگـاه- pagah): جێی پێ، ئاسـتـانە، دەرگا، شوێن، پلەو پایە، قەدرو حورمەت.

**پاگـــرفتن**- مص(پاگـــیـــریفـــتـــەن- pagiriften): گـەشـەکـردن، پێ گـرتن، دەوام پەیداکردن، بەهێزبوون.

**پاگـــشـــا**- ا(پاگـــوشـــا- paguşa): پاکـــرانەوە، دەعـــوەتـی بوک و زاوا لـەلایەن کەس و کاری بوک یان زاوا، پاش هەفتەی یەکەمی زەماوەند، باوەخون.

**پـاگـن**- ا(پـاگـــــــــون- pagun): کەتافییە، سەرشان کە بە جلی سوپاییانەوە دەدورێ.

**پالائیـدن، پالاییـدن**- مص(پالاییـدەن- palayîden): پاڵاوتن، بێژتن.

**پالایش**- ا. مص(پالاییش-palayiş): پاڵاوتن.

**پـالایـنـده**- ا. فــــــــا (پـالایـەنـدە- palayende): پاڵێوەر، بێژەر.

**پـالایـیـــــده**- ا. مف(پـالاییـــــــدە- palayîde): پاڵێوراو، پاڵاوتە.

**پـــالا، پـــالای**- ا(پـــالا، پـــالای- pala, palay): هەراو هەنگامـــــە، دادوبێداد، ئاژاوە.
**پالاپال**- ا. مص(پالاپال- palapal): هەراو هەنگامە، ئاژاوە، گەڕان، تاقیب، گـەڕان بەناو شـتی پەراگـەندەو تێکەڵ و پێکەڵدا.
**پـــالاد**- ا(پـــالاد- palad): پـــەلاس، بەڕەکۆن، پارچەی رەشماڵ، کوێن.
**پـــالان**- ا(پـــالان- palan): پـــالان، کورتان، کۆپان.
**پالانی**- (پالانی- palanî): باربەر، بارگیر، بارگین، ولاخێ کە باری بووبێ.
**پـــــالاندوز**- ا. ص(پـــــالان دووز- palandûz): کـورتاندروو، وەسـتـای کۆپان.
**پالاون**- ا(پالاڤـــــەن- palaven): سۆزگی،پلاوپالێو، سوزمە.
**پالاهنگ**- ا(پالاهەنگ- palaheng): هەوسار، رەشمە، جلەو.
**پالایش**- ا.مص(پالاییش- palayîş): پالاوتن.
**پـالایـشـگـاه**- ا. م(پـالایـشـگـاه- palayişgah): پالاوتنخـانە، شـوێنی پالاوتن، پالاوتگە.
**پالایشگر**- ص. فـــا(پالاییشگـــەر- palayişger): پالاوتنکار.
**پالئـــوگـــرافی**- ا(پالیـــوگـــرافی- palyugrafî): زانسـتی خـوێندنەوەی خەتێن کۆن.
**پالئـــونتـــولوژی**- (پالیـــونتـــولوژی- paliyuntulujî): دێرینەناسی.
**پالتو**- فـر.ا(پالتـوو- paltû): پالتـۆ، ساقۆ، پاڵتاو.
**پـالـش**- ا. مـص(پـالـش- paliş): پالاوتن.
**پالشگـاه**- ا. م(پـالیـــــــشگـاه- palîşgah): پالاوتنخانە.
**پالخ**- ا(پـالـوخ- palux): پـەیمانـەی شەراو خواردنەوە.
**پالکانه**- ا(پالکانـە- palkane): دەلاقــە، بالەکــۆنە، بانیــژە، پەنجــەرە، هەورەبان.
**پالکی**- ا(پالەکی- palekî): کەژاوەی بێ ئاسمانە.
**پالنگ**- ا(پالەنگ- paleng): پێڵاو.
**پالو**- ا(پالوو- palû): بالوکە.
**پـــالـــوازه**- ا(پـــالـــوازە- palvaze): جۆلانە، دەیدیک، دیلەکانی، لەیلووک، هەرەزانی.
**پالواسه**- ا(پالواسە- palvase): غەم، پەژارە، تاسە.
**پالوانه**- ا(پالڤـــــانە- palvane) پەرەسێلکە، پلسری.
**پالودن**- مص(پالوودەن- palûden): پالاوتن، لە بێژنگدان.
**پـالـوده**- ا. مـف(پـالـودە- palûde): پالێوراو، لە بێژنگدراو.
**پالوده**- ا(پالودە- palüde): فـالودە، جۆرە بەستەنییەکە.
**پالوش**- ا(پالوش- palûş): کـافـوری غەش لێکراو.
**پالونه**- ا(پالوونە- palûne): سـوزمـە، سوزگی.
**پالهنگ**- ا(پالەهەنگ- paleheng): کەمند، هەوسار، پەت، رەشمە.

**پیچە**- ا(پیچە- pîçe): رووبەند، پێچە، پەچە.

**پیچی ئیل**- ا. ق(پیچی ئیل- pîçî ‘il): ساڵی مەیموون، نۆیەم ساڵی، دەورەی ١٢ ساڵەی تورکییە.

**پیچیدن**- مص(پیچیدەن- pîçîden): بادان، پێچ خواردن، لولدان.

**پیچش**- ا(پیچیش- pîçiş): خواربوون، پێچخواردن، ئاڵۆسکان.

**پیچان**- ص. فا(پیچان- pîçan): پێچانەوە، بە پێچ و دەورە، ئاڵۆسکاو.

**پیچیدە**- ا. مف(پیچیدە- pîçîde): ئاڵۆسکاو، پێچ خواردوو، ئاڵۆز، پێچراو.

**پیخ**- ا(پیخ- pîx): ریپۆق، ریقنە، پیسی، ریتق،چڵک، پۆخڵ.

**پیخال**- ا(پیخال- pîxal): پیسایی، تەرس، ریخ، چڵک، پۆخڵ.

**پیختن**- مص(پیختەن- pîxten): پێچانەوە، دابەشکردن، لولدان.

**پیخست**- ا. مف(پەی خەست- peyxest): پێخوست، پێ پەست، پێشێل.

**پیخستە**- ا. مف(پەی خەستە- peyxeste): پێ خوست، پێ پەست، پێشێل، پایەماڵ، وەبن پێ نراو.

**پیدا**- ص(پەیدا- peyda): دیار، ئاشکرا، روون، لەبەر چاو، کفش.

**پیداکردن**- ص(پەیدا کەردەن- peyda kerden): پەیدا کردن، ئاشکرا کردن، دیاریکردن، دۆزینەوە، روون کردنەوە، کفش کرن.

**پیداشدن**- مص(پەیدا شودەن- peyda şûden): پەیدابوون، ئاشکرا بوون، دەرکەوتن، دیاربوون، ئامادەبوون، دروست بوون، کفش بوون.

**پیدازا**- ص. فا(پەیدا زا- peyda za-): بارز التناسل، هەر گیایەک ئامرازی زاوزێی دیار بێ، ئاشکرازێ.

**پیداوسی**- ا(پەیداڤەسی- peydavesî): جۆرە دراوێکی زۆر کۆنە.

**پیدایش**- ا(پەیداییش- peydayiş): دەرکەوتن، پەیدابوون، دروست بوون.

**پیر**- ص(پیر- pîr): گەورە، بەتەمەن، بەساڵاچوو، رێبەر، شێخ، پیری تەریقەت، عەمەل مەندە، ئیختیار.

**پیرار**- ق(پیرار- pîrar): پێرار.

**پیراستن**- مص(پیراستەن- pîrasten): رازانەوە، جوانکردن، مشتوماڵ دان، پەرچکردنی دارو درەخت.

**پیرایش**- ا. مص(پیراییش- pîrayîş): رازانەوە، تاشین، جوانکاری، پەرچ کردن، خۆشەکردنی پێست، مشتوماڵ دان.

**پیرایندە**- ا. فا(پیرایەندە- pîrayende): ئارایشکەر، رازاندنەوەکار.

**پیراستە**- ا. مف(پیراستە- pîraste): رازاوە، خۆشەکراو، لق و پۆکراو.

**پیرامن**- ا(پیرامون- pîramun): دەوروبەر.

**پیرامون**- ا(پیراموون- pîramûn): دەوروبەر.

**پیرامید**- ا.فر(پیرامید- pîramîd): قوچەک.

**پیرانەسر**- ا(پیرانەسەر- pîraneser): سەری پیری، رۆژانی پیری، رۆژگاری

پیری، قۆناغی پیری.

**پیــــراهن**- ا(پیـــــراهەن- pîrahen): کراس.

**پیــرایه**- ا(پیــرایه- pîraye): ئارایش، ســەرتاشین، لق و پۆپ کــردنی درەخت، خشڵ، تۆمەت و ئیفتیرا.

**پیرزال**- ص(پیرزال- pîrzal): زۆرپیر، زیاتر بۆ پیرێژنی سەرسپی دەگوترێ.

**پیــرو**- ص(پیــرو- pîrû): پیــری ئەندام وردیلە.

**پیــروی**- ا.مص(پەیرەڤی- peyrevî): پەیڕەوی کــردن، دوکــەوتن، چاولێکردن، بەدودا ڕۆییشتن، بە گوێ کردن.

**پیـــــــروز**- ص(پیـــــــروز- pîrûz): سەرکەوتوو، زاڵ، باڵادەست، شاد، پیرۆز، موبارەک، بەختەوەر.

**پیــروزه**- ا(پیــروزه- pîrûze): پیــرۆزە، ئاسمان، شین.

**پیرومـتـر**- (pîrûmetir): پیــرۆمیــتـر، گەرماپێو.

**پیـــــزر**- ا(پیـــــزور- pîzur): پوش، قامیشی باریک، زەل، شول، تەڕکە.

**پیـــــزری**- ص(پیـــــزوری- pîzurî): سەبەتەی لە پوش دروستکراو، بەرەڵایی، زەبوونی، بێ دەستەڵات، گەواد.

**پیس**- ص(پیس- pîs): نەخۆشییــەکی پێستە، بەڵەک، دوو ڕەنگ، بازگ.

**پیسی**- ص(پیسی- pîsî): بەڵەکی.

**پیس**- فر. ا(پیەس- pîyes): پییەس، نمایشنامە، شانۆگەری.

**پی‌ســـپــــار**- ص. فــا(پەی ســـپـــار- pey sipar): ڕێبوار، ڕێ بڕ، ڕێبار.

**پی‌ســپــر**- ص. فــا(پەی ســـپـــەر- peysiper): ڕێبوار، ڕێ بڕ، ڕێبار.

**پیست**- ا. فر(پیست- pîst): مەیدانی پێشبڕکێ، شوێنی ئامادەکراو بۆ وەرزش یان سەما.

**پیستوله**- ا. فر(پیستوله- pîstûle): دەمانچە.

**پیـــســـتــون**- ا(پیـــســـتــون- pîstûn): پیستۆن.

**پیســه**- ا(پیســه- pîse): پەڵە، خـاڵ، بازگ، ئەبڵـەق، بەڵەک، پوڵ، دراو، پارەی نەغد.

**پیش**- ق(پیش- pîş): پێش، بەردەم، نوا.

**پیشاپیش**- ق(پیشاپیش- pîşa pîş): پێشی پێشــەوە، پێشــتــر لە هەمــووان، سەرجەلە، پێشڕۆ.

**پیشتر**- ا(پیشتەر- pîşter): پێشتر، پێشوتر.

**پیشاب**- ا(پیشاب- pîşab): پێشاو، دەست بە ئاو گەیاندن، میزتن و ڕیتن.

**پیـــشــــادست**- ا(پیـــشــــادەست- pîşadest): بێــعـــانە، هەقــدەســتی پێشوەختە، بێع، پێشەکی سەودا، پێش بەها.

**پیش آگـــــهی**- ا(پیش ئاگـــــاهی- pîş agahî): ئاگـــــاداری نـامـــــە، ئاگادارکردنەوەی پێشوەختە.

**پیش آمـــــد**- ا(پیش ئامـــــەد- pîş amed): قــەومــاو، کــارەســات، ڕووداو، پێشهات.

**پیش آمـدگی**- ا. مص(پیش ئامەدەگی- pîş amedegî): تەجاوز، زمانە.

**پیشانی**- ا(پیشانی- pîşanî): نێوچەوان، تەوێڵ، ناوچەوان، بەخت، یەغباڵ، تالح.

**پیشاهنگ**- ص(پیش ئاهەنگ- pîş aheng): پێشەنگ، پێشڕەوی لەشکر، سەر قافڵە، سەرجەلەکێش.

**پیشاهنگی**- ا. ص(پیش ئاهەنگی- pîş ahengî): پێشەنگی، پێشڕەوی، سەرجەلەکێشی.

**پیشباز**- ا(پیش باز- pîşbaz): پێشواز، پێشکراوە، چوونە پێشوازی.

**پیش بند**- ص. فا(پیش بەند- pîşbend): بەرکۆش، بەرهەڵبێنە، کۆسپی بەردەم، پێشگیر.

**پیش بها**- ا(پیش بەها- pîşbeha): بێعانە، هەقدەستی پێشوەختە، پێشەکی سەودا.

**پیش بین**- ص. فا(پیش بین- pîşbîn): پێش بین، بە ئاوەز، دانا، کەسێک کە پێشبینی ڕووداوان بکات، لێزان.

**پیش بینی**- ا. مص(پیش بینی- pîşbînî): پێشبینی، لێزانی.

**پیش پرداخت**- ا(پیش پەرداخت- pîş perdaxt): پێشەکی، پارەیەک کە لە بری هەقدەست یان مووچە یان بەهای کالا پێشەکی بدرێت.

**پیش پرده**- ا(پیش پەردە- pîş perde): گۆرانییەک کە لە شانۆدا بەر لە لابردنی پەردە بگوترێ، پێش پەردە.

**پیشتاز**- ص. فا(پیشتاز- pîştaz): سەرقافڵە، پێشەنگ، پێشڕەو.

**پیشخانه**- ا(پیشخانە- pîşxane): هەیوان، پێشخانە، باروبنەی سەفەری گەورە پیاوان کە لە پێشەوە ببرێ.

**پیشخدمت**- ص(پیش خیدمەت- pîş xidmet): پێشخزمەت، پێشکار، نۆکەری بەردەستان، بەردەست.

**پیش خرید**- ا. مص(پیش خەرید- pîşxerîd): کڕینی کالایەک کە هێشتا ئامادەنییە، پێشکڕین.

**پیشخوان**- ا. مص(پیش خان- pîşxan): مێزی بەردوکانان کە دوکانداران لە پشتییەوە دەوەستن، پێش خوان.

**پیشخور**- ا. مص(پیش خور- pîşxûr): پێشخۆر، لە پێشدا خوراو، سلفە، زرعاتی بەشینی فرۆشیاو، بەسەلەمدراو.

**پیشخورد**- ا.مص((پیش خورد- pîşxûrd): بەرکوڵ، هەر سوکە خواردنێک کە بەر لە خواردنی ئەسڵی بخورێ.

**پیش درآمد**- ا(پیش دەرئامەد- pîş der amed): پێشەکی، ئاهەنگێکی موسیقی بەر لە دەست پێکردنی گۆرانی.

**پیشدستی**- ا.مص(پیش دەستی- pîşdestî): دەست پێشکەری.

**پیشدستی**- ا(پیش دەستی- pîşdestî): دەوری بچووکی بەردەست، پێشدەستی.

**پیش رس**- ص. فا(پیش رەس- pîşres): میوەی زوو رەس، کەسێک زووتر لە خەڵکی بگاتە مەنزڵ.

**پیشرفت**- ا. مص(پیش ڕەفت- pîşreft): تەرەقی، هەڵدان، چوونە پێش.

**پیشرو**- ص. فا(پیشرەو- pîşrew): پێشڕەو، پێشەنگ، سەر قافڵە، ڕەمکێش، پێش قەرەوڵ.

**پیش فروش**- ا(پیش فرۆش- pîşfurûş): پێش فرۆش، فرۆشتنی بەر لە پێ گەییشتن.

**پیش فنگ**- ا(پیش فەنگ- pîşfeng): سەلام خوز.

**پیشکار**- ا. ص(پیشکار- pîşkar): کاربەدەستی خان و ئاغا، پێشکار، خزمەتکار، نۆکەر، گزیر.

**پیشکش**- ا(پیشکەش- pîşkeş): دیاری، پێشکەش.

**پیشکی**- ا(پیشەکی- pîşekî): پێشەکی، کرێ لە پێش کاردا.

**پیشگاه**- ا. م(پیشگاه- pîşgah): بەرهەیوان، ئاستانە، دەرگا، سەرووی مەجلیس، تەخت.

**پیشگو**- ص. فا(پیشگو- pîşgû): پێشگۆ، کەسێک کە پێشبینی ئایندە بکات، عەڕاف، عارفە.

**پیشگیری**- ا. مص(پیشگیری- pîşgîrî): پێش گرتن، پێشگیری لە نەخۆشی.

**پیشن**- ا(پیشەن- pîşen): ئەو حەبلەی لە ریشاڵی خورما دروستدەکرێ.

**پیش نشین**- ص. فا(پیش نیشین- pîşnişîn): مامان، دانیشتن لای کەسێک یان شتێک.

**پیش نماز**- ص. ا(پیش نەماز- pîş nemaz): پێش نوێژ، ئیمامی جەماعەت.

**پیش نویس**- ا(پیش نیڤیس- pîşnivîs): پێشنووس.

**پیشنهاد**- ا(پیش نیهاد- pîşnihad): پێشنیاز.

**پیشوا**- ص(پیشڤا- pîşva): پێشەوا، ڕێبەر، سەرۆک، پێشڕەو.

**پیشواز**- ا(پیش ڤاز- pîşvaz): پێشواز، پێشوازی ڕێبوار یان میوان.

**پیشه**- ا(پیشە- pîşe): پیشە، سەنعەت، عادەت، خوو.

**پیشەور**- ص(پیشەڤەر- pîşever): پیشەوەر، پیشەکار، سەنعەتکار، پیشەگەر.

**پیشیار**- ا. ص(پیشیار- pîşyar): پێشکار، خزمەتکار، نۆکەر، بەکرێ گیراو، شاگرد، یاریدەدەر.

**پیشیار**- ا(پیشیار- pîşyar): پێشاو، میز، ئەو شوشەیەی کە میزی تێ دەکرێ و دەبرێتە لای دکتۆر بۆ فەحس.

**پیشیاره**- ا(پیشیارە- pîşyare): خوانچەو سینی کە خواردنی لەسەر دابنەن و بۆ مەجلیسی میوانی ببەن.

**پیشین**- ص.ن(پیشین- pîşîn): پێشین، کۆن، دێرین.

**پیشینیان**- ا(پیشینیان- pîşînan): پێشینان.

**پیشینگاه**- ا(پیشینگاه- pîşîngah): نوێژی نیوەڕۆ، وەختی نوێژی نیوەڕۆ.

**پیشینه**- ص. ن(پیشینە- pîşîne): پێشینە، دێرینە، کۆنە.

**پیشینگان**- ا(پیشینگان- pîşîngan): پێشینان، باب و باپیران.
**پیغاره**- ا(پەی غارە- peyxare): لۆمە، سەرزەنیشت، گلەیی و گازاندە.
**پیغاله**- ا(پەی غالە- peyxale): پیالە، جام، بادەی شەرابخۆری.
**پیغام**- ا(پەی غام- peyxam): پەیام، نامە، قسەیەک لە کەسێکەوە بۆ کەسێک بنێردرێ.
**پیغامبر**- ا. ص(پەیغامبەر- peyxamber): پەیامبەر، پەیک، قاسید
**پیغمبر**- ا. ص(پەیغەمبەر- peyxember): راسپاردەی خوا، پێغەمبەر.
**پیغان**- ا(پەیغان- peyxan): پەیمان.
**پیغن**- ا(پەی غەن- peyxen): جۆرە گیایەکە.
**پیغوله**- ا(پەی غولە- peyxûle): کونج و گۆشەی ماڵ، کوێرەوەری، گۆشەی چاو.
**پیغون**- ا(پەیغون- peyxun): پەیمان و بەڵێن.
**پیفه**- ا(پیفە- pîfe): پەڵۆشە، دەسەچیلە.
**پیک**- ا(پەیک- peyk): پەیک، قاسید، پەیامبەر، تەتەر.
**پیکار**- ا(پەیکار- peykar): پەیکار، جەنگ، شەڕ، نەبەرد.
**پیکارگر**- ص. فا(پەیکارگەر- peykarger): جەنگاوەر، شەڕکەر.
**پیکان**- ا(پەیکان- peykan): ئاسنی سەری تیر یان نێزە، سەرەنێزە، سەرە رم.

**پیکر**- ا(پەیکەر- peyker): پەیکەر، کۆتەڵ، قاڵب، لەش، بەدەن، هەیکەل.
**پیکرنگار**- ص. فا(پەیکەر نیگار- peyker nigar): نیگارکێش، وێنەساز، پەیکەرتاش، پەیکەر ساز.
**پیک نیک**- ا.فر(pîk nîk): سەیرانی جەماعی کە هەر کەسەو بەشی خۆی پارە بدات.
**پیگرد**- ص(پەی گەرد- peygerd): پەیکەردەی، تاقیب، سۆراخ، لە دوو چوون.
**پیل**- ا(پیل- pîl): فیل.
**پیل**- ا. فر(pîl): پیل، پاتری.
**پیلپا**- ا(پیل پا- pîlpa): پا وەک پای فیل، جۆرە چەکێکی کۆنە لە شێوەی پێی فیل لە جیاتی گورز بەکار دەهات.
**پیلتن**- ص. ک(پیل تەن- pîlten): گەورە، زەلام، فیلەتەن.
**پیلسته**- ا(پی لەستە- pîleste): ئێسقانی فیل، عاج.
**پیلسم**- ص(پیل سوم- pîlsum): سمی گەورەو قایم، ئەسپێک کە سمی گەورەو سەخت بێ.
**پیلغوش**- ا(پیل غوش- pîlxûş): گوێ پان وەکو گوێی فیل، گوڵی سۆسەن، گوڵەزەمەقی.
**پیل مرغ**- ا(پیل مورغ- pîlmurx): قەلەمون.
**پیلو**- ا(پیلوو- pîlû): داری سیواک.
**پیلوار**- ص(پیلڤار- pîlvar): فیل ئاسا، باری یەک فیل.
**پیله**- ا(پیلە- pîle): قۆزاخە، ماڵی کرمی ئاوریشم، بیانوو، گەڕو تەشقەڵە، چەنەبازی.

**پیلەور**- ا. ص(پیلەڤەر- pîlever): چەرچی، دێوەرە، وردەواڵەفرۆش، گەڕیدە، رەنان.

**پیمان**- ا(پەیمان- peyman): پەیمان، شەرت و وەعد، قەول و قەرار، بەڵێن شەرت و بەقا.

**پیمان گسل**- ص. فا(پەیمان گوسەل- peyman gusel): پەیمان شکێن، بێ بەڵێن، بێ شەرت و بەقا.

**پیمانە**-ا (پەیمانە-peymane):پێوانە.

**پیمبر**- ص. فا(پەیوم بەر- peyumber): پەیامبەر، پێغەمبەر، راسپاردەی خوا، پەیک، قاسید.

**پیمودن**- مص(پەی موودەن- peymûden): پێوان، برینی مەودایەک، ئەندازەگرتن.

**پیمایش**- ا. مص(پەیمایش- peymayîş): پێوان، ئەندازە گرتن، برینی مەسافەیەک.

**پیمایندە**- ا. فا(پەی مایەندە- peymayende): پێوانەکار، ئەندازەگر، شەرابخۆر.

**پیمودە**- ا. مف(پەی موودە- peymûde): پێوراو، ئەندازەگیراو، بردراو.

**پینکی**- ا. مف(پەینەکی- peynekî): وەنەوز، چۆرت، خەوبردنەوە، خەوەنوتکێ.

**پینگ پونگ**- ا.فر(pîng- pûng): پینگ پۆنگ، تێنس.

**پینو**- ا(پینوو- pînû): کەشک.

**پینوا**- ا(پینووڤا- pînûva): چێشتی کەشک، کەشکەوا.

**پینوبا**- ا(پینوبا- pînuba): کەشکەوا.

**پینە**- ا(پینە- pîne): پینە، قیرتماغەی بەری دەست.

**پینەدوز**- ص. فا(پینەدوز- pînedûz): پینەدۆز، خاڵخاڵۆکە، پینەچی.

**پیو**- ا(پیوو- pîyû): کەستەک.

**پیواز**- ا(پەیڤاز- peyvaz): شەمشەمەکوێرە، شەمشە.

**پیواستە**- ا(پیڤاستە- pîvaste): قەڵا، بورج، حەسار.

**پیورە**- فر. ا(پی یورە- pîyûre): کیسکردنی بێخی ددان.

**پیوست**- ا(پەی ڤەست- peyvest): پەیوەست، بەردەوام، پاشکۆ.

**پیوستن**- مص(پەیڤەستەن- peyvesten): لێکدان، پێکەوە بەستن، پەیوەندکردن.

**پیوستە**- ا. مف(پەیڤەستە- peyveste): پەیوەستە، پێکەوە بەستراو، پاشکۆ، پەیوەند.

**پیوستگی**- ا. مص(پەی ڤەستەگی- peyvestegî): پەیوەندی.

**پیوند**- ا(پەیڤەند- peyvend): پەیوەند، خزمایەتی، کەسایەتی، موتوربە.

**پیوندی**- ص. ن(پەی ڤەندی- peyvendî): پەیوەندی، درەختێک کە لە ئەنجامی موتوربەکردنەوە پەیدا بووبێ.

**پیە**- ا(پیە- pîh): پیوو، پیڤ، بەزی ناو زگ.

**پیەسوز**- ا(پیە سوز- pîhsûz): قوتیلە چرا کە پیو یان رۆن گەرچەکی تێدەکرا فتیلەیەکی لۆکەی هەبوو، چرای رۆن گەرچەک.



**ت: حر(ت- T):**
پیتی چوارەمی ئەلفبای فارسییە کە بە (تا) دەخوێنرێتەوەو بە حەساوی ئەبجەد دەکاتە (٤٠٠).
**ت**- ا.فر- (تی- tî): گۆنیا.
**تا**- حر(تا- ta): ئامرازی پەیوەندی.
(لە سلێمانییەوە **تا** کەرکووک).
**تا**- ا(تا- ta): تابار، لابار، تاک، قەدونوشت.
**تائب**- ا. فــا. ع(تائیب- ta'ib): تۆبەکار، کەسێک لە گوناح بگەڕێتەوە.
**تاب**- ا(تاب- tab): توانا، تەحەمول، سەبر، پایەداری، ئۆقرە، ئارام.
**تاب**- ا(تاب- tab): پێچ، لوول، گرێ، ئالۆزکان، توڕەیی، شڵەژان، خەم، خێل، بادان.
**تاب**- ا(تاب- tab): جۆلانە، دەیدیک، لەیلووک، هەڕەزانی.
**تاب**- ا(تاب- tab): حەرارەت، تا، گەرمی، روناکی.
**تاباک**- ا(تاباک- tabak): تا، تێ، شڵەژان، بێ ئۆقرەیی.
**تابان**- ص. فــا(تابان- taban): پرشنگدار، درەخشان، بریقەدار، بەبریق و باق، بەدرەوشین، تابان.
**تاباندن**- مص(تاباندەن- tabanden): بادان، گرێدان، هەڵکردن، هەڵایساندن، گەرم کردن.
**تابخانە**- ا.مر(تابخانە- tabxane): هەیوان و جامخانە، گەرماو، ئاسمانی پڕ ئەستێرە، ژووری زستانە کە ئاگری تێدا بکرێتەوە، شەبسان.
**تابدار**- ص.فــا(تابدار- tabdar): تابان، رووناک، درەخشان، پرشنگدار، لوول خواردوو، بادراو.
**تابستان**- ا(تابیستان- tabistan): هاوین، تاوسان، هاڤین.
**تابش**- ا. مص(تابیش- tabiş): رووناکی، رۆشنایی، پرشنگ، روناهی.
**تابع**- ا. فــا- ع(تابیع- tabi'): گوێڕایەڵ، پەیڕەو، مورید، دەست و پێوەند، خولام، شوێن کەوتووی کەسێک، کەسێ یاوەرانی پێغەمبەری دی بێ.

**تابعی**- ص. ن- ع(تابیئی- tabi’y): بە کەسێک دەگوترێ کە ئەسحابەی دی بێ و پەیڕەوی بکات، ئەسحابە کەسێکە بە خزمەتی پێغەمبەر گەییشتبێ.
**تابعیت**- مص- ع(تابیئیەت- tabi’yet): تابعین، ئەوانەی یاوەرانی پێغەمبەریان دیتوە.
**تابل**- ا- ع(تابیل- tabil): بەهارات، ئاڵەت و زەردەچەوە، دەرمانی چێشتان.
**تابلو**- ا. فر(تابلو- tablû): تابلۆ، پەردە، وێنە، جانفاز، تابلۆی ناوی کەس یان ناوی دوکان و موغازان، تەختەڕەش.
**تابناک**- ص(تاب ناک- tabnak): تابان، پرشنگدار، درەخشان، درەوشاوە.
**تابندە**- ا.فا(تابەندە- tabende): تەشی ڕێس، تەنگەتاو، سەخڵەت و ناڕەحەت.
**تابوت**- ا.ع(تابووت- tabût): دارەمەیت، تابووت.
**تاب و توش**- ا.مر(تاب و توش- tabu tûş): جۆش و خرۆش، هێزو توانا، سەرچاوەێن بژێوی، ئەسبابی ژیان.
**تابە**- ا(تابە- tabe): تاوە.
**تابیدن**- مص(تابیدەن- tabîden): بادان، دەم دان، داگیرسان، هەڵایسان، گەرم کردن، هەڵبوون.
**تابیدە**- ا. مف(تابیدە- tabîde): بادراو، درەوشاوە.
**تابندە**- ا. فا(تابەندە- tabende): پرشنگدار، ڕووناکی بەخش.
**تابین**- ا. ص(تابین- tabîn): ژێردەست، گوێڕایەڵ، سەربازی بێ دەرەجە.
**تاپال**- ا(تاپال- tapal): تەپاڵە، سەرگین، شیاکەی وشک.
**تات**- (تات- tat): تاتۆ.
**تات**- ا. ت(تات- tat): تاژیک، تاجیک، فارسی زمان، غەیرە عەرەب و غەیرە تورک.
**تاتا**- ا(تاتا- tata): زمان گیران، تور، زمانگیر، لاڵەپەتە، تورەتور.
**تاتار**- ا(تاتار- tatar): تەتەر، مەغۆل.
**تاتو**- ا. ث(تاتوو- tatû): ئەسپ، ئەسپی وردیلەی کولێی یاڵ و تووک درێژو خۆشبەز.
**تاتو**- ا.فر(تاتوو- tatû): جۆرە حەیوانێکی گواندارە، لەشی بە پولەکە داپۆشراوە، لە ئەمریکای باشووردا هەیە.
**تاتورە**- ا(تاتورە- tatûre): پەتێ کە پێی ولاخی بەرزەی پێ دەبەستن، جۆرە گیایەکە.
**تاج**- ا. ع(تاج- tac): تاج، کڵاوی جەواهێر نیشان، کڵاوی پاشایان، دواخ.
**تاج خروس**- ا.مر(تاجی خروس- tacixurûs): گوڵێکی سوورە لە پۆپەی کەڵەشێر دەچێت.
**تاجر**- ص- ع(تاجیر- tacir): سەوداگەر، بازرگان، مامەڵەچی.
**تاجریزی**- ا(تاجریزی- tacrîzî): جۆرە گیایەکە، ترێی ڕێوی پێ دەڵێن.
**تاجور**- ص(تاجڤەر- tacver): تاجوەر، خاوەن تەخت و تاج، پاشا، سوڵتان.
**تاجیک**- ا(تاجیک- tacîk): تاژیک، تاجیک، غەیرە تورک و هەر کەسێک تورک و مەغۆل نەبێ، فارسی زمان، خەڵکی تاجیکستان.
**تاچە**- ا(تاچە- taçe): تای خورجین،

یەک تای هەگبە.

**تـاخـت**- ا(تـاخــت- taxt): رەوتــە، غـاردان، جۆرە رۆینێکی ئەسپە کە لە چوار ناڵە هێــواشــتــرە، هێـرش و پەلامــار بە مەبەستی شەڕو تاڵان.

**تاختگاه**- ا. مر(تاختگاهـ- taxtgah): مەیدانی جریدبازی و تاودانی ئەسپان.

**تاختن**- مص(تاخــتــەن- taxten): تاڵانکردن، تـاودان، غـاردان، هێـرش بردن، راونان.

**تـار**- ا(تـار- tar): تـاڵ، داو، هـەودا، تەونی جاڵجاڵۆکە، ژێ.

**تار**- ا(تار- tar): جـۆرە ئامـێــرێکی مۆسیقایە، تار، ساز، سازی ئێرانی.

**تار**- ا(تار- tar): تەپڵـە سـەر، ناوەندی سەر، داهێنانی قژ لە ناوەڕاستی سەرەوە.

**تـار**- ص(تـار- tar): تـاریـک، لـێـڵ، قوڕاوی.

**تارات**- ا. ع(تارات- tarat): کـەڕەت، کەڕەتان، جاران، دەفعە.

**تاراج**- ا(تاراج- tarac): تاڵان.

**تـاراجـگـر**- ص. فـــــا(تـاراجـگـەر- taracger): تاڵانکەر، تاڵانچی.

**تـاران**- ص(تـاران- taran): تـاریـک، تاری.

**تاراندن**- مص(تاراندەن- taranden): تـاراندن، دەرکــردن، دوورخــســتنەوە، رەتاندن.

**تـارانـنـدە**- ا. فـــــا(تـارانـەنـدە- taranende): تارێنەر، راونەر، دەرکەر، ترسێنەر، رەتێنەر.

**تارانـدە**- ا. مـف(تارانـدە- tarande): تارێنراو، راونراو، دەرکراو، رەتێنراو.

**تـــــارت**- ا. ع(تــــــارەت- taret): کەڕەتێک، جارێک.

**تارتن**- ا. مر(تارتەن- tarten): کاکڵە مـوشـان، پەسـپـەسـەکـەرە، جـاڵجـاڵۆکـە، جولاییکەرە، جۆلاتەنە، کرمی ئاوریشم.

**تـارک**- ا(تـارەک- tarek): نـاوەنـدی سەر، ترۆپک، کڵاو خود.

**تارک**- ا. فـــا- ع(تاریک- tarik): تەرککــەر، تەرککــردە، کـەسێ کـە نـوێژ نەکـات، بێ ئەدەب، روودار، تەرکە دنیـا؛ خواناس، دیندار.

**تارم**- ا(تارەم- tarem): گـــومـــەز، سەراپەردە، موحەجەرە، چەپەر، ئاسمان، فەلەک، تامان، تەیان، تارمە.

**تارپود**- ا. مــر(تاروپود- tarûpûd): تان و پۆ، بناغە، پایەی هەر شتێک.

**تارومـار**- ص(تارومـار- tarûmar): تەفـــــرو تونـا، هەڵـلادراد، تێـکوپێـک، لەناوچوو، تەرتەو وەرتە.

**تـاریـخ**- مـص- ع(تـاریـخ- tarîx): دیرۆک، مـێـــژوو، دیریـک، ســەربـوری رووداوان.

**تـاریـک**- ص(تـاریـک- tarîk): تـاری، تاریک.

**تازاندن**- مص(تازاندەن- tazanden): غاردان، تاودان.

**تـازانـنـدە**- ا. فــــــا(تـازانـەنـدە- tazanende): وەغارهێنەر.

**تازانە**- ا(تازانە- tazane): شــەلاق، قەمچی، جەڵدە.

**تـازش**- ا. مــص(تـازیــش- taziş): غاردان، تاودان.

**تـازە**- ص(تـازە- taze): نـوێ، تـازە،

گەش، تەڕو تازە، باش، پەسند.
**تازە بهـــــار**- ا. مـــــر(تازە بەهار- taze behar): نەوبەهار، گــوڵی تازە پشکوتوو، جوان، تەڕو تازە.
**تازی** - ا. ص(تازی- tazî): عــەرەب، زمانی عەرەبی.
**تازی**- ا(تازی- tazî): تاژی، تانجی، سەگی راو.
**تـازیـانـە**- ا(تـازیـانـە- tazyane): شەلاق، قامچی، جەڵدە، شللاخ.
**تـازیـدن**- مـص(تـازیـدەن- tazîden): غاردان، تاودان، هێرش بردن.
**تـــازیـــک**- ا.ص(تـــازیـــک- tazîk): عەرەب.
**تـــاژک**- ا(تـــاژەک- tajek): کـــلـــکـــی گیانلەبەرانی تاک خانەیی.
**تاس**- ا(تاس- tas): تاس، کـــاســـەی مسی.
**تاس**- ا(تاس- tas): زار، مــــــۆرەی تەختەنەرد.
**تاس**- ص(تاس- tas): سەری رووتاوە، تووکی سەر وەربو.
**تاس**- ا(تاس- tas): بێـزو، تاسـە، بێ تاقەتی، خەم، نیگەرانی، مەگیرانی.
**تاســـانیـــدن**- مص(تاســـانیــــدەن- tasanîden): تاســـاندن، خنکاندن، گێژکردن، خەفەکردن.
**تاسع**- ا- ع(تاسیئ- tasî’): نۆیەم.
**تاسوعا**- ا. ع(تاسوئا- tasû’a): رۆژی نۆیەمی مانگی محەڕەم.
**تاســە**- ا(تاســە- tase): خـەم، پەژارە، بێزاری، ئارەزوو، حەز، عەزرەت.
**تاســــە**- ا(تاســــە- tase): بێـــزوو، مەگیرانی، ئشتیا، ئارەزوو.
**تاغ**- ا(تاغ- tax): دار بەڕوو، جــــۆرە دارێکە بۆ رەژوو بەکار دێت.
**تافـتــان**- ا.ص(تافـتــان- taftan): کولێرە.
**تافتن**- مص(تافتەن- taften): بادان، هەڵگیرسان، سووربوونەوە.
**تافـتـە**- ا.مف(تافـتـە- tafte): ئاسن لە ئاگـردا، نارەحـەت بوون، بادراو، چنراو، سوورەوکراو.
**تافـتـە**- ا(تافـتـە- tafte): پارچەیەکی ئاوریشمییەو بەدەست دەچنرێ.
**تافـشـک**- ا(تافـەشـەک- tafeşek): مۆریانە، مۆرانە، مۆرەقە.
**تاقدیس**- ا(تاغـدیس- taxdîs): تاق، میچی بە کەوانە، گومەز.
**تاک**- ا(تاک- tak): درەخـتـی مـێـو، درەختی ترێ.
**تاکـتـیـک**- ا. فـر(تاکـتـیـک- taktîk): ئامادەسازی سوپا، تەگبیری شەڕ، فەندو فێڵی جولاندنی سەرباز لە جەنگدا.
**تاکس**- ا. فـــر(تاکس- taks): نرخ، نرخی براوەی فەرمی.
**تاکـســـتـــان**- ا. مـر(تاکـیـســـتـــان- takistan): رەز، باغی ئەنگور، بنەترێ.
**تاکـسی**- ا. فـر(تاکـسـی- taksî): تەکسی، ئوتومبێلی کرێ لە ناو شاردا.
**تاکسی متـر**- ا.مر- فر(تاکسی مەتر- taksî metr): تەکسی مەتر، ئامێرێکە بۆ پێوانەی ئەو رێگەی کە تاکسی دەیبڕێ تا بە گوێرەی ئەوە کرێ وەربگرێ، عەدداد.
**تالاب**- ا(تالاب- talab): گــــۆلاو، حەوز، ئەستێل، تالاوی.

**تالار**- ا(تالار- talar): باڵەخانە، تەلار، هۆڵ.

**تالان**- ا. فر(تالان- talan): جۆرە کێشانەیەک بووە بەرانبەر بەنزیکەی ٢٦ کیلۆ.

**تالانک**- ا(تالانەک- talanek): جۆرە درەختێکە.

**تالسان**- ا(تالسان- talsan): تەیلەسان، جۆرە شانێلێکە بە شاندا دەدرێ، عابا.

**تالواسە**- ا(تالڤاسە- talvase): بێزاری، خەم، تاسە، بێزو، ئارەزوو.

**تالی**- ص- ع(تالی- talî): پەیڕەو، پاش، دووەم.

**تام**- ص. ع(تام- tam): تەواو، بێ کەم و زیاد.

**تامپون**- ا. فر(تامپون- tampûn): لۆکە کە بخرێتە لووتەوە تا خوێنی بووەستێ.

**تانک**- ا. فر(تانک- tank): تانک، زرێ پۆش.

**تانکر**- ا. انگل(تانکەر- tanker): تەنکەر، ئوتومبیلی نەوتکێش، کەشتی نەوتکێش.

**تاو**- ا(تاڤ- tav): تاقەت، توانا، روناکی، پرتەو، مەینەت، مەشەقەت، تاڤ.

**تاواتاو**- ا(تاڤاتاڤ- tavatav): توانا، تاقەت.

**تاوان**- ا(تاڤان- tavan): سزا، غەرامەت، جزیا، قەرەبوو.

**تاول**- ا(تاڤەل- tavel): تلۆقە، بلۆق.

**تاویدن**- مص(تاڤیدەن- tavîden): بریسکانەوە، بریقانەوە، تەحەمول کردن.

**تایر**- ا. انگل(تایەر- tayer): تایە، تایەی ترومبیلان، تایەر.

**تئاتر**- ا. فر(تیاتر- tîyatr): شانۆ.

**تئاترال**- ص. فر(تیاترال- tiyatral): مەیلەو نمایش.

**تأبید**- مص. ع(تەئبید- te’bîd): ئەبەدی کردن، جاویدان کردن، نەمرکردن.

**تأثر**- مص. ع(تەئەسور- te’essur): خەمباربوون، خەمباری، کەوتنە ژێر کاریگەری.

**تأثیر**- مص. ع(تەئسیر- te’sîr): کارتێکردن، کاریگەری، باندوور.

**تأجیل**- مص. ع(تەئجیل- te’cîl): دواخستن، مۆڵەتدان.

**تأخر**- مص. ع(تەئەخور- te’exur): دواکەوتن، ماتەڵ بوون، درەنگ بوون.

**تأخیر**- مص- ع(تەئخیر- te’xîr): دواخستن، درەنگ هاتن، درەنگ کەوتن، پاش خستن.

**تأدب**- مص. ع(تەئەدوب-teedub): ئەدەبیات فێربوون، بەئەدەب بوون.

**تأدیب**- مص. ع(تەئدیب- te’dîb): بە ئەدیب بوون، تەمبێ کردن، گوێ راکێشان، پەروەردەکردن.

**تأدیە**- مص. ع(تەئدییە- te’dîye): دانەوەی قەرز، دان، ئەداکردن، گەیاندن.

**تأسف**- مص. ع(تەئەسوف- te’esuf): داخ خواردن، خەمگین بوون، ناخۆشحاڵی.

**تأسی**- مص. ع(تەئەسی- te’essî): پەیڕەوی کردن، لاسایی کردنەوە، چاولێکردن.

**تأسیس**- مص. ع(تەئسیس- te'sîs): دامەزراندن، بناغەدانان، دامەزراندن.

**تاکید**- مص. ع(تەئکید- te'kîd): دووپات کردن، سەلماندن، تەئکید کردن.

**تالم**- مص. ع(تەئەلوم- teelum): ئازار چەشتن، پێ ناخۆش بوون.

**تاله**- مص. ع(تەئەلوە- teelluh): داوای خودایی کردن، خواپەرستن.

**تالیف**- مص. ع(تەئلیف- te'lîf): کۆکردنەوە، دۆستایەتی کردن، نووسینی کتێب کە لە سەرچاوەی دی وەرگیرابێ، دانان.

**تامل**- مص. ع(تەئەمول- te'emul): رامان، تێفکرین، درەنگ کردن، وردبینی، دووربینی، تێهزران.

**تامین**- مص. ع(تەئمین- te'mîn): دڵنیاکردن، مسۆگەرکردن، پاراستن.

**تامینات**- ع(تەئمینات- te'mînat): لقێکە لە دایەرەی ئەمن.

**تانق**- مص. ع(تەئەننوغ- te'ennux): وردەکاری، گوفتارو کرداری ئەنیق و مکوم.

**تانی**- مص. ع(تەئەننی- te'ennî): هێمنی، ئارامی، هێواش کردن، دواخستن، خاوەخاوکردن.

**تانیث**- مص. ع(تەئنیس- te'nîs): نیشانەی مێ خستنە سەر وشە، مێیاندن.

**تانیس**- مص. ع(تەئنیس- te'nîs): هۆگربوون، راهاتن، ئولفەت گرتن.

**تئودولیت**- ا. فر(تیودولیت- tiudûlît): دووربینی زەمین پێوان.

**تئوری**- ا. فر(تی ئوری- ti'urî): تێوری، گریمانە، کۆمەڵە زانیارییەک کە هەندێ کاروبارو رووداوان شروڤە بکات.

**تئوریسین**- ا. فر(تی ئوریسین- tiurîsîn): تێوری زان، تێوری وان.

**تاویل**- مص. ع(تەئڤیل- te'vîl): تەفسیرکردن، شرۆڤەکردن، لێکدانەوەی ئەو دیوی وشە.

**تاهل**- مص. ع(تەئەهول- te'ehul): زەوجین، زەماوەند کردن (بۆ پیاو و بۆ ئافرەت).

**تئین**- ا. فر(تیئین- tî'în): روحی چا، کلۆییدی ناو گەڵا چا.

**تأیید**- مص. ع- تەئید- teîd): هاوکاری کردن، پشتیوانی کردن، کۆمەک کردن.

**تب**- ا(تەب- teb): تا.

**تبادر**- مص. ع(تەبادور- tebadur): دەست پێشکەری کردن، پەلەکردن.

**تبادل**- مص. ع(تەبادول- tebadul): گۆڕینەوە، ئاڵشت، ئاڵوگۆڕکردن.

**تبار**- ا(تەبار- tebar): رەچەڵەک، ئەسڵ، نەژاد، وەچاخ.

**تبار**- ا. ع(تەبار- tebar): وێران، وێرانی، لە ناو چوون.

**تبارک**- مص. ع(تەبارەک- tebarek): موبارەک بوون، پاک بوون، پاکی، تەبەرِوک، پیرۆز بوون، بە بەرەکەت بوون.

**تباسیدن**- مص(تەباسیدەن- tebasîden): تاسان، لە هۆش چوون، بوورانەوە لە گەرما.

**تباسیده**- ا. مف(تەباسیدە- tebasîde): تاساو.

**تباشیر**- ا. ع(تەباشیر- tebaşîr): گەچی تایبەتی نووسین، دەباشیر، تەباشیر.

**تباشیر**- ا(تەباشیر- tebaşîr): جۆرە دەرمانیکە لە لوب یان ناوی حەیزەران دەردەهێنرێ.
**تباعد**- مص. ع(تەبائود- teba’ud): لێکدی دوور کەوتنەوە، تۆران.
**تباغض**- مص. ع(تەباغوز-tebaxuz): یەکدی بوغزان، بەغزکردن، دژمنایەتی.
**تباکی**- مص. ع(تەباکی- tebakî): گریانی بەدرۆ، گریاندن.
**تبانی**- مص(تەبانی- tebanî): تەبایی، پێکەوە سازان، پەیمان بەستن.
**تباه**- ص(تەباه- tebah): بێ کەڵک، خراپ، گەندەڵ، زایە، نابوود، زەبوون.
**تباهی**- ا. مص(تەباهی- tebahî): گەندەڵی خراپی، نابوودی.
**تباهانیدن**- مص(تەباهانیدەن- tebahanîden): رزاندن، ژاکاندن، خراپ کردن، زایە کردن، لە نێو بردن.
**تباهکار**- ص.فا(تەباهکار- tebahkar): خراپکار، گوناهکار، تاوانبار، فاسق.
**تباهیدن**- مص(تەباهیدەن- tebahîden): خراپ بوون، رزین، لە کەڵک کەوتن، زایە بوون.
**تباین**- مص. ع(تەبایون- tebayun): جیاوازیی، جیایی، ناکۆکی، نا تەبایی.
**تبجیل**- مص- ع(تەبجیل- tebcîl): رێزگرتن، گەورەکردن.
**تبحر**- مص(تەبەهور- tebehur): زانابوون، قوڵبوونەوە لە زانستدا.
**تبخال**- ا. مر(تەبخال- tebxal): تامێسکە، تلۆق، تامیزەک.
**تبختر**- مص. ع(تەبەختور- tebextur): بەخۆنازین، خۆهەڵکێشان، خۆنواندن، خۆپەسندی، فرناخی.
**تبخیر**- مص. ع(تەبخیر- tebxîr): بوونە هەڵم، کردنە هەڵم.
**تبدل**- مص. ع(تەبەدول- tebeddul): گۆڕان، گۆڕین.
**تبدیل**- مص. ع(تەبدیل- tebdîl): گۆڕین، گۆڕانکاری.
**تبذیر**- مص. ع(تەبزیر- tebzîr): زیادە مەسرەفی، دەست بڵاوی، بەفیڕۆدانی ماڵ و سامان.
**تبر**- ا(تەبەر- teber): تەور، بیور.
**تبراجعه**- ا. مر(تەبی راجیئە- tebi raci’e): لەرزوتا، تیفوس.
**تبرئه**- مص. ع(تەبریئە- tebrie): تەبرێ بوون، پاکبوونەوە، پابوونەوە لە تۆمەت.
**تبرخون**- ا(تەبەرخون- teberxûn): درەختی عەناب.
**تبرزین**- ا. مر(تەبەرزین- teberzîn): تەورزین، چەکێک بوو بە دەس سوارەوە.
**تبرع**- مص. ع(تەبەروء- teberu’): بەخشینی ماڵ لە رای خوا.
**تبرک**- مص- ع(تەبەڕوک- teberuk): تەبەڕوک، پاکی، موبارەکی.
**تبرک**- ا(تەبرەک- tebrek): قەڵا، حەسار، ئاسمان.
**تبرم**- مص. ع(تەبەڕوم- teberum): دڵتەنگ بوون، مەلول بوون، کەساس بوون.
**تبری**- مص. ع(تەبەڕی- teberî): بێزاری، دوورکەوتنەوە.

**تبــــرید**- مص. ع(تەبرید- tebrîd): فێنک کردنەوە، ساردکردنەوە، سەرمابوون.
**تبـریک**- مص. ع(تەبریک- tebrîk): پیرۆزبایی.
**تـب زرد**- ا. فـــــــــــــر(تـەبـی زەرد- tebîzerd): جۆرە تایەکە، گرانەتا.
**تـبـــست**- ص(تەبەست- tebest): زایەبوون، لە کـارکـەوتن، رزین، ژاکـان، خرابوون.
**تـبــــسم**- مص- ع(تـەبەســـــوم- tebessum): زەردەخـەنە، بزەخـەنە، نەرمە پێکەنین، زەردەکەنی.
**تبـســیــدن**- مص(تەبسـیـدەن- tebsîden): تاسان، بێ تاقەت بوون لە گەرما.
**تبسیده**- ا. مف(تەبسیدە- tebsîde): تاساو، تەنگە نەفەس بوون لە گەرما.
**تبـشـیـر**- مص(تەبشـیـر- tebşîr): مژدەدان، مژدەهێنان، مزگێنی.
**تبـــصـــبص**- مص. ع(تەبەس بوس- tebes bus): کلکەسوتێ، کلکە لەقێ، ماستاو ساردکردنەوە، ریا کردن، ریایی و زمان لوسی.
**تبصره**- مص. ع(تەبسیرە- tebsire): عـیـبـرەت وەرگـرتن، پەند وەرگـرتن، رونکردنەوە لەسـەر مـادەیەکی قـانونی، رونکردنەوە.
**تــبــع**- مــص. ع(تــەبــە ء- tebe’): پەیڕەوی، ڕێچکەگـرتنی کـەسـێک، چاولێکردن.
**تبع**- ص. ع(تەبە ء- tebe’): پەیڕەوان، خولامان، نۆکەران.
**تبعه**- ا.ع(تەبەئە- tebe’e): تەبەعـە، رەعیەت، پەیڕەو.
**تبعیت**- مص. ع(تەبئیت- teb’iyet): پەیڕەوی، دووکەوتن.
**تبـعـیـد**- مص. ع(تەبئیـد- teb’id): دوورخـســتنەوە، شـار بەدەرکـردن، نەفی کردن.
**تبـعـیض**- مص.ع(تەبئیـز- teb’îz): فەرق و جیایی کردن.
**تـب لازم**- ا. مـــــــــــر(تـەبـی لازم- tebi lazim): نەخۆشی سیل.
**تـب لـرزه**- ا. مـــــــــــر(تـەب لـەرزە- teblerze): تاولەرزە، نۆبەتێ، مەلاریا.
**تبلور**- مص. ع(تەبەلڤور- tebelvur): بەرجەستە بوون.
**تبـلیـغ**- مص- ع(تەبـیلغ- teblî¨x): گـەیاندن، گـەیاندنی پەیام و هەواڵان، ڕاگەیاندنی پەیامێک یان مەبەستێک بە خەڵکی.
**تب مـــالتـــه**- ا(تەبی مـــالتـــە- tebi malte): تای ماڵتە.
**تب نفـاسی**- ا. مـر(تەبی نیـفـاسی- tebi nifasî): زەیسـتـانی، هەوکـردنی دەزگای زاوزێی ژن لە ئەنجامی منداڵ بوون و خۆ خاوێن رانەگرتنەوە.
**تبنک**- ا(تەبەنەک- tebenek): قاڵبی زەڕنگەری.
**تـب نـوبـه**- ا. مـــــــــر(تـەب نـەوبـە- tebnewbe): نـۆبـەتـێ، لـەرزوتـا، مەلاریا.
**تبـنی**- مـص. ع(تـەبـەنـی- tebenî): هەڵگرتنەوەی منداڵ، بە کوڕکردنی خۆ.
**تبوراک**- ا(تەبوراک- tebûrak): دەف، دایەرە، تەپڵی بچووک.

**تبـویب**- مص. ع(تەبڤـیب- tebvîb): دابەشكردنی كتێب و نووسین بەسەر بەش و فەسلاندا.
**تـب یـازە**- ا(تـەب یـازە- tebyaze): مەلاریا، نۆبەتا، لەرزوتا.
**تبـیـان**- مص. ع(تبـیـان- tibyan): بەیان كـردن، روونكردنەوە، شـەرح كـردن، كفش كرن.
**تبـیـرە**- ا(تـەبیـرە- tebîre): تەپڵ، دەهۆڵ.
**تبـیین**- مص. ع(تەبیین- tebeyîn): روونكردنەوە، رونبـێـژی، ئاشكراكـردن، روونكردنەوەو تەفسیر.
**تپاک**- ا(تەپاک- tepak): بێ قەراری، بێ ئۆقرەیی، شڵەژان.
**تپـالە**- ا(تەپالە- tepale): تـەپاڵە، سەرگین، لاس، ریخ.
**تپانچە**- ا. مر(تەپانچە- tepançe): شەقەزللە، شەپەزللە، زللە، تەوقات.
**تپـانچـە**- ا(تەپانچـە- tepançe): دەمانچە، وەروەر.
**تپاندن**- مص(تەپاندەن- tebanden): تێ ئاخنین، تێ تەپاندن.
**تپـانـنـدە**- ا.فـا(تـەپـانـەنـدە- tepanende): كەسێک بە زۆر شتێک بتەپێنێتە ناو شتێكەوە.
**تپش**- ا. مص(تەپیش- tepiş): تەپە، ترپە، ترپەی دڵ، نارەحەتی، بێقەراری، بێ ئۆقرەیی.
**تپق**- ا. ت(توپوغ- tupux): لاڵەپەتە، تور، زمانگیرانی لەپڕ.
**تپنكوز**- ص(تەپەنكوز- tepenkûz): تەپۆ، گـەوج، گـێل، گـەڵحـۆ، كـەودەن، ئەبلەه.
**تپـە**- ا(تەپە- tepe): تـەپە، گـرد، تەپڵەكی ئارەخچن.
**تپـەمـاهور**- ا. مـر(تەپەمـاهور- tepemahûr): هەورازو نشێو، هەردەو هەڵەت، زەوی بەرزو نزم.
**تپیـدن**- مص(تەپیـدەن- tepîden): لەرزین، جـولان، لێدانی دڵ، تێ تەپاندن، بێ قەراری.
**تتـابع**- مص.ع(تەتابوء- tetabu’): بەدوی یـەكـدا هاتـن، بەدوی یەكـدا گەییشتن.
**تتـانس**- ا. فـر(تەتانس- tetanus): كوزاز.
**تتـبع**- مص. ع(تەتەبوء- tetebu’): پەی جویی، گەڕان، بەدوداچوون، تاقیب و سۆراخ كردن.
**تتق**- ا(توتوغ- tutux): چادر، خێوەت، سەراپەردە.
**تتمە**- ا. ع(تەتیمە- tetime): باقی، پاشماوە، تەواوكەر.
**تتـمـیم**- مص. ع(تەتمیم- tetmîm): تەواوكردن، لاپكردن.
**تثاقل**- مص. ع(تەساغول- tesaxul): گـران بوون، قـورسی، گـرانبـاری، دڵ تێک هەڵهاتن.
**تثبـیت**- مص. ع(تەسبـیت- tesbît): چەسپاندن، مەحكەم كردن، راگرتن.
**تثـریب**- مص. ع(تەسـریب- tesrîb): سەرزەنش كردن، لۆمەكردن، گازاندەكردن.
**تثلیث**- مص. ع(تەسلیس- teslîs): بەسێ كردن، سێ قۆڵی، سیانەی پیرۆز لە ئایینی مـەسیـحیدا: (باب، كـوڕ، روحی

قودس)، سیانی.
**تثنیه**- مص. ع(تەسنییە- tesnîye):
بەدوو کردن، دووانی.
**تجادل**- مص. ع(تەجادول- tecadul):
شەڕکردن، ململانێ، مشتومڕ، قەرقەشە، گێنگەشە.
**تجار**- ا. ع(توججار- tuccar):
بازرگانان، مامەڵەچییان.
**تجارب**- ا. ع(تەجاریب- tecarib):
ئەزموونان، تەجرەبان، تاقیکردنەوان، ساوکەیان.
**تجارت**- مص. ع(تیجارەت- ticaret):
مامەڵەو سەوداکردن، بازرگانی کردن.
**تجاسر**- مص. ع(تەجاسور- tecasur):
زات کردن، جەسارەت کردن، بێ پەروایی، گەردنکێشی.
**تجانس**- مص. ع(تەجانوس- tecanus): هاوڕەگەزی، گونجان، تەبایی، چوونیەکی، شیلگیری.
**تجاوز**- مص. ع(تەجاڤز- tecavez):
لە حەد دەرچوون، عەفوکردن، زێدەگاڤی، ڕەت بوون، بەزاندنی سنووری خۆ، چاوپۆشی.
**تجاویف**- ا. ع(تەجاڤیف- tecavîf):
کەلێن، بۆشایی، کون، موغارە.
**تجاهر**- مص. ع(تەجاهور- tecahur):
ئاشکراکردن، خویایی، ئاشکرایی، خۆنواندن.
**تجاهل**- مص. ع(تەجاهول- tecahul):
خۆلەسالۆزیدان، خۆلەگێلیدان.
**تجبر**- مص. ع(تەجەبور- tecebur):
لووت بەرزی، فیز لێدان، سەرکێشی گەردنکێشی، تەکەبور.

**تجدد**- مص. ع(تەجەدود- tecedud):
نوێ بوونەوە، تازەبوونەوە، تازەیی.
**تجدید**- مص. ع(تەجدید- tecdîd):
تازەکردنەوە، نوێسازی، لە نوێ دەست پێکردنەوە.
**تجر**- ا(تەجەر- tecer):
ماڵی زستانە، ماڵێ کە موغەیری تێدابێ.
**تجربه**- مص. ع(تەجریبە- tecribe):
جەرباندن، تاقی کردنەوە، ئەزموون، ساوکە.
**تجرد**- مص. ع(تەجەرود- tecerud):
دوورکەوتنەوە لە کاروباری دنیایی، سەڵتیی، ڕەبەنی، بێ ژن بوون، گۆشەگیری.
**تجری**- مص. ع(تەجەڕی- tecerî):
جورئەت کردن، زات کردن، سەرپێچی، بێ پەروایی.
**تجرید**- مص. ع(تەجرید- tecrîd):
رووت کردن، پاککردنی توێکڵی دار، شمشێر لە کێلان دەرهێنان، تەنیایی، رووتەڵخوازی (هونەر).
**تجزیه**- مص. ع(تەجزییە- teczîye):
دابەش کردن، پارچەپارچە کردن، جیاکردنەوە، شیکردنەوە.
**تجسس**- مص. ع(تەجەسسوس- tecessus): گەڕان و تاقیب کردن، جاسوسی و هەواڵ خۆزی، خەوەردزی.
**تجسم**- مص. ع(تەجەسوم-tecesum):
بەرجەستەبوون.
**تجلد**- مص.ع(تەجەللود- tecellud):
چالاکی کردن، چاپوکی، کۆڵنەدان، خەبتین و تحەمول، سەبرکردن.
**تجلی** - مص. ع(تەجەلی- tecellî):

دەرکەوتن، بەرجەستەبوون، ئاشکرابوون.
**تجليد**- مص. ع(تەجليد- teclîd): کەوڵ کردن، بەرگ تێ گرتن (دەفتەر یان کتێبان).
**تجليل**- مص. ع(تەجليل- teclîl): ڕێزگرتن، قەدرگرتن، گەورەکردن، ڕێزلێنان.
**تجمع**- مص. ع(تەجەمموء- tecemmu'): خڕبوونەوە، کۆبوونەوە، گردبوونەوە.
**تجمل**- مص. ع(تەجەممول- tecemmul): رازانەوە، خۆئارایی، هەبوونی ماڵ و ناو ماڵی گرانبەها.
**تجنب**- مص. ع(تەجەننوب- tecennub): دوورکەوتنەوە، کەنارگرتن.
**تجنيس**- مص. ع(تەجنیس- tecnîs): هاورەگەزکردن، چوون یەک بوون.
**تجويد**- مص. ع(تەجڤید- tecvîd): چاکەکردن، چاک گوتن، هونەری دروست خوێندنی قورئان.
**تجويز**- مص. ع(تەجڤیز- tecvîz): حەڵاڵ کردن، ڕەواکردن، ڕێگەدان.
**تجويف**- مص. ع(تەجڤیف- tecvîf): خاڵی کردن، بەتاڵ کردن، ژێر، ناو.
**تجهيز**- مص. ع(تەجهیز- techîz): ئامادەکردن، کەلوپەل و پێداویستی سوپایی.
**تجير**- ا(تەجیر- tecîr): چیغ، چەپەر، پەردە.
**تحاشى**- مص. ع(تەهاشی- tehaşî): پارێزکردن، دوورکەوتنەوە، خۆلادان لە شتێک.
**تحايا**- ا. ع(تەهایا- tehaya): درودو سلاوان.
**تحبيب**- مص. ع(تەهبیب- tehbîb): خۆشەویست کردن، شیرین کردن، دۆستایەتی کردن.
**تحت**- ق. ع(تەهت- teht): بن، ژێر، پایین، خوار.
**تحت الحنك**- ا. ع(تەهتەل هەنەک- tehtel henek): ژێر چەناگە، ژێرچەنە.
**تحت القهوه**- ا. ع(تەهتەل غەهوە- tehtel ¨xehwe): بەرکوڵ کردن.
**تحتانى**- ص. ن. ع(تەهتانی- tehtanî): ژێرین، خوارین، ژێری.
**تحجر**- مص. ع(تەهەججور- teheccur): رەقبوون، بەبەردبوون، رەقبوون وەکو بەرد، بەکەڤربوون.
**تحدب**- مص. ع(تەهەددوب- teheddub): کوڕبوون، کۆم بوون.
**تحديد**- مص.ع(تەهدید- tehdîd): تیژکردن، دیاریکردنی سنوور، مۆرەکردن.
**تحذير**- مص. ع(تەهزیر- tehzîr): ترساندن، ئاگادارکردن.
**تحرك**- مص. ع(تەهەڕوک-teheruk): جوڵان، هەرەکەت کردن.
**تحرى**- مص. ع(تەهەری- teherî): گەڕان، پشکنین، حەقیقەت خوازی، گەڕان بەدووی حەقیقەتدا.
**تحرير**- مص. ع(تەهریر- tehrîr): نووسین، ئازادکردنی کۆیلە، ئازادکردن.
**تحريص**- مص. ع(تەهریس- tehrîs): هاندان، تەماح خستنەبەر، ناچارکردن.
**تحريض**- مص. ع(تەهریز- tehrîz): هاندان، تەحریک کردن، دنەدان.

**تحـــریف**- مص. ع(تەهریف- tehrîf): کەچ کردن، خوارکردن، قسەگۆڕین.
**تحـریک**- مص. ع(تەهریک- tehrîk): جولاندن، هاوردنە جوولە، دنددان.
**تحـــریم**- مص. ع(تەهریم- tehrîm): حەرام کردن.
**تحـــــــزب**- مـص. ع(تـەهـەززوب- tehezzub): دەسـتـەبەندی، تەرەفـداری کردن، لایەنگری، حزبچیاتی، حزبێنی.
**تحسر**- مص. ع(تەهەسور-tehessur): داخ خـواردن، حـەسرەت خـواردن، خـەفـەت خواردن.
**تحسین**- مص. ع(تەحسین- tehsîn): ئافەرین، دەست خۆشی، ستایش کردن.
**تحــشــیــــه**- مص. ع(تەهشـیــــیــــە- tehşîye): پەراوێزنووسی بۆ کـتـێبـان، پەراوێزنان لە جل و بەرگ.
**تحـــــصن**- مـص. ع(تـەهـەســـــــون- tehessun): پەناگرتن، قەلانشینی، خۆ قایم کردن لە حەسارو قەلاتان.
**تحـصیل**- مص. ع(تەهسیل- tehsîl): بەدەست هێنان، کـۆکـردنەوە، خـوێندن، زانست فێربوون.
**تحف**- ا. ع(توهـەف- tuhef): دیاری، پێشکەش، سەوقات، نایاب و گران بەها.
**تحـفـه**- ا. ع(توهفـە- tuhfe): دیاری، سەوقاتی، نایاب و دەگمەن، عەنتیکە.
**تحــــقق**- مص. ع(تـەهەغــــغــــوغ- tehe¨xu¨x): راســـــت دەرچــــــوون، هاتنەدی، هاتنەبوون.
**تحقیر**- مص. ع(تەهغیـر- teh¨xîr): بچووک کردن، حەقارەت پێ کردن، ئیهـانە کردن.

**تحـقـیق**- مص. ع(تەهغـیغ- tehxîx): تـاقــیق، لێکـۆڵـینەوە، لێــپــرســـینەوە، راستکردنەوەو دروست کردن، توێژینەوە.
**تحکم**- مص. ع(تەهەکوم-tehekum): داوەری کـردن، زۆرداری، حــوکم کــردن بە تۆبزی، فەرمانڕەوایی.
**تحکیم**- مص. ع(تەهکیـم- tehkîm): قایم کردن، پتەوکردن، مکوم کردن، داوەری کردن، ناوبژی کردن.
**تحلیف**- مص. ع(تەهـلیف- tehlîf): سوێندان.
**تحـلیـل**- مص. ع(تـەهـلیـل- tehlîl): حەلاڵکردن، هەرس کردن، کردنەوە.
**تحمل**- مص. ع(تەهەمول- tehemul): سەبر کردن، حەوسەڵەبوون، تەحەمول.
**تحمیـد**- مص. ع(تەهمیـد- tehmîd): ســـوپاس کـــردن، ســـتـــایش کـــردن، شوکرانەبژێری، حەمدو سەناکردن.
**تحمیق**- مص. ع(تەهمیغ- tehmîx): گەوجاندن، بە گەوج زانینی کەسێک.
**تحـمیـل**- مص.ع(تەهمـیل- tehmîl): بارکـردن، بـارلێنان، سـەپاندنی کـارێک بە تۆبزی.
**تحول**- مص. ع(تەهەڤول- tehevvul): گۆڕان.
**تحـویل**- مص. ع(تەهڤـیل- tehvîl): گـــواســـتنەوە، گـــۆڕین، هەواڵەکـــردن، کۆچکردن.
**تحـیـات**- ا. ع(تەهیـیـات- tehîyat): درودو ســلاوان، ئافـەرین و شـوکـرانە، تەحیات.
**تحیت**- مص. ع. تەهییەت- tehîyet): سلاو و درووددان.

**تحیر**- مص. ع(تەهەیور- teheyyur): حەیرمان، سەرسام بوون، سەرگەردانی، داماوی.
**تخالف**- مص. ع(تەخالوف-texaluf): رک بەرکێ، رکابەری، هەڤرکی، گۆڕان، رەقەبەری.
**تخت**- ا(تەخت- text): تەخت، کورسی، تەختی پاشایی، مینەبەر، سەکۆ، عەرشی خوا.
**تختخواب**- ا(تەختی خاب- texti xab): تەختی نووستن، (دارین یان ئاسنین).
**تختەخە**- ا. ع(تەختەخە- textexe): لالەپەتە، تور.
**تخت روان**- ا.مر(تەختی رەڤان- texti revan): تەختی رەوان، تەخت رەوان، تەختێکە گەورە پیاوان لەسەری دادەنیشن و غولامان هەڵیدەگرن وەکو کەژاوە.
**تختگاە**- ا. مر(تەختگاە- textgah): شوێنی تەخت، شوێنی دانیشتنی شا، پایتەخت، بارەگای پاشا.
**تختە**- ا(تەختە- texte): تەختە، هەر شتێک تەخت بێ وەکو پارچە فەرش، پارچە زەوی.
**تختەقاپو**- ا. مر(تەختەغاپو- textexapû): ئاوایی نشین، نیشتەجێکردنی عەشایەری کۆچەری لە شار یان لە گوندو ئاوابیان.
**تختەنرد**- ا. مر(تەختەنەرد- textenerd): تەختە نەرد، تاوڵی.
**تخدیر**- مص. ع(تەخدیر- texdîr): بەنج کردن، سڕکردن.

**تخریب**- مص. ع(تەخریب- texrîb): وێران کردن، خەراپکردن، تێکدان، خاپوورکردن.
**تخس**- ص. عامیانە(توخس- tuxs): منداڵی شەڕانی و موزیر، چەموش، رمۆک، بێ کەڵک.
**تخش**- ا(تەخش- texş): تیر، تیروکەوان.
**تخش**- ا(تەخش- texş): سەری مەجلیس، باڵای مەجلیس.
**تخشا**- ص. فا(توخشا- tuxşa): کۆششکار، کۆشا، تەقەلادەر، زەحمەتکێش.
**تخشایی**- ا(توخشایی- tuxşayî): کارخانەی چەکسازی، کارخانەی چەکسازی تایبەتی سوپا.
**تخشیدن**- مص(توخشیدەن- tuxşîden): کۆشش کردن، هەوڵدان، تەقلادان، کۆشان.
**تخشا**- ص. فا(توخشا- tuxşa): کۆشا، کۆششکار، تەقەلادەر.
**تخصص**- مص. ع(تەخەسوس- texessus): پسپۆری، مەعلانی لە کارێکدا.
**تخصیص**- مص. ع(تەخسیس- texsîs): تایبەتداندن، تەرخان کردن.
**تخطئە**- مص. ع(تەختیئە- texti’e): هەڵەلێ گرتن.
**تخطی**- مص. ع(تەخەتتی- texettî): بەزاندن، هەنگاونان، لە حەد دەرچوون، پەڕینەوە.
**تخفیف**- مص. ع(تەخفیف- texfîf): سووک کردن، داشکاندنی نرخی شتێک،

بارسووک کردن.

**تخلخل**- مص. ع(تەخەلخول- texelxul): خرخاڵ لە پێ کردن، لێکهەڵوەشان، تێکچوون.

**تخلص**- مص. ع(تەخەلوس- texellus): رزگاریخوازی، رزگاربوون، نازناوی هەندێ شاعیر، تەخەلوس، لەقەب.

**تخلف**- مص. ع(تەخەلوف- texeluf): پاشکەوتن، پەیمان شکاندن،. بەڵێن نەبردنەسەر.

**تخلق**- مص. ع(تەخەلوغ- texellux): راهاتن، خووگرتن.

**تخلی**- مص. ع(تەخەلی- texellî): دەست بەردار بوون، خاڵی بوون، خۆ بەتاڵ کردن، خەڵوەتگرتن، تەنیایی.

**تخلید**- مص. ع(تەخلید- texlîd): نەمرکردن، زندووکردن، نەمری، جاویدانی.

**تخلیص**- مص. ع(تەخلیس- texlîs): خالیسەکردن، پاککردن، ئازادکردن، رزگارکردن، خولاسەکردن.

**تخلیط**- مص. ع(تەخلیت- texlît): ئاوێتەکردن، تێکەڵ کردن، درۆئامێزی، کار ئاڵۆزاندن.

**تخلیه**- مص. ع(تەخلییە- texlîye): چۆڵکردن، بەتاڵ کردن، جێ هێشتن.

**تخم**- ا(توخم- tuxm): تۆو، هێلکە، نەژاد، رەگ و بنەچەک، هەوێن، ئامیان، خای، خایە، هێک، هامیژەن.

**تخماق**- ا. ت(توخماغ- tuxmax): تۆخماخ، مێکوت.

**تخمدان**- ا. مر(توخمدان-tuxmdan): تۆودان، هێلکەدان.

**تخمه**- ا. ع(توخەمە- tuxeme): ئینتەلا.

**تخمه**- ا(توخمە- tuxme): ئەسڵ، نەژاد، رەچەڵەک، بنەچەک.

**تخمه**- ا(توخمە- tuxme): ناوکە کولەکەو کاڵەک و شوتی برژاو، برێشکە.

**تخمیر**- مص. ع(تەخمیر- texmîr): خومراندن، خومرە لە ناو کردن بە مەبەستی گەیاندن، هامیژەن کردن.

**تخمیس**- مص. ع(تەخمیس- texmîs): کردنە پێنج بەش، پێنج خشتەکی.

**تخمین**- مص. ع(تەخمین- texmîn): بەراورد، لێکدانەوە، خەمڵ کردن، ئەندازەگرتن بە مەزندە.

**تخویف**- مص. ع(تەخڤیف- texvîf): ترساندن، تۆقاندن.

**تخیل**- مص. ع(تەخەیول- texeyul): بەکارهێنانی خەیاڵ، خەیاڵ کردن، خەیاڵ و گومان کردن، فیزلێدان، ئەندێشەلێدان.

**تداخل**- مص. ع(تەداخول- tedaxul): تێکەڵاوبوون، چوونە ناو یەک.

**تدارک**- مص. ع(تەداروک-tedaruk): ئامادەکردن، فەراهەم کردن، چاک کردنەوە، پێ زانینی هەڵە.

**تداعی**- مص- ع(تەدائی- teda'î): شەرکردن، بانگکردنی یەکدی، لە مانایەکەوە پەی بردن بە مانایەکی دی. مانایەک، مانایەکی دیت وەبیر بێنێتەوە.

**تدافع**- مص. ع(تەدافوء- tedafu'): پاڵەپەستۆ، پاڵنانی یەکتری، بەرگریکردن، پاڵەپسکێ.

**تداول**- مص. ع(تەداڤول- tedavûl):

دان و ســەندن، دەست بەدەست گــێــڕان، باوپەیداکردن، باوبوون.

**تداوی**- مـص. ع(تـەداڤـی- tedavî): دەرمانکردن، خۆمالیجەکردن.

**تدبر**- مص. ع(تەدەببور- tedebbur): بیرکردنەوە، تەگبیرکردن، بیرکردنەوە لە ئاکامی کارێک، قولّبینی.

**تدبیــر**- مص. ع(تەدبیــر- tedbîr): تەگــبــیــرکــردن، راوێژکــردن، وردبینی و وریایی.

**تدخین**- مـص. ع(تـەدخین- tedxîn): دوکەلّ کردن، جگەرە کێشان.

**تدریج**- مـص. ع(تـەدریج- tedrîc): بەرەبەرە، پلە پلە، هێدی هێدی.

**تدریس**- مـص. ع(تەدریس- tedrîs): وانە گوتنەوە، دەرس دادان، دەرس دان.

**تدقیق**- مص. ع(تەدغـیغ- tedxîx): دیقەت کردن، وردبینی.

**تدلیس**- مص. ع(تەدلیس- tedlîs): فـریودان، شـاردنەوەی عـەیبی شــتــێک، هەلّخەلّەتاندن.

**تدمیـر**- مص. ع(تەدمیـر- tedmîr): وێران کـــردن، لەناو بردن، نەهێـــشتن، خاپوورکردن.

**تدنی**- مص. ع(تەدەننی- tedennî): بەرەبەرە نزیک بوونەوە، هاتنە خــوارەوە، نزم بوونەوە.

**تدویر**- مص. ع(تەدڤــیــر- tedvîr): دەوردان، سوڕانەوە.

**تدوین**- مـص. ع(تـەدڤین- tedvîn): دانان، تۆمارکردن، کۆکردنەوەی شیعر لە دیواندا.

**تدهین**- مـص. ع(تـەدهین- tedhîn): چەورکردن، رۆن پێداسووین.

**تدین**- مـص. ع(تـەدەیـیـــــــــــون- tedeyyun): دینداری، بەدین بوون.

**تذاکـر**- ا. ع(تەزاکــیــر- tezakir): یادەوەری، بیرخەرەوە، پاسەپۆرت، تۆماری ژیاننامەی شاعیران و نووسەران.

**تــذبــذب**- مـــص. ع(تــەزەبــزوب- tezebzub): رارایـــــی، دوودلّــــــی، دووڕوویی.

**تذرو**- ا(تەزەرڤ- tezerv): کەلّەشێری کێوی، قرقاولّ.

**تذکـار**- مص. ع(تەزکــار- tezkar): زیکرکردن، وەیادهێنانەوە، یادەوەری.

**تذکـــــر**- مص. ع(تـەزەککـــــور- tezekkur): پەندوەرگــرتن، یادکــردن، وەیادهێنان.

**تذکـره**- ا.ع(تەزکــیــرە- tezkire): بیرخەرەوە، تۆماری ژیننامەی شاعیران و نووســەران و عــارفــان، یادهێنەرەوە، نووسین، پاسەپۆرت.

**تذکیـر**- مص. ع(تەزکیـر- tezkir): بەنێرکردنی وشەیەک (مذکر)، بیرخستنەوە، دەرس دان، پەندادان، فێرکردن.

**تذکیە**- مص. ع(تەزکییە- tezkîye): هەلّگیرسان و خۆشکردنی ئاگر، سەربڕین، پەسندکردن.

**تذلل**- مـص. ع(تەزەلـول- tezellul): خواری کێشان، زەلیلی نواندن، کەساسی و زەبوونی.

**تذلیـل**- مص. ع(تـەزلـیـل- tezlîl): زەلیل کردن، سەرکوێرکردن، رامکردن.

**تذمیم**- مص. ع(تەزمیم- tezmîm): سەرکۆنە کردن، سەرزەنشت کردن.

**تذنیب**- مص. ع(تەزنیب- teznîb): پاشکۆدار کردن.
**تذهیب**- مص. ع(تەزهیب- tezhîb): زێرکاری، لە زێڕگیراو.
**تذییل**- مص. ع(تەزییل- tezyîl): درێژکردنی داوێن، شۆڕکردنی جل و بەرگ، پایین کردن، نووسین لە پەراوێزی بەرپەڕی کتێبان، پەراوێزنووسین.
**تر**- ص(تەڕ- ter): تەڕ، تازە، ئاودار، شێدار.
**ترا**- ا(تەرا- tera): دیواری بەرز، دیواری سەرای پاشایان و قەڵاو کاروانسەرایان، بەربەست.
**ترائب**- ا.ع(تەرائیب- teraib): پەراسوو بەند، ئێسکی دەفەی سینگ.
**تراب**- ا. ع(توراب- turab): خاک، خۆڵ، زەوی، ئاخ.
**تراب**- ا. مص(تەراب- terab): تکەی ئاو، چکان، تەڕەشوع- ئاو دەڵاندن، رتوبەت، نمداری.
**ترابیدن**- مص(تەرابیدەن- terabîden): دەڵاندن، تکان، چکان.
**تراپوتیک**- ص. فر(تراپوتیک- trapûtîk): دەرمانناسی، هونەری داو دەرمانکردنی نەخۆشی.
**تراجم**- ع(تەراجیم- teracim): بیۆگرافی، نووسین و لێکدانەوەو شرۆڤەی ژیانی کەسێک، ژیننامە، سەرگوزەشتە.
**تراخم**- ا. فر(تەراخوم- teraxum): تەراخوما، جۆرە نەخۆشییەکی چاوە.
**ترادف**- ع. مص(تەرادوف- teraduf): هاو واتایی، ریزبوون، ریزبەستن، ریزبەندی.
**تراز**- ا(تەراز- teraz): نەخش و نیگاری پارچە، گوڵدۆزی، پارچەی ئاوریشیمن.
**تراز**- ا(تەراز- teraz): تەرازووی دیاریکردنی بەرزی و نزمی ئاستی شتێک، تەرازوو.
**تراز**- ا(تەراز- teraz): بالانس (زاراوەیەکی بانکییە).
**ترازنامه**- ا. مر(تەرازنامە- terazname): بیلان، لیستێکە کە دەزگاکان لە کۆتایی ساڵدا دارایی و قەرزی خۆیانی تێدا دەنووسن.
**ترازو**- ا(تەرازوو- tetazû): داد، دادوەری، شایەن، تەرازوو، کۆمەڵە ئەستێرەیەکە، بورجی تەرازوو.
**تراژدی**- ا. فر(تیراژیدی- tirajidî): تراژیدی، نمایشی کارەسات ئامێز.
**تراس**- ا. فر(تیراس- tiras): سەربان، هەیوانی بەرین، بانێژە.
**تراش**- (تەراش- teraş): تاشین.
**تراشکار**- ص. فا(تەراشکار- teraşkar): تەراشکار، بەڕاد.
**تراشه**- ا(تەراشە- teraşe): قاژ، قاژی کاڵەک و شوتی، ئەوەی لە تاشینی دار یان شتی دی برژێتە سەر زەوی.
**تراشیدن**- مص(تەراشیدەن- teraşîden): تاشین، لە رەندەدان، سافکردنی دارو تەختە.
**تراشنده**- ا.فا(تەراشەندە- teraşene): کەسێک کە شتێک بتاشێت.
**تراشیده**- ا. مف(تەراشیدە- teraşîde): تاشراو.
**تراضی**- مص. ع(تەرازی- terazî):

رازی بــوون، لــێــکــدی رازی بــوون، ڕەزامەندی.

**ترافیک**- ا. انگل(ترافیک- trafîk): هاتووچۆ، مرور، ترافیک.

**تـراک**- ا(تـەراک- terak): دەنــگــی شکانی شتێک، درز، قلّیش.

**تراکـتـور**- ا. فـر(تراکـتـور- traktur): تراکتۆر، مەکینەی جووت.

**تراکم**- مص. ع(تەراکوم- terakum): کۆمـەڵ بوون، کەڵەکە بوون، بەسـەریەکدا کەوتن.

**ترام**- ا. فر(تیرام- tiram): پۆ.

**تراموای**- ا. فر(ترامڤای-tiramvay): تراموای، قیتاری کارەبایی ناو شار.

**ترانزیت**- ا. فـر(تیـرانزیت- tiranzît): ترانسێت، تێپەڕینی کەلوپەلی بازرگانی لە ولاتـێـکەوە بـۆ ولاتـێـکـی دی بەبێ دانـی گومرگ.

**ترانزیسـتـور**- ا. انگـل(تیـرانزیسـتـور- tranzistur): ترانسیستەر.

**ترانســپــورت**- ا. فــر(ترانســپــورت- transpurt): نەقڵ و ئینتــیـــقـــال، راگوێزان.

**ترانسفورماتور**- ص.فر(تیرانسفورماتور- tiransformator): ئامـێـرێکە بۆ کـەم کـردنەوەو زۆرکـردنی وزەی کـارەبا بەکـار دێ.

**ترانه**- ا. ص(تەرانە- terane): ستران، گــۆرانی، ئاواز، تەڕو تازە، مــاشــوقی جوانکیلە، قشت، چوارینە.

**تراورس**- ا. فر(تیراڤەرس- tiravers): تراوەرس، تەختـەو لەوحی ئەسـتووری ژێر ڕێڵی سکەی قیتار.

**تراوش**- ا. مص(تەراڤیش- teravîş): تەڕەشوع، ئاو دەلان.

**تراولرزچک**- ا. انگل(تراڤیلەرسچەک- travilers çek): چەکی سـەفـەری، چەکـێکە لە بانک دەدرێ بە مـوسافـیـر و مـوسافـیـر دەتوانێ لە هەر ولاتێکا بیـەوێ پارەکەی لە بانکی ئەوێ وەربگرێت.

**تراویح**- ا. ع(تەراویە- teravih): ئەو بیـسـت رکـاتە نوێژەی کـە لە شـەوانی رەمــەزاندا، پاش نوێژی شـێـوان دەکـرێ، تەراویح، کـورتە دانیـشـتنی دوای چوار رکات نوێژ لە شەوی رەمەزاندا.

**تراویدن**- مص(تەراڤـیـــدەن- teravîden): تەرەشوع کـردن، دەلاندنی ئاو، تەڕایی.

**تراوش**- ا.مص(تەراڤیش- teravîş): تەڕەشوع، رتوبەت، شێداری.

**تراونده**- ا. فـــا(تەراڤــــەندە- teravende): شـەربە یان گـۆزەیەک ئاو بدەلێنێ.

**ترب**- ا(تورب- turb): ترپ، تور، تڤر.

**ترب**- ا(تەرب- terb): حـیلە، فـێڵ، فشە، زمـان لووسی، رەفـتـار لە رووی ناز یان تۆرانەوە.

**ترب**- ا. ع(تورب- turb): خۆڵ، خاک، ئاخ.

**تـرب**- ص. ع(تـرب- tirb): هــاوزا، هاوساڵ، بەزا.

**تربار**- ا. مر(تەڕبار- terbar): تەڕەبار، باری میوەی بێستان.

**تربانتین**- ا. فـــر(تیـــری بانـیتن- tiribantîn): شـۆک، شـۆبە، شـۆکـە، شـــیلەیەکـە هەندێ درەخت دەریدەدا لە

کەتیرە دەچێت.

**تربت**- ا. ع(توربەت- turbet): خاک، خۆڵ، گۆڕ، مەزار، ئارامگە، قەور، ئاخ.

**تربچە**- ا(توربچە- turbçe): توور، تڤر.

**تربص**- مص. ع(تەرەبوس- terbus): چاوەڕوانی، نیگەران بوونی رووداو.

**تربیت**- مص. ع(تەربیەت- terbîyet): پەروەردەکردن، تەربێت دان، فێرکردنی ئەدەب و ئەخلاق، هەڤووت.

**تربیع**- مص. ع(تەربیئ- terbî’): دابەشکردن بەسەر چوار بەشدا، چوار قۆڵی.

**ترپیل**- ا. فر(تورپیل- turpîl): ئەژدەر، جۆرە چەکێکە بۆ غەرقکردنی کەشتی دوژمن بەکار دێت.

**ترت و مرت**- ص. مر(تەرت و مەرت- tertu mert): تەرتەو وەرتە، تارومار، پەرت و بلاو، تالان و برۆ.

**ترتیب**- مص. ع(تەرتیب- tertîb): رێکخستن، رێک و پێک کردن.

**ترتیزک**- ا. مر(تەڕتیزەک- tertîzek): تەڕەتیزە.

**ترتیل**- مص. ع(تەرتیل- tertîl): قسەکردنی سوارو رەوان، خوێندنی قورئان بە دروستی و دەنگی خۆش.

**ترجمان**- ص. ع(تەرجومان- tercuman): تەرجومان، وەرگێڕ، پاچڤەکەر، دیلمانج.

**ترجمه**- مص. ع(تەرجەمە-terceme): وەرگێڕان، تەفسیرو شرۆڤە، بیوگرافی، پاچڤەکرن.

**ترجیح**- مص. ع(تەرجیح- tercîh): داشکان بەلایەکدا، تەفزیڵ دان، تەفزیڵ کردن.

**ترجیع**- مص. ع(تەرجیئ- tercî’): گەڕاندنەوە.

**ترجیع بند**- ا. مر(تەرجیئ بەند- tercî’ bend): تەرجیع بەند.

**ترحم**- مص. ع(تەرەهوم-terehhum): رەحم کردن، میهرەبانی، بەزەیی هاتنەوە.

**ترحیب**- مص. ع(تەرهیب- terhîb): خێرهێنان، مەرحەباکردن، پێشوازی کردن، بەرین کردنی شوێن.

**ترحیم**- مص. ع(تەرحیم- terhîm): رەحمەت ناردن بۆ مردوو، میهرەبانی کردن، لوتف کردن.

**ترخون**- ا(تەرخون- terxûn): تەرخون، جۆرە سەوزەیەکە بۆ خواردن.

**ترخیص**- ع. مص(تەرخیس- terxîs): روخسەتدان، مۆڵەت دان، هەرزان کردن.

**ترخیم**- مص. ع(تەرخیم- terxîm): نەرمە گۆڕانی، کلک برین، قولە کردن، نەرم کردنی ئاواز.

**ترد**- ص(تورد- turd): تەڕو تازە، ناسک، تورت، هەر شتێک زوو بشکێ.

**تردامن**- ص. مر(تەڕدامەن- terdamen): داوێن تەڕ، داوێن پیس، بەدناو، گوناحکار، تاوانبار.

**تردد**- مص. ع(تەرەددود- terddud): هاتووچۆ، دوو دڵ بوون، ڕاڕایی، ئیسهال و سکچوون.

**تردست**- ص. مر(تەردەست- terdest): تەڕدەس، چوست و چالاک، لێهاتوو، زرینگ، فێڵباز.

**تردید**- مص. ع(تەردید- terdîd):

رەتكردنەوە، دانەوە، دوو دڵ كــــردن، دوو دڵی، ڕاڕایی.

**ترزبان**- ص. مر(تەڕزەبان-terzeban): تەڕ زمان، زمان تەڕ، دەم تەڕ، قسەزان.

**ترس**- ا(تەرس- ters): ترس، خۆف.

**تــرس**- ا. ص(تــوروس- turus): زەوی سـەخت و ڕەق، ئەرزێک کـە بێڵ کـاری تێ نەکات و بە زەحمەت هەڵکەنرێ.

**ترس**- ا.ع(تورس- turs): ســەنگەر، مەتاڵ، سپەر، قەڵغان.

**ترسا**- ص. فا(تەرسا- tersa): ڕەبەن، مەسیحی، عیسایی مەزەب، خواناس.

**ترســان**- ص. فـا(تەرسـان- tersan): لە خوا ترس، ترسكار، زاهید.

**تـرســــانـدن**- مـص(تـەرســــانـدەن- tersanden): ترساندن، تۆقاندن.

**ترســـاننده**- ا. فـــا(تەرســـانەندە- tersanende): ترسـێنەر، كـەسـێک یەكێكی دی بترسێنێ.

**ترسكار**- ص. فا(تەرسكار- terskar): تەركە دنیا، لە خوا ترس، ترسكار، زاهید، عیسایی مەزەب.

**ترسل**- مص- ع(تەرەســول- terssul): نامەنووسین.

**تـرسـنـاک**- ص. مـــــــر(تـەرسـنـاک- tersnak): ترسناک، بەترس، بەخۆف.

**ترســو**- ص(تەرســو- tersû): ترسنۆک، بێ دڵ، بێ جورئەت، بێورە، نەوێر.

**ترسیدن**- مص(تەرسیدەن- tersîden): ترسان، خۆف كردن.

**ترسنده**- ا.فـا(تەرسـەندە- tersende): كەسێک كە بترسێت.

**ترســـــیـــــده**- ص. مف(تەرســــیــــدە- tersîde): ترساو.

**ترســیم**- مص. ع(تەرســیم- tersîm): ڕەسم كــــردن ، نـیـــــشــــانـە دانـان، نەخشەكێشان.

**ترش**- ص(تورش- turş): تـورش، هـەر شتێ كە تامی سركە بدات، ترش، سماق.

**ترشـا**- ا(تورشـا- turşa): دڵـەكـزێ، ترشانی گەدە.

**ترشح**- مـص(تەرەشــوه- tereşşuh): تەڕەشوع، دەڵان.

**ترشـرو**- ص. مـر(تورش ڕو- turşrû): توڕە، ڕووگرژ، توندەخوو، مۆن.

**ترشـک**- ا(تـورشـــــــەک- turşek): ترشۆک، ترشۆكە.

**ترشی**- ا(تورشی- turşî): ترشیات.

**ترصد**- مص. ع(تەرەسود-teressud): چاودێری، نیگابانی، چاوەڕوانی.

**ترصــیع**- مص. ع(تەرسیء- tersî’): جەواهێرنیشان.

**ترضـیه**- مص. ع(تەرزییە- terzîye): ڕازی كردن، خۆشحاڵ كردن.

**ترعه**- ا.ع(تورئە- tur’e): كەناڵی ئاو، وەكـو كـەنـاڵی سـوێس، دەرگـا، بـاخـچـە، زاركی جۆگە یان ئەستێڵ.

**ترعـــیب**- مص.ع(تەرئیب- ter’îb): ترساندن.

**ترغـیب**- مص. ع(تەرغـیب- terxîb): هێنانە كـەڵكەڵە، هێنانە ڕەغـــبـــەت و ئارەزوو.

**تــرف**- ا. مــص. ع(تــەرەف- teref): خۆشگوزەرانی.

**ترفند**- ا. ص(تەرفـــەند- terfend): فێڵ، درۆ، قسەی بێهودە، هەرزەوێژی.

**ترفــه**- مص(تەرەفــوهـ- tereffuh): ئاسوودەیی، خۆشگوزەرانی.

**ترفـــيع**- مص. ع(تەرفیء- terfî’): بەرزکـردنـەوە، بەرزبوونەوە، بـەرزکـردنەوەی پلە.

**ترفـــينه**- ا(تەرفـــینە- terfîne): کەشکین، کەشکاو، کەشکەوا.

**ترفـيه**- ع- مص(تەرفـیـهـ- terfîh): رەفاهیەت، ئیسراحەت و خۆشگوزەرانی.

**تـرقـب**- مـص. ع(تـەرەغـــــــوب- terexxub): چـاودێـری، چـاوەڕوانـی، پاسەوانی، نیگابانی.

**تـرقـص**- مـص- ع(تـەرەغـــــــوس- terxxus): سـەمـا کـردن، رەقـسین، هەڵپەرکێ.

**ترقـوه**- ا ع(تەرغـوڤـه- terxuve): چەڵەمە.

**ترقه**- ا(تەرەغە- terexe): تەرەقە.

**تـرقـی**- مـص. ع(تـەرەغـی- terexî): تەرەقی، پێشکەوتن، بەرزبوونەوە.

**ترقـــيع**- مص. ع(تەرقیء- terxî’): پینەکـردن، پێکەوە دروونی پارچەی چوار گۆشەی رەنگاو رەنگ.

**ترقـيم**- مص. ع(تەرغـیم- terxîm): نووسین، خەت کێشان، ژمارەلێدان.

**ترک**- ا(تەرەک- terek): خـــەنـەکی دەوری حەسـارو قـەڵاو بـاغ و ئەو شـتـانە، درز، قلّیش.

**ترک**- ا(تەرک- terk): کڵاوخود.

**ترک**- ا(تەرک- terk): تـەرک، بـەشی دواوەی زین کە هەگبەی لەسەر دادەبەستن.

**ترک**- مـص. ع(تـەرک- terk): تـەرک کردن، وازلێهێنان، دەستبەرداربوون.

**ترکـــاندن**- مـص(تـەرکـــانـدەن- terkanden): تـورکـانـدن، تـەقـانـدن، شکاندن، درز تێکەوتن.

**ترکـــاننده**- ا. فـــا(تەرکـــانەندە- terkanende): تـورکـــێـنەر، ئـەوەی شتێک بتروکێنێ، ئەوەی درز بخاتە شتێ.

**ترکتـاز**- ا.مص(تورک تاز- turktaz): هێرشی خێراو لەنکاو بە مەبەستی تاڵان و بڕۆ (وەکو تورکانی کۆن).

**ترک جـــوش**- ا(تـورک جــــوش- turk cûş): گۆشتی نیوە کوڵ، گۆشتاو یان هەر خواردنێ کە گۆشتەکەی نیوە کوڵ بێ.

**ترکش**- ا(تەرکەش- terkeş): تیردان.

**ترکـــه**- ا. ع(تـەریـکـە- terike): پاشـمـاوە، مـیـرات، ئەو مـاڵەی لە پاش مردوو بە جێ دەمێنێ.

**ترکه**- ا(تەرکە- terke): تەرکە، شـول، تول، شولک.

**ترکـيب**- مص. ع(تەرکـیب- terkîb): ســوارکـــردن، لێکدان، تێکەڵ کـــردن، ئاوێتەکردن.

**ترکـــيب بند**- ا(تـەرکـــیب بەنـد- terkîbbend): تەرکیب بەند.

**ترکیدن**- مص(تەرکیدەن- terkîden): تەرەکین، درزبردن، قلّیشان، تەقین.

**ترکیده**- ا. مف(تەرەکیدە-terekîde): درزبردوو، شەق بردوو، قەڵەشاو، تەقیوە.

**تـرلان**- ا(تـەرلان- terlan): تـەڕلان، مـەلێکی راوکـەرە لە تیـرەی بـازو شەهێن.

**ترلیـون**- ا. فـر(ترلیـون- tirlliyûn): هەزار میلیارد.

**تریلیون**- ا. فر(تریلیون- tirîlîyun): هەزار بلیون.

**ترم**- ا. فر(تیرم- tirm): کۆتایی، دوایی، سەرەنجام، مۆڵەت، ماوە، بەش، بڕ، بنەتا.

**ترمز**- ا(تورموز- turmuz): ئوستۆپ.

**ترموس**- ا. انگل(تیرمۆس- tirmos): ترمۆز.

**ترمومتر**- ا. فر(تیرمومیتر- tirmumitr): گەرماپێو، تیرمۆمەتەر.

**ترمه**- ا(تیرمە- tirme): تورمە، سرکەیی، هەوری.

**ترمه**- ا(تەرمە- terme): لبادی ژێر زینی ئەسپ، نەرمەزین.

**ترمیم**- مص. ع(تەرمیم- termîm): چاک کردنەوە، نوێژەنکردنەوەی بینا.

**ترن**- ا. فر(تیرەن- tiren): قیتار، سکەی قیتار، شەمەندەفەر.

**ترن**- ا. مر(تەرەن- teren): نەستەرەن، جۆرە گوڵە باخێکی بچووکە.

**ترناس**- ا(تەرناس- ternas): ترینگە، ئەو دەنگەیە کە لە کاتی تیرهاویشتندا لە کەمانەوە دێ.

**ترنانه**- ا(تەرنانە- ternane): پێخۆر.

**ترنج**- ا(تورەنج- turenc): ترنج، کەبات.

**ترنج**- ا(تورونج- turunc): تێک ترنجاو، چیندار، وشکەوەبوو.

**ترنجبین**- ا(تەرەنجەبین- terencebîn): جۆرە گەزۆیەکە، ترنجەمین، دەرمانێکە لە گیاو درکی وشترالوک ساز دەبێ.

**ترنجیدن**- مص(تورونجیدەن- turuncîden): ترنجان، ترنجاندن.

**ترنجیده**- ا. مف(تورونجیدە- turuncîde): تێ ترنجاو، بەزۆری تێ خراو، تێ ئاخنراو.

**ترنگ**- ا(تەرەنگ- tereng): ترینگەی ژێی تار، دەنگی ژێی کەوان لە کاتی تیر هاویشتندا.

**ترنگیدن**- مص(تەرەن گیدەن- terengîden): ترنگانەوە.

**ترنم**- مص. ع(تەرەننوم- terennum): گۆرانی گوتن، نەرمە گۆرانی بە دەنگ و ئاوازی خۆش.

**ترنیان**- ا(تەرەنیان- tereniyan): تلیانە، قەرتاڵە، سەبەتە، تریانە.

**تروال**- ا(تەرڤال- terval): لقی ناسکی درەخت، شول، تەرکە، گەڵای گیا، لاسکی گیا.

**تروپ**- ا. فر(تروپ- trup): دەستە، گرووپ، تاقمێک کە یەک کاریان هەبێ.

**ترور**- ا. فر(تیرور- tirur): تیرۆر، ترساندن، کوشتن و لە نێو بردنی ناحەزو نەیار، ریپدان، لێخەفتان.

**تروریست**- ص. فر(تیروریست- tirurîst): تیرۆریست، پیاوکوژ، ئەوەی بۆ گەییشتنە مەبەست کەسێک غافڵ کوژ بکات، غافڵ کوژ، ریپدەر.

**تروریسم**- ا. فر(تیروریزم- tirurîsim): تیرۆریزم، کردەی تیرۆر.

**تروست**- ا. انگل(تروست- trust): هاوکاری چەند دەزگایەکی پیشەسازی یان بازرگانی بۆ بەرقەرارکردنی نرخ.

**تراست**- ا. انگل(تراست- trast):

**ترومبون**- ا. فر(تیرومبون- tirumbün): جۆرە سازێکی هەواییە لە

ترامپێت دەچێت.

**ترومـــپت**- ا. فــــر(تیــــرومــــپــــیت- tirumpît): ترامپێت.

**ترویج**- مص. ع(تەرڤــــیج- tervîc): ڕەواج پێ دان، ڕەواکــردن، حــەلاڵ کــردن، هەڕەمین کردن.

**ترویحه**- ا. ع(تەرڤـیـهـە- tervîhe): دانیشتن، سوکە پشوو، (بڕوانە تەراویح).

**ترویه**- مص. ع(تەرڤـیـیـە- tervîye): پاراوکــردن، ئاو هەڵگرتن بۆ ســەفــەر، هزرکــردن لە کــارێکدا، ڕۆژی هەشــتــەمی ذیحەجە کە دەستپێکی حەجە.

**تره**- ا(تەڕە- tere): جۆرە سەوزەیەکە.

**ترهات**- ا. ع(تـوڕەهـات- turehat): تـوڕەهات، قـــســـەی قـــۆڕو بێ مـــانـا، هەرزەوێژی.

**تـــرهـــب**- مـــص. ع(تـــەرەهـــوب- terehhub): ڕەبەنایەتی، بـوونە ڕەبەن، عیبادەت کردن.

**ترەبار**- ا. مـــــر(تەرەبار- terebar): تەڕەبار، باری مـیـوەی بێـسـتـان، سـەوزەو میوەجات.

**تـــرهـــه**- ا. ع(تـــوڕەهـــە- turehe): هەرزەوێژی، قسەی قۆڕ، توڕەهات.

**ترهیب**- مص. ع(تەرهـیب- terhîb): ترساندن، تۆقاندن، ڕیپدان.

**تریاق**- ا. ع(ترياغ- tiryax): تلیـاک، ئەفیون، بەنج، بەنگ.

**تریاک**- ا(تەریاک- teryak): تلیـاک، تریاق، ئەفیون.

**تریان**- ا(تەریان- teryan): تلیـــانە، قەرتاڵە، سەبەتە.

**تریبـــون**- ا. فـــر(تریبـــون- tirîbûn): تریبۆن، سەکۆ، مینبەر، مەنەسە.

**تریبــــــه**- ا. ع(تەریبــــــە- terîbe): پەراسووبەند، دەفەی سینگ.

**تریت**- ا(تیـــــریت- tirît): تـریت، نـان تێگوشە، نانەولا.

**تریز**- ا(تیــریز- tirîz): تیــرێژ، گــرۆڵ، سێ سوچێک لە پەراوێزی کراسدا.

**تریشـه**- ا(تەریشـە- terîşe): تەریشـە، کۆزەری دار، وردە کاغەز، ئاردی دار.

**تریشین**- ا. فــــر(تیــــریشـین- tirîşîn): جۆرە کرمێکی مێملە.

**تریکۆ**- ا.فـــر(تریکۆ- trîko): جــۆرە قوماشێکە.

**تز**- ا. فر(تیز- tiz): تێز، کۆتایی نامە، نامەی دکتۆرا، نامەیەک کە خوێندکار پاش تەواو کردنی زانکۆ دای دەنێ و لە کۆڕێک دا بەرگری لێ بکات.

**تزاحم**- مص. ع(تەزاهوم- tezahum): قەرەباڵغی کردن، خڕبوونەوەو تێکچڕژانی خەڵک لەیەک شوێنا، هەیشەتی کردن.

**تزاید**- مص. ع(تـەزایـود- tezayud): زیاد بوون، زۆربوون.

**تـزریـق**- مـص. ع(تــەزریـغ- tezrîx): دەرزی لێدان، شرینقە لێدان.

**تزکیه**- مص. ع(تەزکـیـیـە- tezkîye): زەکـاتدان، هەڵبـژاردن، پەسندکـردن، پاک کردن.

**تزلزل**- مص. ع(تەزەلزول-tezel zul): لەرزین، جــولان، ســـست بوون، بزوتـن، شلەژان.

**تزوج**- مـص. ع(تـەزەڤـــــــڤـــــــوج- tezevvuc): زەوجین، زەماوەند کردن.

**تزویج**- مـص. ع(تـەزڤــیـج- tezvîc):

زەماوەند کردن، هاوسەرگرتن.

**تزویر**- مص. ع(تەزڤیر- tezvîr): درۆکردن، درۆ رێکخستن، حیلە کردن، فریودان، ساختە، ساختەکاری.

**تزیید**- مص. ع(تەزیید- tezyîd): زیاد کردن.

**تزیین**- مص. ع(تەزیین- tezyîn): رازاندنەوە، جوان کردن، خەملاندن.

**تژ**- ا(تیژ- tij): چرۆ، چوزەرە، چەکەرە، چەقەرە.

**تسامح**- مص. ع(تەساموه- tesamuh): ئاسان گرتن، لێبوردەیی.

**تساوی**- مص. ع(تەساڤی- tesavî): یەکسانی، بەرابەری.

**تساهل**- مص. ع(تەساهول-tesahul): ئاسانکاری، نەرمی نواندن، گوێ نەدان.

**تسبیح**- مص. ع(تەسبیح- tesbîh): سوبحانەڵلا گوتن، یادکردنی خوا بە پاکی، تەزبێح.

**تست**- ا. انگل(تیست- tist): تێست، تاقیکردنەوە، ساوکەکردنەوە.

**تسجیع**- مص. ع(تەسجیء- tescî'): سەجەع بێژی، قسەکردنی سەروادار.

**تسجیل**- مص. ع(تەسجیل- tescîl): تۆمارکردن، پەیمان بەستن، مۆرکردنی قەواڵە.

**تسخر**- مص. ع(تەسەخور- tesexxur): سوخرەکاری، سوخرە، بێگاری، رام بوون، زەلیل بوون.

**تسخیر**- مص.ع(تەسخیر- tesxîr): رام کردن، زەلیل کردن، کەساس کردن، بێگاری پێ کردن.

**تسدیس**- مص. ع(تەسدیس- tesdîs): کردن بە شەش بەشەوە، شەش پاڵوو، شەش قوڵی.

**تسریع**- مص.ع(تەسریء- tesrî'): خێراکردن، بلەزکردن.

**تسطیح**- مص. ع(تەستیه- testîh): هەموارکردن، پان کردن، هەموارکردنی زەوی.

**تسع**- ا.ع(تووسء- tus'): نۆیەک.

**تسع**- ا. ع(تیسء- tis'): نۆ، ژمارە نۆ.

**تسعون**- ا. ع(تیسعون- tis'ûn): نەوەد.

**تسعیر**- مص.ع(تەسئیر- tes'îr): نرخ دانان، دیاری کردنی نرخ و بەهای شتێک.

**تسقیه**- مص. ع(تەسغییە- tesxîye): ئاودان، پاراوکردن.

**تسکین**- مص.ع(تەسکین- teskîn): دڵدانەوە، ئارام کردن، هێوراندن، سوکنایی دان.

**تسلسل**- مص. ع(تەسەلسول- teselsul): ریز، زنجیرە، یەک لە دوی یەک.

**تسلط**- مص. ع(تەسەللوت- tesellut): زاڵ بوون، باڵادەست بوون، باڵا دەستی بەسەر کەسێکا.

تسلی- مص. ع(تەسەلی- tesellî): خەلەسین لە خەم، سەبوری، تەسەلاهاتن، سوکنایی هاتن.

**تسلیت**- مص.ع(تەسلییەت- teslîyet): دڵدانەوە، سەرەخۆشی، سەر سەلامەتی، رەخسین لە پەژارە.

**تسليح**- مص.ع(تەسلیـــهـ- teslîh): چەک پێـــــــــدان، چەک هەڵگرتـن، چەکدارکردن.

**تسليم**- مص. ع(تەسلیم- teslîm): خۆوەدەستەوەدان، تەسمیل.

**تسمه**- ا(تەسمە- tesme): قایشی چەرم، قایش.

**تسميط**- مص. ع(تەسمیت- tesmît): هەڵواسینی شتێک، رەهاکردنی قەرزدار، مسەمەت (لەشیعردا)، خامۆش بوون.

**تسميه**- مص. ع(تەسمییە- tesmîye): ناونان.

**تسنن**- مص. ع(تەسەننون- tesennun): قەبوڵ کردنی سونەت و تەریقەت، ئەهلی سونەت، سونەتگەرایی.

**تسنيم**- مص. ع(تەسنیم- tesnîm): پڕکردنی قاپ، ناوی سەرچاوەیەکە لە بەهەشت.

**تسو**- ا(تەسو- tesû): یەک سەعات لە ٢٤ سەعاتەی شەوو رۆژ، حەببە.

**تسويد**- مص. ع(تەسڤید- tesvîd): رەشکردن، رەشنووس، رەشنووسی.

**تسويه**- مص. ع(تەسڤییە- tesvîye): راستکردنەوە، یەکسان کردن، تەخت کردن، بەرانبەری.

تسهيل- مص. ع(تەسهیل- teshîl): ئاسانکردن، ئاسانکاری.

**تسهيم**- مص. ع(تەسهیم- teshîm): بەش بەش کردن، بەشدارکردن، بەشبەندی.

**تشائم**- مص. ع(تەشائیم- teşa’im): رەشبینی، بێ ئومێدی.

**تشابه**- مص.ع(تەشابوه- teşabuh): لێکچوون، چونیەکی.

**تشاجر**- مص. ع(تەشاجور- taşacur): ململانێ، قەرقەشە، وەشەڕهاتن، رق بەرقێ.

**تشبث**- مص.ع(تەشەببوس- teşebbus): تەشەبوز، رووڵێنان، چنگ لێ گیر کردن.

**تشبه**- مص. ع(تەشەبوه- teşebuh): هاو شێوەبوون، لاسایی کردنەوەی کەسێک.

**تشبيب**- مص. ع(تەشبیب- teşbîb): یادکردنی رۆژگاری گەنجی و دڵداری و کامەرانی، هێنانەوەی چەند بەیتێک لەمەڕ عەشق و جەوانی یان وەسفی سروشت لە سەرەتای قەسیدەدا.

**تشبيه**- مص. ع(تەشبیهـ- teşbîh): شوبهاندن.

**تشت**- ا(تەشت- teşt): تەشت.

**تشتت**- مص. ع(تەشەتتوت- teşettut): پەریشان بوون، پەراگەندە بوون، پەرتەوازەبوون.

**تشتر**- ا(تیشتەر- tişter): ناوی خواوەندێکە لە ئایینی زەردەشتیدا، فریشتەی باران، بەلاتینی سیروس-ی پێ دەڵێن.

**تشجيع**- مص. ع(تەشجیء- teşcî’): جورئەت خستنەبەر، هاندان، گاڵدان.

**تشخص**- مص. ع(تەشەخوس- teşexxus): گەورەبوون، گەورەیی، بەشەخسیەتی، بەکەسایەتی بوون.

**تشخيص**- مص. ع(تەشخیس- teşxîs): جیاکردنەوەی شتێک لە شتێک، ناسینەوە، دیاریکردن.

**تشدد**- مص. ع(تەشەددود-

teşeddud): ڕەقــی نــوانــدن، تــونــدی کردن.
**تشــدید**- مص. ع(تەشــدید- teşdîd): سەختگیری، توندگیری، قایم کردن.
**تشر**- ا(تەشەر- teşer): تەشەر، تانە، قسەی توێکلّدار.
**تشـــــرف**- مـص. ع(تـەشـــــەڕوف- teşeruf): گەورەبوون، شەرەف پێ بڕان، مشەڕەف بوون.
**تشــریح**- مص. ع(تەشــریه- teşrîh): شەرح و شرۆڤەکردن، توێکاری.
**تشــریع**- مص. ع(تەشــریء- teşrî’): روونکردنەوەی رێگە یان شـــەریعـــەت. دەستووردانان.
**تشــریف**- مص.ع(تەشــریف- teşrîf): شــەرەف پێـدان، هاتن، پێـشــوازی کـردنی ئابرومەندانە.
**تشــریق**- مص. ع(تەشــریغ- teşrîx): روو کـــــردنە رۆژهەڵات، جـــــوان بوون، وشکەوەکردنی گۆشت لەبەر هەتاو.
**تشریک**- مص. ع(تەشریک- teşrîk): شەریک کردن، بەستنی قەیتانی پێڵاو.
**تشــرین**- ا(تیـشــرین- tişrîn): هەردوو مانگی ١٠ و ١١.
**تشـــــعب**- مـص. ع(تـەشـــــەئوب- teşe’ub): پــەراگـــــــــــەنـدەبـوون، پەرتەوازەبوون، پەرت و بڵاوبوونەوە، لق لێ بوونەوە، تەرزلێبوونەوە.
**تشـــعـــشع**- مص. ع(تەشـــەءشـــوء- teşe’şu’): درەخشانەوە، درەوشانەوە.
**تشـفی**- مص. ع(تەشــەفی-teşefî): ئارام بـوونەوە، چاکـبـوونـەوە، ئاسـوودەیی دڵ.
**تشک**- ا(توشـەک- tuşek): دۆشـەک، دۆشەگ.
**تشکر**- مص. ع(تەشەکور- teşekur): تەشەکور، سوپاس، منەت.
**تـشـکـل**- مـص. ع(تـەشـــــــەککـول- teşekkul): شـــێـــوە پەیدا کـــــردن، پێکهاتەبوون.
**تـشـکـیـک**- مـص. ع(تـەشـکـیـک- teşkîk): خستنە گومانەوە.
**تشکیل**- مص. ع(تەشکیل- teşkîl): دروست کردن، بەرپاکردن، دامەزراندن.
**تشمیم**- مص. ع(تەشمیم- teşmîm): بۆن کردن.
**تـشـنـج**- مـص. ع(تـەشـــــــــەنـنـوج- teşennuc): تێکشـکانـی ئازای بـەدەن، ڕەق بوون، لەرزین، گرژبوون.
**تشنە**- ص(تیشنە- tişne): تینوو.
**تشنیع**- مص. ع(تەشنیء- teşnî’): جنێـودان، ئاشکراکـردنی عـەیب و عـار، ریسواکردن.
**تشـویر**- مص. ع(تەشـڤـیـر- teşvîr): ئاماژەکردن، شەرمەزارکردن، شەرمەزاری، ئاژاوە.
**تشویش**- مص. ع(تەشڤیش- teşvîş): تێکدان، پێکدادان، ئاڵۆزکان، شێواندن.
**تشویق**- مص. ع(تەشوڤیغ- teşvîx): هێنانە شەوق، بە ئارەزوو هێنان، ستایش و ئافەرین، هاندان.
**تشـــــهـــد**- مص. ع(تەشـــەههود- teşehhud): شایەت خوازتن، ئاماژەو گەواهی، شادەهێنان.

**تشی**- ا(تەشی- teşî): سیخوڕ، سیخ چووله.

**تشـــیخ**- مص. ع(تەشـــەییـــوخ- teşeyyux): پیربوون.

**تشـــیع**- مص.ع(تەشـــەییـــوع- teşeyyu’): پەیڕەوی کـــردن، بوونە شیعە، شیعەگەرایی.

**تشیید**- مص. ع(تەشیید- teşyîd): بیناکردن، بەرزکردنی دیوار یان خانوو.

**تشییع**- مص- ع(تەشییع- teşyî’): بەڕێکردن، بەشـداری کـردن لە ناشـتنی مردوودا.

**تصـــاحب**- مص. ع(تەســـاهوب- tesahub): داگیرکـردن، زەوتکردن، بە خاوەن بوون، دەست بەسەراگرتن، بەدەست هێنان.

**تصـــادف**- مص. ع(تەســـادوف- tesaduf): رووبەڕووبوونەوەی یەکـتـر، گـەییـشـتنە یەکـدی بەرێکەوت، پێک گەیشتن، تەسادوف، حادیسە.

**تصـــادم**- مص. ع(تەســـادوم- tesadum): پێکدادان، تامپۆن.

**تصاریف**- ا. ع(تەساریف- tesarîf): رووداوێن رۆژگـــار، دەورانی زەمـــانە، کارەساتێن رۆژگار.

**تصـــاعـــد**- مص. ع(تەســـائود- tesa’ud): بەرزبوونەوە، چوونە سەر.

**تصـــانیف**- مص. ع(تەســـانیف- tesanîf): پـۆلێـن کـــردن، نووسین و رێکخستنی کتێب، شیعر گوتن، جۆرە شیعرێکە بە گۆرانی دەگوترێ.

**تصاویر**- ع(تەساڤیر- tesavîr): وێنە، نیگاران، پەردەی نیگارکێشی.

**تصحیح**- مص. ع(تەسهیه- teshîh): راستکردنەوە، هەڵەگیری، هەڵەچنی، هەڵەبژێری.

**تصـــحـــیف**- مص. ع(تەســـهـــیف- teshîf): هەڵەکردن لە نووسیندا، گۆڕینی وشـــە بە کـــەم کـــردن یا زیاد کـــردنی خاڵەکانی، یان جێگۆڕکێی پیتەکانی.

**تصـــــدق**- مص. ع(تەســـــەددوغ- tessedux): سەدەقەکردن، خێرکردن، بەلاگەردان، بەلاوەگێڕ.

**تصدی**- مص. ع(تەسەددی-teseddî): هاتنەپێش، لە ئەستۆگرتنی کارێک، دەست پێشکەری.

**تصـدیر**- مص.ع(تەسـدیر- tesdîr): دەست پێـک، دانیـــشـتن لەســـەرووی مەجلیس، دیباجە، پێشەکی کتێبان.

**تصدیع**- مص. ع(تەسدیء- tesdî’): گـۆبەندنانەوە، سـەریەشـە دروسـتکردن، ئەزیەتدان.

**تصدیق**- مص. ع(تەسدیغ- tesdîx): باوەڕکردن، سەلماندن، شایەتی دان لەسەر دروستی کارێک.

**تصرف**- مص. ع(تەسەڕوف-teseruf): بەدەست هێنان، دەستکاری کردن، زەوت کردن، داگیرکردن.

**تصـریح**- مص. ع(تەسـریه- tesrîh): سـەراحـەت گـۆیی، راشکاوی، ئاشکرا کردن، قسەی ئاشکراو لەڕوو.

**تصریف**- مص. ع(تەسریف- tesrîf): گەردانی وشە، دەستکاری کردن، گۆڕین.

**تصعید**- مص. ع(تەسعید- tes’îd): بەرزبوونەوە، بەرزکردنەوە.

**تصغیر**- مص. ع(تەسغیر- tesxîr):

بچووک کردنەوە، شکاندنەوە.
**تصفح**- مص. ع(تەسەففوھ- teseffuh): سەرنجدانی ورد، قوولّ روانین، موتالاّکردنی کتێب بە وردی و پەڕە پەڕە.
**تصفیە**- مص. ع(تەسفیە- tesfîye): سافکردن، پاک کردنەوە، نەھێشتنی ناکۆکی، پاک لە پاک کردنەوەی قەرزو حیساب.
**تصلب**- مص.ع(تەسەللوب- tesellub): ڕەق بوون.
**تصمیم**- مص. ع(تەسمیم- tesmîm): لێبڕان، ھیممەت کردن، عەزم کردن، بڕیاردان.
**تصنع**- مص. ع(تەسەننوء- tesennu’): ڕواڵەتبازی، خۆ ڕازانەوە، خۆنواندنی دەستکرد.
**تصنیف**- مص. ع(تەسنیف- tesnîf): پۆلێن کردن، شیعرگوتن، کۆکردنەوە، نووسینی کتێب.
**تصور**- مص. ع(تەسەڤور-tesevvur): خەیاڵ کردن، وێناکردن، ئەندێشەکردن.
**تصوف**- مص. ع(تەسەڤڤف- tesvvuf): بوونە سۆفی، دەروێشی، پەڵاس پۆشی، ناوی تەریقەتێکی ئاینییە.
**تصویب**- مص. ع(تەسڤیب- tesvîb): مسادەقە، ڕا لەسەردان، ڕەزامەندی ئەنجوومەنی وەزیران لەسەر بڕیاران.
**تصویر**- مص. ع(تەسڤیر- tesvîr): وێنەگرتن، نیگارکێشان.
**تصویرە**- ا.ع(تەسڤیرە- tesvîre): پەیکەر، پەردەیەک کە وێنەی کەسێک یا شتێکی لەسەر بکێشری.

**تضاد**- مص. ع(تەزاد- tezad): دژایەتی کردن، ناکۆکی، ناتەبایی، دژایەتی.
**تضاریس**- ا. ع(تەزاریس- tezarîs): ددانە، شتی ددانەدار.
**تضامن**- مص. ع(تەزامون- tezamun): زەمانەتکردنی یەکتر، بوونەکەفیل، ھاوکاری.
**تضحیە**- مص. ع(تەزھیە- tezhîye): قوربانی، سەربڕینی مەڕو وشترو.. بۆ قوربانی.
**تضرر**- مص. ع(تەزەڕور- tezerur): زەرەرکردن، زیان کردن.
**تضرع**- مص. ع(تەزەروء- tezeru’): لالأنەوەو پاڕانەوە.
**تضریب**- مص. ع(تەزریب- tezrîb): لێدانی توند، فیتنەگێڕان، تێکدانی میانی دووکەس.
**تضریس**- ا.ع(تەزریس- tezrîs): ددانەکردن، گرنگرنکردن.
**تضعیف**- مص.ع(تەزئیف- tez’îf): لاوازکردن، دوو چەنانە کردن، دوو بەرانبەرکردن.
**تضمن**- مص. ع(تەزەممون- tezemmun): قەبوڵکردن، گرتنەوە.
**تضمین**- مص. ع(تەزمین- tezmîn): زەمانەت کردن، تێ ھەڵکێش (لە شیعردا)، خستنە پەنای خۆ، گونجاندن.
**تضییع**- مص. ع(تەزییء- tezyî’): زایەکردن، خەسارکردن، فەوتاندن، لە کەڵک خستن.
**تضییق**- مص. ع(تەزییغ- tezyîx): تەنگاوکردن، تەنگ پێ ھەڵچنین،

خستنەتەنگانە.
**تطابق**- مص. ع(تەتابوغ- tetabux): چون یەکی، جووت بوون.
**تطاول**- مص. ع(تەتاڤـول- tetavul): گـــــەردن کـــــێـــــشی، دەست درێژی کردن،تەعەداکردن.
**تطبیق**- مص. ع(تەتبـیغ- tetbîx): بەرانبەری، بەرانبەر کردنی دوو شت لەگەڵ یەکدا.
**تطمیع**- مص.ع(تەتمیء- tetmî’): تەماع خستنەبەر.
**تطور**- مص. ع(تەتەڤـور- tetevvur): گـۆڕان، پەرەسـەندن. ئەمـە شـتـێـکی زۆر باشە
**تطوع**- مص. ع(تەتەڤوء- tetevvu’): گـوێڕایەڵی، گـەردن کـەچی، خـۆبەخـشین، ئەنجامدانی کارێک بە مەبەستی عیبادەت و چاکە.
**تطویل**- مص. ع(تەتڤـیـل- tetvîl): تـول پێ دان، درێژ کـــــردنەوە، درێژدادڕی بێهودە.
**تطهیر**- مص. ع(تەتهیر- tethîr): پاک کـردن، شـوشتن، تەهارەت، پاکـژکـردنەوە، پاکسازی.
**تطیر**- مص. ع(تەتەیور- teteyyur): رەشبینی، بەدیەغباڵی.
**تظاهر**- مص. ع(تەزاهور- tezahur): پشـــــتگرتنی یـەکــــدی، ئاشکرابوون، خۆنواندن، پشـتـیـوانی و هاوکـاری کـردنی یەکدی.
**تظلم**- مص. ع(تەزەللوم- tezellum): زوڵـم کـێـشـان، دادخـوازتن، گلەیی کـردن، سکاڵاکردن لە زوڵم و زۆری کەسێک.

**تعاتب**- مص. ع(تەئاتوب- teatub): گلەیی کردن، گازاندە کردن لە یەکدی.
**تعادل**- مص. ع(تەئادول- teadul): بەرانبەر بوون، هاوتابوون، هاوسەنگی.
**تعارض**- مص. ع(تەئاروز- tearuz): دژایەتی کـردنی یەکـتـر، ناسـازگـاری، ناتەبایی، ناکۆکی، ناشێلگیری.
**تعارف**- مص. ع(تەئاروف- tearuf): یەکتر ناسین، خێرهاتنی یەکتر، پێشکەشی دان.
**تعاضد**- مص. ع(تەئازود- teazud): هاوکـاری، کـۆمـەک کـردن، یارمـەتی دانی یەکتر.
**تعاطی**- مص. ع(تەئاتی- teatî): تەگبیرو راوێژکردن، مامەڵەو سەودا کردن، پێدان.
**تعاقب**- مص. ع(تەئاغوب- teaxub): دوا بەدوای یەک هاتن، پاشگیری.
**تعالی**- مص. ع(تەئالی- tealî): بەرزبوونەوە، باڵابوون، بەرزبوون.
**تعالیق**- ع(تەئالیغ- tealîx): ئەو شـەرحـەی لە پەراوێزی نامـەدا دەنووسرێ، ئەوەی لە پەراوێزی کتێبدا بنووسرێ.
**تعاند**- مص. ع(تەئانود- teanud): عینادی کردن، رق بە رقێ، دژایەتی کردن.
**تعانق**- مص. ع(تەئانوغ- teanux): دەست لە مل کـردنی یەکـدی، یەکـتـر لە هامێزگرتن، پەشتان، ملەما.
**تعاون**- مص. ع(تەئاڤـون- teavun): هاوکاری، دەستگیرۆی.
**تعاویذ**- ا. ع.تەئاڤـیـز- teavîz): نوشـتــەو چاوەزار، پەنادان، پاراســتنی کەسێک، داڵدەدان.

**تعـاهد**- مص. ع(تەئاهود- teahud): پەیمان بەستن، وەئەستۆگرتن.

**تـــعــــب**- ا. ع(تــەئـــەب- teeb): ماندووبوون، ماندوویەتی، شەکەتی.

**تعـبـد**- مص. ع(تەئەبود- teebud): عـــیـــبـــادەت کـــردن، خـــواپەرســـتی، کۆیلایەتیکردن.

**تعـبـیـر**- مص. ع(تەئبـیـر- te’bîr): تەعـبـیـرکـردنی خـەو، لێکدانەوەی خـەو، دەربڕین، گوزارشت.

**تعبیه**- مص. ع(تەئبییە- te’bîye): سازدانی سوپا، ئامادەکردن.

**تعـــــجب**- مـص. ع(تـەئەجــــوب- teeccub): سەرسام بوون، سەرسوڕمان.

**تعـجـیل**- مص. ع(تەئجـیل- te’cîl): خێراکردن، پەلەکردن، لەزکردن.

**تعــــداد**- مص. ع(تەئداد- te’dad): ژماردن، ژمارەکردن، سەرژمێری.

**تعدد**- مص. ع(تەئەددود- teeddud): زۆربوون، زۆربوونی ژمارە، فرەبوون.

**تعــدی**- مـص. ع(تەئەدی- teeddî): دەست درێژی، زوڵـم کـــردن، زێدەگـــاڤی، دەرچوون لە سنووری خۆ.

**تعــــدید**- مص.ع(تەئدید- te’dîd): ژماردن، ژمارەکردن.

**تعــدیل**- مص. ع(تەئدیل- te’dîl): راستکردنەوە، هاوسەنگ کردن، هاوتایی.

**تعـذر**- مص. ع(تەئەززور- teezzur): عوزرهێنانەوە، دژواربوون، بەهانەخوازی.

**تعــذیب**- مص. ع(تەئزیب- te’zîb): عەزاب دان، ئازاردان، ئەشکەنجەدان.

**تعــرض**- مص. ع(تەئەروز- teeruz): دەست درێژی، پەلامـاردان، روو وەرگـێـڕان لە...، گلەیی کردن.

**تعـرفـه**- مص. ع(تەئریفـە- te’rîfe): تەعریفە، ناساندن، ناسنامە، لیستی نرخی کالا، لیستی باج.

**تعــرق**- مص. ع(تەئەروغ- teerux): ریشەداکوتان، ئارەقەکردن، ریشاژۆ بوون.

**تعـــریب**- مص. ع(تەئریب- te’rîb): وەرگـــێـــڕان بۆ ســـەر زمـــانی عـــەرەبی، عەرەباندن.

**تعــــریض**- مص. ع(تەئریز- te’rîz): پانکردن، قسەی بە توێکڵ.

**تعـــریف**- مص. ع(تەئریف- te’rîf): ناســاندن، ســتـــایش کــردن، باسکردن، روونکردنەوەی حەقیقەتی کارێک.

**تعــــریق**- مص. ع(تەئریغ- te’rîx): عــــەرەق کــــردن، عـــەرەق پێ کــــردن، تێکەڵکردنی شەراب لەگەڵ تۆزێ ئاوا.

**تعــــــزیت**- مـص. ع(تەئزیـــــەت- te’zîyet): دلّدانەوە، سەرخۆشی کردن، عەزیەتباری بۆ هەر یەکێک لە ئیمامان.

**تعــــــزیر**- مص. ع(تەئزیر- te’zîr): دارکاری کردن، لۆمەکردن، سزادان، تەمبێ کردن، سەرزەنشت کردن.

**تعسر**- مص. ع(تەئەسسور- teessur): دەگـــمـــەن بوون، چوونە قـــاتـی، دژواری، سەختی، ئاستەنگی.

**تعشق**- مص. ع(تەئەشوغ- teeşux): ئاشق بوون، مەحەبەت نواندن، میـهرەبانی کردن، خۆشەویستی.

**تعــــــصب**- مـص. ع(تەئەســـــوب- teessub): پابەندی و دڵـبــــــەندی بەشتێک و بەرگریکردن لێی، لایەنگری لە کەسێک یان رێبازێک یان ئاینێ، پاراستن

و یارمەتیدان، دەمارگیری.
**تعطیل**- مص. ع(تەئتـــیل- te'tîl):
لەکـار خـستن، دەست لەکـارکـێـشـانەوە، بێکاری، رۆژانی کار نەکردن.
**تعظیم**- مص. ع(تەئزیم- te'zîm):
رێزگــرتن، گــەورەکــردن، کــڕنوش بردن بەمەبەستی رێز.
**تعفن**- مص.ع(تەئەفـون- teeffun):
بۆگەن بوون.
**تعفین**- مص. ع(تەئفین- te'fîn):
بۆگەناندن، گۆڕینی تام و بۆنی شتێک.
**تعقل**- مص. ع(تەئەغول- teexxul):
ئاقڵ بوون، بیرکردنەوە، هزرکردنەوە.
**تعقیب**- مص. ع(تەئغیب- te'xîb):
تاقـیب کـردن، سـۆراخ کـردن، وێردو نزای پاش نوێژ.
**تعقید**- مص. ع(تەئغیـد- te'xîd):
گرێدان، ئاڵۆزاندنی قسە.
**تعقیم**- مص. ع(تەئغیم- te'xîm):
نەزۆک کردن، شوشتن بە دیتۆڵ، تەعقیم.
**تعلق**- مص. ع(تەئەلوغ- teellux):
دڵبـەندی بە کـەسـێک یـان شـتـێکەوە، پەیوەندی، هەڵواسین.
**تعلل**- مص. ع(تەئەللول- teellul):
بیانووهێنانەوە، خۆخلافاندن، بیانوگرتن، ماتەڵ بوون.
**تعلم**- مص . ع(تەئەللوم- teellum):
فێرکردن.
**تعلیف**- مص. ع(تەئلیف- te'lîf):
ئالفدانی چوارپایان، ئالیکدانی ولاخان.
**تعلیق**- مص. ع(تەئلیغ- te'lîx):
هەڵـواسین، نـاوی جـــۆرە خـــەتێکە، پەراوێزنووسی لەسەر کتێب.

**تعلیقە**- ا. ع(تەئلیغـە- te'lîxe):
تەعلیق، شرۆڤەیەک کە لە پەراوێزو پاییینی کتێبدا دەنووسرێ.
**تعلیل**- مص. ع(تەئلیل- te'lîl):
ســەلماندن بە بەڵگەوە، دەربڕینی هۆی کارێک، هۆهێنانەوە.
**تعلیم**- مص. ع(تەئلیم- te'lîm):
فێربوون، فێرکردن، تەعلیم دان، هەڤووت.
**تعلیمی**- ا.ع(تەئلیمی- te'lîmî):
کـــاروباری فـــێـــرکـــردن، دار دەست، دەستەجڵەو.
**تعمد**- مص. ع(تەئەمود-teemmud):
بە ئانقەست، بەمەبەست، بەعەمدی.
**تعمق**- مص. ع(تەئەمموغ- teemmux): قـــوڵ ئەندێشـی، قـوولبـوونەوە، وردبوونەوەی زۆر، دیقـەتی زۆر لە کارێکدا.
**تعمید**- مص. ع(تەئمیـد- te'mîd):
ئەنجامدانی کارێک بە ئانقەست، شوشتنی منداڵان و ئەو کەسانەی دەبنە مەسیحی بە گوێرەی رێ و رەسمی تایبەتی.
**تعمیر**- مص.ع(تەئمیـر- te'mîr):
چاک کـردنەوە، ئاوەدانکردنەوە، تەمـەن درێژی.
**تعمیم**- مص. ع(تەئمیم- te'mîm):
گشتاندن، عامەکردن.
**تعمیە**- مص. ع(تەئمیە- te'miye):
مـوعـەمـاگـۆیی، پۆشین، نابیناکـردن، پۆشاندن.
**تعنت**- مص. ع(تەئەنوت- teennut):
ئازاردانی کـەسـێک، گـەڕان بە دووی عەیبدا، توندوتیژی.
**تعویذ**- مص. ع(تەئڤیـز- te'vîz):

نوشــــتـــه، دوعـــای چاوەزار، دالّدەدان، پەنادان.
**تعـویض**- مص. ع(تەئڤـیـز- te’vîz): گۆڕین، قەرەبوو کردنەوە.
**تعـویق**- مص. ع(تەئڤــیـغ- tevîx): دواخستن، تەگەرە تێ خستن، تاخیرکردن.
**تعـهـد**- مص. ع(تەئەهود- teehud): لە ئەسـتـۆگـرتنی کـارێک، پەیمان بەستن، بەڵێن دان، خەمخواری.
**تـعــــیـش**- مـص. ع(تـەئـەیـیــــوش- teeyyuş): گــــوزەران کـــــردن، خۆشگوزەرانی، وەدەست هێنانی ئەسپابی ژیان.
**تعین**- مص. ع(تەئەییون- teeyyun): بە چاو دیتن، گـەورەیی و سـامـان پەیدا کردن، پایە وەدەست هێنان.
**تعـــیین**- مص. ع(تەئیین- te’yîn): دامەزراندن، دیاری کردن.
**تغابن**- مص. ع(تەغابون- texabun): زەرەرکردن، زەرەرمەند بوون، داخ خواردن، پەشیمانی، یەکدی فریودان، لە سەوادا..
**تغـار**- ا(تەغــار- texar): کـاسـەی سواڵەتی، تەشت.
**تغافل**- مص. ع(تەغافول- texaful): غەفـڵەت نواندن، چاوپۆشی کردن، خۆ لە گێلی‌دان.
**تغـذی**- مص.ع(تەغـەزی- texezzî): نان خواردن.
**تغذیه**- مص. ع(تەغزییە- texzîye): نان‌دان، خواردن، خواردن پێدان.
**تغزل**- مص. ع(تەغەززول-texezzul): ئاشـقێنی، غـەزەل گـوتن، گـوتنی شـیـعـری ئاشقانە.

**تغسیل**- مص. ع(تەغـسیل- texsîl): شۆردن.
**تغلیظ**- مص. ع(تەغلیـــز- texlîz): قسەی ڕەق بە کەسێک وتن، خەستکردن.
**تـغـنـج**- مـص. ع(تـەغــــــــەنـنـوج- texennuc): نازکردن، نازفرۆشی.
**تغنی**- مص. ع(تەغـەننی- texennî): گـۆرانـی گـوتـن، سـتـرین، زەنگین بوون، گۆرانی چڕین.
**تغنیـه**- مص. ع(تەغنیـە- texnîye): گۆرانی گوتن، ستران چڕین.
**تغـــوط**- مص .ع(تـەغــــەڤـــوت- texevvut): گوکردن، ڕیتن، ڕیان.
**تغیـر**- مص. ع(تەغـەیور- texeyur): گۆڕان، گەڕان، تورەبوون.
**تغییـر**- مص. ع(تەغـییـر- texyîr): گۆڕین، گۆڕانکاری.
**تف**- ا(تەف- tef): حـەرارەت، گـەرمی، ڕوناکی، نور، تیشک.
**تف**- ا(توف- tuf): تف، بەڵغەم.
**تفاح**- ا. ع(توففـاه- tuffah): سـێـو، سێڤ.
**تـفــــاحش**- مـص. ع(تەفــــاهـوش- tefahuş): جنێودان، کـاری لە ڕادەبەدەر خـــراپ و نـاشــیـــرین، جـــمـــاندان، فاحیشەکاری.
**تفاخر**- مص. ع(تەفـاخور- tefaxur): بەسـەر یەکـدا نازین، نـازین، نازفـرۆشی، فەخرکردن.
**تفـــاریق**- ا.ع(تەفـــاریغ- tefarîx): شتێن پەراگەندە.
**تفـاسیـر**- ا. ع(تەفـاسیـر- tefasîr): تەفسیـران، لێکدانەوە، شەرح و شرۆڤان،

راڤه.
**تفاصيل**- مص- ا. ع(تەفاسيل- tefasîl): شەرح و شرۆڤەی زیاد، تول و تەفسیل پێدان.
**تفاضل**- مص. ع(تەفازول- tefazul): بالاتر، زیاتر.
**تفاله**- ا(توفاله- tufale): خڵتە، تلّپە.
**تفاوت**- مص. ع(تەفاڤوت- tefavut): جیاوازی، لێکدی دوورکەوتنەوە، فەرق و جیاوازی.
**تفاهم**- مص. ع(تەفاهوم- tefahum): لێکدی حاڵی بوون، دەرک کردنی مەبەستی یەکدی.
**تفاؤل**- مص. ع(تەفائول- tefa'ul): گەشبینی.
**تفت**- ص(تەفت- teft): گەرم، توند، تیژ، بە پەلە، بە گەرمی.
**تفتان**- ص(تەفتان- teftan): گەرم، داغ، برژاو، جۆرە کولێرەیەکە.
**تفتن**- مص(تەف تەن- teften): سوورەوە بوون، برژان.
**تفته**- ا. مص(تەفتە- tefte): سوورەوەبوو، داغ بوو، کوتراو.
**تفتیدن**- مص(تەف تیدەن- teftîden): برژاندن، سوورەوە بوون.
**تفتیده**- ا. مف(تەفتیدە- teftîde): برژاو، سوورەوە بوو.
**تفتیش**- مص. ع(تەفتیش- teftîş): پشکنین، گەڕان، فەحس کردن.
**تفتین**- ع. مص(تەفتین- teftîn): ئاژاوەنانەوە، فیتنەگێڕان.
**تفحص**- مص. ع(تەفەهوس- tefehhus): فەحس کردن، تاقیب کردن، گەڕان، تەحقیق کردن دەربارەی کارێک یان شتێک.
**تفخیم**- مص. ع(تەفخیم- tefxîm): گەورە کردن، ڕێزگرتن.
**تفدیه**- مص. ع(تەفدییە- tefdiye): فدیەدان، شتێک لە بری ڕزگاری خۆت بدەی.
**تفرج**- مص. ع(تەفەڕوج- teferuc): لە تەنگانە دەرچوون، نەمانی خەم و پەژارە، گەشت و گەڕان.
**تفرد**- مص. ع(تەفەڕود- teferud): تەنیابوون، تاکایەتی، سەربەخۆیی، تاک کەوتنەوە.
**تفرس**- مص. ع(تەفەڕوس- teferus): قوڵ ڕوانین لە شتێک بۆ تێ گەییشتنی، سەرناسی.
**تفرع**- مص. ع(تەفەڕوء- teferu'): لق و پۆپ لێ بوونەوە، تەرزلێبوونەوە.
**تفرعن**- مص. ع(تەفەڕئون- tefer'un): ستەمکاری، زوڵم کردن، تەکەبورو لووت بەرزی، سەرکێشی کردن، لاسایی کردنەوەی فیرعەون لە تەکەبورو ستەمدا.
**تفرق**- مص. ع(تەفەڕوغ- teferux): پەرتەوازە بوون، پەراگەندە بوون، بڵاوبوونەوە.
**تفرقه**- مص. ع(تەفریغە- tefrîxe): جودایی، تەفریقەنانەوە، جیاکردنەوە.
**تفریح**- مص. ع(تەفریه- tefrîh): شادی کردن، شادکردن، خۆشی، گەڕان و سەیران.
**تفرید**- مص. ع(تەفرید- tefrîd):

تاکبوونەوە لە خەڵکی، تاکڕەوی، تاکنشینی، کەنارگرتن.
**تفریط**- مص. ع(تەفریت- tefrît): بەفیڕۆدان، بەبادان، لەنێو بردن، زایە کردن، تەخسیرو درێغی.
**تفریغ**- مص. ع(تەفریغ- tefrîx): بەتاڵ کردنەوە، ئامادە کردن.
**تفریق**- مص.ع(تەفریغ- tefrîx): جیاکردنەوە، پەرتەوازەکردن، لێ دەرهێنان.
**تفس**- ا(تەفس- tefs): حەرارەت، گەرمی.
**تفسان**- ص. فا(تەفسان- tefsan): گەرم، داخ، شتێک بە زەبری گەرمایی هەتاو یان ئاگر داغی داغ بووبێ.
**تفساندن**- مص(تەفساندەن- tefsanden): داغ کردن، گەرم کردن، سوورکردنەوە.
**تفسره**- ا.ع(تەفسیرە- tefsire): فەحسی پێشاوی نەخۆش بەمەبەستی دیاریکردنی نەخۆشییەکەی.
**تفسیدن**- مص(تەفسیدەن- tefsîden): داغ کردن، سوورکردنەوە.
**تفسیده**- ا. مف(تەفسیدە- tefsîde): داغ بوو، سوورەوەبوو، برژاو.
**تفسیر**- مص. ع(تەفسیر- tefsîr): تەفسیرو لێکدانەوە، شەرح و شرۆڤە، راڤە.
**تفسیق**- مص. ع(تەفسیغ- tefsîx): بە فاسق ژماردن.
**تفصیل**- مص. ع(تەفسیل- tefsîl): تول و تەفسیل پێدان، شەرح و شرۆڤە، دابەشکردنی کتێب بەسەر فەسڵاندا.
**تفضل**- مص. ع(تەفەزول-tefezzul): چاکە کردن، لوتف کردن، زیاد بوون.
**تفضیح**- مص. ع(تەفزیە- tefzîh): ریسواکردن، ریسوایی.
**تفضیض**- مص. ع(تەفزیز- tefzîz): زیوکەفت، لە ئاوی زیو گرتن، بەزیو سواغدان.
**تفضیل**- ص. ع(تەفزیل- tefzîl): تەفزیل، تەفزیلدانی کەسێک بەسەر کەسێکدا.
**تفطن**- مص. ع(تەفەتتون- tefettun): زانین، هۆشمەندی، زیرەکی.
**تفقد**- مص. ع(تەفەغغود- tefexxud): دڵدانەوە، گەڕان، تاقیب کردن، گەڕان بەدوویی ونبوودا.
**تفقه**- مص. ع(تەفەغغوه- tefexxuh): خوێندنی زانستە ئایینییەکان، بوونە زانا.
**تفک**- ا(توفەک- tufek): ساچمەزەن، تفەنگ، تاپڕ.
**تفکر**- مص. ع(تەفەککور- tefekkur): بیرکردنەوە، تێفکرین.
**تفکیر**- مص. ع(تەفکیر- tefkîr): بیرکردنەوە، تێفکرین، تێهزران.
**تفکیک**- مص. ع(تەفکیک- tefkîk): کردنەوە، لێک کردنەوە، هەڵوەشاندنەوە.
**تفنگ**- ا(توفەنگ- tufeng): تفەنگ، تفەک.
**تفنن**- مص. ع(تەفەن نون- tefenun): جۆراوجۆر بوون، سەرقاڵ بوون بە گەمەی جۆراوجۆرەوە، فەنبازی.
**تفو**- ا(توفو- tufû): تفو، تف لە چارەت.

**تفوق**- مص. ع(تەفەڤوغ-tefevvux): سەرکەوتن.

**تفوه**- مص. ع(تەفەڤوه- tefevvuh): زارهەڵهێنان، دەم کردنەوە، قسەکردن، هێنانەزمان.

**تفویض**- مص. ع(تەفڤیز- tefvîs): سپاردن، سپاردنی کارێک بە کەسێک.

**تفهم**- مص. ع(تەفەهوم- tefehum): فەهم کردن، تێگەیشتن، حاڵی بوون.

**تفهیم**- مص. ع(تەفهیم- tefhîm): تێگەیاندن، حاڵی کردن.

**تفیدن**- مص (تەفیدەن- tefîden): داغ بوون، سوور بوونەوە لە ناو ئاگر یان لەبەر هەتاو.

**تفیده**- ا. مف(تەفیدە- tefîde): برژاو، سوورەوە بوو.

**تقاء**- مص. ع(تیغاء- tixa'): خۆپاراستن، پارێزکاری لە خەراپە.

**تقابض**- مص. ع(تەغابوز-texabuz): دان و وەرگرتن، دان و سەندن، (لە سەوداو معامەلەدا).

**تقابل**- مص. ع(تەغابول- texabul): رووبەڕوو بوون، کەوتنە بەرانبەر یەکدی.

**تقاتل**- مص. ع(تەغاتول- texatul): یەکتر کوشتن، شەڕکردن لەگەڵ یەکدیدا.

**تقادیر**- ع(تەغادیر- texadîr): قەزاو قەدەری خوایی.

**تقارب**- مص. ع(تەغاروب- texarub): نزیک بوونەوە، نزیکی، خزمایەتی.

**تقارن**- مص. ع(تەغارون- texarun): بوونە هاوڕێ و دۆست، هاوتایی.

**تقاص**- مص. ع(تەغاس- texas): تۆڵە سەندنەوە لە یەک، حەیف، هەق کردنەوە.

**تقاضا**- مص. ع(تەقازا- texaza): داواکردن، تکاکردن.

**تقاطر**- مص.ع(تەغاتور- texatur): دڵۆپاندن، دڵۆپان، دەڵان.

**تقاطع**- مص. ع(تەغاتوء- 'texatu"): دابڕان لە یەکدی، یەکتر بڕینی دوو هێڵ، دووڕیان.

**تقاعد**- مص. ع(تەغائود- texa'ud): خانەنشینی، کەنارگیری.

**تقاوی**- مص. ع(تەغاڤی- texvî): کۆمەک، پێشەکی، بنەتۆو کەمالیک دەیدا بە وەرزێرو جووتیار پاشان لە بەرەکەی وەری دەگرێتەوە.

**تقبل**- مص. ع(تەغەبول- texebul): قەبوڵ کردن، لە ئەستۆ گرتن.

**تقبیح**- مص. ع(تەغبیح- texbîh): ناشیرین کردن، جنێودان، بەدگۆیی.

**تقبیل**- مص. ع(تەغبیل- texbîl): راموسان، ماچ کردن، راموز.

**تقدس**- مص. ع(تەغەددوس- texddus): پاک بوون، پیرۆز بوون، پاکبوونەوە لە عەیب.

**تقدم**- مص. ع(تەغەددوم- texeddum): پێشکەوتن، پێشڤەچوون.

**تقدمه**- مص. ع(تەغدیمە- texdime): کەوتنە پێش، پێشکەشکردن، پێشەکی، دیاری.

**تقدیر**- مص. ع(تەغدیر- texdîr): قەزاو فەرمانی خوایی، قەدرگرتن، ئەندازەکرتن، خەملاندن، چارەنوس، بەش

و ناوچەوان.

**تقديس**- مص. ع(تەغدیس- texdîs): پاککردن.

**تقديم**- مص. ع(تەغدیم- texdîm): پێشکەش کردن، دیاری پێ دان، پێشخستن، ناردنە پێش.

**تقرب**- مص. ع(تەغەروب-texerub): نزیک بوونەوە، بوونە خزم، نزیکی، خزمایەتی.

**تقريب**- مص. ع(تەغریب- texrîb): نزیک خستنەوە، زەمینە خۆشکردن.

**تقرير**- مص. ع(تەغریر- texrîr): ئیقرارکردن، دانپێدانان، بەرقەرارکردن.

**تقريظ**- مص. ع(تەغریز- texrîz): مەدح کردن، ستایش کردن، ستایش کردنی کتێبێک یان نووسینێک.

**تقسيط**- مص. ع(تەغسیت- texsît): تەخسید، دانەوەی قەرز بەقیست.

**تقسيم**- مص. ع(تەغسیم- texsîm): بەشکردن، لە بیرکاریدا یاسای (دابەشکردن) هەیە.

**تقشير**- مص.ع(تەغشیر- texşîr): پاککردن؛ توێکڵ لێ کردنەوە.

**تقصير**- مص. ع(تەغسیر- texsîr): تەخسیرکردن، درێغی کردن، کەمتەرخەمی کردن.

**تقطير**- مص .ع(تەغتیر- textîr): دڵۆپاندن.

**تقطيع**- مص. ع(تەغتیء- textî’): پارچە پارچە کردن.

**تقعر**- مص. ع(تەغەئور- texe’ur): چاڵ بوون.

**تقلا**- مص(تەغەللا- texella): کۆشش، هەوڵدان، تل دان، دەست و پێ هاویشتن لە جێگەدا، پەلەقاژە.

**تقلب**- مص. ع(تەغەللوب- texellub): گۆڕان، ژێرو ژوور بوون، قڵپ بوونەوە، فێڵ و دەغەڵکاری، نادروستی.

**تقلد**- مص. ع(تەغەللود- texellud): ملوانکە لەمل کردن، کارێک لە ئەستۆ گرتن، لە عۆبە گرتنی کارێک.

**تقلى**- ا(توغلی- tuxlî): کاڤر، کاوڕ.

**تقليب**- مص. ع(تەغلیب- texlîb): گۆڕین، سەرنخون کردن، ژێرو بان کردن، هەڵدانەوە.

**تقليد**- مص. ع(تەغلید- texlîd): لاسایی کردنەوە، گەردانە کردنە مل، پەیڕەوکردنی موجتەهیدێک.

**تقليل**- مص. ع(تەغلیل- texlîl): کەمکردن، کەم کردنەوە.

**تقنين**- مص.ع(تەغنین- texnîn): دانانی قانوون، قانوون دانان.

**تقوا**- ا.مص(تەغڤا- texva): تەقوا، خواپەرستی، تاعەتکردنی خوا.

**تقويت**- مص. ع(تەغڤیەت- texviyet): بەهێزکردن.

**تقويم**- مص. ع(تەغڤیم- texvîm): راستکردنەوە، هەڵسەنگاندن، نرخاندن.

**تقويم**- ا. ع(تەغڤیم- texvîm): ساڵنامە، تەقویم.

**تقهقر**- مص. ع(تەغەهغور- texehxur): پاشەکشە، گەڕانەوە بۆ دواوە، پاشەوپاش رۆیشتن.

**تقى**- مص. ع٠تەغی-texî): بە تەغوا، لە خوا ترس، بە تاعەت.

**تقيد**- مص. ع(تەغەييود- texeyyud): پابەندبوون، چوونە ژێرباری کارێک.
**تقيه**- مص. ع(تەغييە- texîye): خۆپاراستن، حەيا، شەرم، بيروباوەڕ شاردنەوە.
**تک**- ص(تەک- tek): تاک و تەنيا، يەک، کەم.
**تک**- ا(تەک- tek): بن.
**تک**- ا. مص(تەک- tek): غار، تيژڕۆيی، راکردن.
**تک**- ا(توک- tuk): دەنووکی باڵندە، نوکی خەنجەر، نووکی سوژن و دەرزی.
**تکاب**- ا.مر(تەکاب- tekab): ميزاڤ، ميزاو، گۆلاوی قووڵ کە پێ ناگاتە بنی، چۆڕاو، تکاو.
**تکاپو**- ا. مص(تەکاپو- tekepû): هەوڵ و تەقەلا، هاتووچۆی بەپەلە، گەڕانی زۆر، پەلەپروزێ، پەلەقاژە.
**تکاثر**- مص. ع(تەکاسور- tekasur): زۆر بوون، فرەبوون.
**تکاثف**- مص. ع(تەکاسوف- tekasuf): چڕبوونەوە، خەست بوونەوە.
**تکاسل**- مص. ع(تەکاسول-tekasul): تەمەڵی نواندن، خاوەخاوکردن.
**تکافؤ**- مص. ع(تەکافوء- tekafu’): کافی بوون و بەس بوون، چونيەکی، يەکسان بوون، بەرانبەر بوون، هاوتايی.
**تکاليف**- ا. ع(تەکاليف- tekalîf): ئەرک و ناخۆشی، کاری قورس، مەشەقەت و رەنج.
**تکامل**- مص. ع(تەکامول- tekamul): گەييشتنە کەمال، بەرەبەرە کامیل بوون.
**تکان**- ا(تەکان- tekan): جولان، تەکان، بزاڤ.
**تکاندن**- مص(تەکاندەن-tekanden): جولاندن.
**تکاننده**- ا. فا(تەکانەندە- tekanende): جولێنەر، بزڤدەر.
**تکانيده**- ا.مف(تەکانيدە- tekanîde): جولاو، جولێنراو.
**تکاور**- ص(تەکاڤەر- tekaver): خۆشبەز، تيژڕۆ.
**تکبر**- مص. ع(تەکەببور-tekebbur): لوت بەرزی، بەهەوا، دەعیەو فیز، فرناخ.
**تکبير**- مص. ع(تەکبير- tekbîr): گەورەکردن، گوتنی (الله اکبر).
**تکثر**- مص. ع(تەکەسسور- tekessur): زۆربوون، زيادبوون، فرەبوون.
**تکثير**- مص. ع(تەکسير- teksîr): زۆرکردن، زيادکردن.
**تکدر**- مص. ع(تەکەددور- tekeddur): دڵتەنگ بوون، سەرودڵ گيران، تاريک بوون.
**تکدی**- مص. ع(تەکەدی- tekedî): گەدايی کردن، دەرۆزە کردن، سواڵ کردن، پارسەکی.
**تکدير**- مص. ع(تەکدير- tekdîr): تاريک کردن، سەرو دڵ گرتن، دڵتەنگ کردن.
**تکذيب**- مص. ع(تەکزيب- tekzîb): بەدرۆخستنەوە.
**تکرار**- مص. ع(تەکرار- tekrar): دووبارەکردنەوە.

**تک رو**- ص. فا(تەک رەڤ-tek rev): تاکڕەوی، بە تەنیاڕۆیی، کەسێک بە تەنیا بە ڕێگەیەکدا بڕوا.
**تکریم**- مص. ع(تەکـــریم- tekrîm): ڕێزگرتن، خەڵات کردن.
**تکژ**- ا(تەکەژ- tekej): ناوکی ترێ.
**تکســـر**- مص. ع(تەکـــەســـســـور- tekes sur): شکان.
**تکفل**- مص. ع(تـەکـــەفـــفـــول- tekefful): کەفالەت کردن، گرتنەخۆ، لە ئەستۆ گرتن.
**تکفیـر**- مص. ع(تەکـفـیـر- tekfîr): پۆشین، پۆشینی حەقیقەت، کەفارەت دان، بەکافر کردنی کەسێک.
**تکفین**- مص. ع(تەکـــفـین- tekfîn): کفن کردن.
**تکل**- ا(تەکـەل- tekel): بەران، کـەتەو زەلام، ناقۆڵا.
**تـکلان**- ا.ع(تـوکــــــلان- tuklan): سـپـــاردنی کـاری خـۆت بـە یەکـێکی دی، تەوەکول، پشت بەستن.
**تک لپـــه**- ا.مـــر(تـەک لەپـپــــە- tek leppe): گیایەکە.
**تکلتو**- ا(تەکەلتو- tekeltû): ژێرزین، ئارەقگیر.
**تـکـلس**- مـص. ع(تـەکـــــــەلـلـوس- tekellus): کلس گـرتن، بوون بـە کلس، بوون بە قسڵ.
**تـکـلف**- مـص. ع(تـەکـــــــەلـلـوف- tekelluf): خـۆ ڕەنجـان، زەحـمـەت، لە عـــۆدەگـــرتن، چوونە ژێربـاری قـــورسی نائاسایی و زەحمەت، ئەرک، کاری دژوار.
**تکلم**- مص. ع(تەکەللوم-tekellum): قسەکردن، پەیڤین، هاتنە قسە، ئاخافتن.
**تکلیس**- مص. ع(تەکلیس- teklîs): قـســلاوکـردن، تەڕاوکـردن، گـەرم کـردنی تەنێک تاوەکو قسڵی لێ بێت.
**تکلیف**- مص. ع(تەکلیف- teklîf): ئەرک خستنە سەر شان، گەییشتنە تەمەنی باڵغ بوون، کاری دژوار.
**تکلفه**- ا.ع(تەکلیفـە- teklife): ڕەنج
**تکمله**- ا. ع(تەکـمـیلە- tekmile): پاشماوە، تەواوکەر، تەواوکردن.
**تکمـه**- ا(توکـمـە- tukme): دوگـمـە، پشکوژ، قۆپچە.
**تکمه**- ا(تیکمە- tikme): حەریری زێڕ دۆزی.
**تکمـیل**- مص.ع(تەکـمـیل- tekmîl): تەواوکردن.
**تـکـنـولـوژی**- ا. فـــــــر(تـەکـنـۆلـۆژی- teknolojî): تـەکنۆلۆژی، ســەنعــەت زانی.
**تکنیـــسین**- ا. فـــر(تەکنیــــسین- teknîsîn): تەکنیک کار.
**تکنیک**- ص. ف(تەکنیک- teknîk): تەکنیک، هونەرکاری.
**تکنی کـالر**- ا. انگل(تەکنی کـالەر- teknî kaler): ڕێچکەی تەکنیکی.
**تـک و پـو**- ا. مـص(تـەک و پـو- tekûpû): هەوڵ و تەقـەللا، ڕاکـەڕاک، هەڵپە بۆ شتێک.
**تـک و تـاز**- ا. مـص(تـەک و تـاز- tekûtaz): هەڵپە، تەقەللا، ڕاکەڕاک.
**تکون**- مص. ع(تەکەڤڤون-tekevvun): دروست بوون، بوون، چێبوون.

**تکوین**- مص. ع(تەکـڤین- tekvîn): دروست کردن، خولّقاندن، چێکردن.
**تکە**- ا(تـیـکـکـە- tikke): تـیـکـە، پارچە، پاروو.
**تکە**- ا(تـەککـە- tekke): تـەگــــە، سابرێن، نێری.
**تک یاخـتــە**- ا. مـر(تەک یاخــتــە- tek yaxte): تەک خـانە، گـیـانەوەری یەک خانەیی.
**تکیـدن**- مص(تەکـیـدەن- tekîden): تەکاندان، غاردان.
**تکیـــدە**- ص(تەکـــیـــدە- tekîde): داتەکـــیـــو، باریک و بنێس، لەڕولاواز، سیسەڵ.
**تکیە**- ا(تەکیـە- tekye): تەکێ، جێی دەروێشـــان، پشـــتـــیـــوانە، پشت دان بە شتێکەوە.
**تکیـــەگـــاە**- ا. مـــر(تەکــیـــەگـــاە- tekyegah): تەکـیـەگـا، پشت و پەنا، شوێنی پشت دانەوە.
**تگرگ**- ا(تەگـەرگ- tegerg): تەرزە، تەیرۆک، تەزرە، گلێرە، تەگر، تەیر.
**تگین**- ص(تەگین- tegîn): مــیـــر، دلاوەر، بوێر، قۆز.
**تل**- ا.ع(تەل- tel): گـــــرد، تـەپـە، تەپۆلکە.
**تلاتـوف**- ا. ص(تـەلاتـوف- telatuf): هەراو هەنگامـە، پیس و چەپەڵ، چلّکن، قرێژ.
**تلاحق**- مص. ع(تـەلاهوغ- telahux): گـەییـشــتنە یەکـدی، دوو بەدووی یەک هاتن.
**تلازم**- مص. ع(تـەلازوم- telazum): پێکەوە بەستران، وابەستەیی.
**تـلاش**- ا(تــەلاش- telaş): تــەلّاش، هەوڵ، کۆشش.
**تلاشـی**- مص. ع(تـەلاشـی- telaşî): نەمان، لەناو چوون.
**تلاطف**- مص. ع(تلاتـوف- telatuf): لوتف کردن، میهرەبانی کردن، چاکە کردن و خۆش ڕەفتاری لەگەڵ یەکدا.
**تلاطم**- مص. ع(تەلاتوم- telatum): پێکادادان، هاڕوژانی شـــەپۆلی دەریا، لێکدی دان.
**تـلافـی**- مـص. ع(تـەلافـی- telafî): قەرەبووکردنەوە، تۆڵە بۆ کردنەوە.
**تلاقـی**- مـص. ع(تـەلاغـی- telaxî): دیدار، یەکـانگیـری، پێک گـەییــشتن، یەکتردیتن.
**تلال**- ا. ع(تیـــلال- tilal): گـــردان، تەپۆلکان، زوورگ.
**تـلالا**- ا(تــەلالا- telala): دەنــگ، گۆرانی، ستران.
**تلامذە**- ا. ع(تەلامیـزە- telamize): قوتابیان، شاگردان.
**تلامـیـذ**- ا. ع(تەلامـیـز- telamîz)" قوتابیان، شاگردان.
**تلان**- ص(تەلان- telan): قـەڵەو، زۆر قەڵەو توندو تۆڵ، خەپە.
**تلاوت**- مص. ع(تیـلاڤـەت- tilavet): خوێندن، خوێندنی قورحان.
**تلالؤ**- مص. ع(تەلەءلوء- tele'lu'): بریقانەوە، درەخشانەوە، درەوشانەوە.
**تلبـیس**- مص. ع(تەلبـیس- telbîs): فێڵبازی، پۆشاندن، داپۆشین، شاردنەوەی حەقیقەت.

**تلبیه**- مص. ع(تەلبییە- telbîye): وەدەنگەوەهاتن، وەڵامدانەوە، گوتنی: «لبّیك...» لە حەجدا.
**تلخ**- ص(تەلخ- telx): تاڵ، توندەتەبیعەت، قسەی ناخۆش.
**تلخ کام**- ص. مر(تەلخ کام- telx kam): کام سوّتی، کەسێ کە خۆشی لە خۆ نەبینێ و ژیانی زۆر دژوار و تاڵ بێ.
**تلخ کامی**- ا. مص(تەلخ کامی- telxkamî): نائومێدی، بەدبەختی، هیوابڕوای.
**تلخ وش**- ص. مر(تەڵخ ڤەش- telxveş): تام تاڵ، مەی، بادە.
**تلخه**- ا(تەلخە- telxe): زراو، زەرداو، سەفرا، زراڤک، زەرتاڵ.
**تلخیص**- مص. ع(تەلخیس- telxîs): خولاسە کردن، کورتکردنەوە، کورت کردنەوەو روونکردنەوەی قسە، پوختەکردنەوە.
**تلذذ**- مص. ع(تەلەززوز- telezzuz): لەزەت بردن، لەزەت لێ کردن.
**تلسک**- ا(تیلیسک- tilisk): تەلسک، هێشولکە ترێ، زەنگەتە، هێشووی بچووک لە هێشوی زل.
**تلسکوپ**- ا. فر(تەلیسکوپ- teliskûp): تەلیسکۆپ.
**تلطف**- مص. ع(تەلەتتوف- telet-tuf): میهرەبانی کردن، نەرمی نواندن، لوتف کردن، مەحەبەت نواندن.
**تلطیف**- مص. ع(تەلتیف- teltîf): جوان کردن، ناسک کردن، هێورکردن.
**تلف**- مص. ع(تەلەف- telef): بەباچوون، فەوتان، نەمان، بەفیرۆچوون، تەلەف بوون.
**تلفظ**- مص. ع(تەلەففوز- teleffuz): درکاندن، قسەکردن، وەلەبز هاتن، کرکاندن، کرک کردن.
**تلفون**- ا. فر(تیلیفون- tilifûn): تەلیفۆن، تەلەفۆن.
**تلفون گرام**- ا. فر(تەلەفۆن گرام- telefungram): بروسکەی نووسراو، پەیامی تەلەفۆنی کە خرابێتە سەر کاغەز.
**تلفیق**- مص. ع(تەلفیغ- telfîx): پێکەوە گرێدانی قسە، دو پارچەی کراس پێکەوە درون، رێکخستن.
**تلقاء**- ا. ع(تیلغاء- tilxa’): دیدار، ژوان، دیدارگە.
**تلقی**- مص. ع(تەلەغغی- telexxî): فێربوون، دیدار، مولاقات کردن، وەرگرتن.
**تلقیح**- مص. ع(تەلغیە- telxîh): کوتان،. پەیتاندن.
**تلقین**- مص.ع(تەلغین- telxîn): تەلقین دادان، فێرکردن، کەسێک بە کردنی قسەیەک ناچار بکرێ.
**تلکس**- ا. فر(تەلیکس- telîks): تەلێکس.
**تلکه**- ا(تەلەکە- teleke): تەڵەکە، حیلە، گەڕ، گزی، فێڵ، دەهۆ.
**تلکه کردن**- مص(تەلەکە کەردەن- teleke kerden): حیلە کردن، تەڵەکەکردن، بلۆف، تەڵەکەبازی.
**تلگراف**- ا. فر(تەلەگراف- telegraf): تەلەگراف.

**تلگرام**- ا. فر(تەلەگرام- telegram): پەیامی تەلەگرافی کە لەسەر کاغەز نووسرابێ.

**تلمبار**- ا(تەلەمبار- telembar): شوێنی تایبەت بۆ بەخێوکردنی کرمی ئاوریشم، زیادە شتی لەسەر یەک کەڵەکە کراوی عەمارکراو.

**تلمبە**- ا(تولومبە- tulumbe): ترومپا، دینەمۆ، شیرە.

**تلمذ**- ع. مص(تەلەمموز-telemmuz): دەرس خوێندن، بوونە قوتابی، قوتابیاتی.

**تلمع**- مص. ع(تەلەمموء-’telemmu): درەوشانەوە، بریقانەوە، بریسکانەوە.

**تلمیح**- مص. ع(تەلمیھ- telmîh): تیل نیشان، سووکە تەمەشا، تەمەشاکردنی شتێک و ئاماژە بۆ کردنی.

**تلمیذ**- ا.ع(تیلمیز- tilmîz): قوتابی، خوێندکار، شاگرد.

**تلنگ**- ا(تولەنگ- tuleng): دەست پان کردنەوە، سواڵ، گەدایی، پارسەکی.

**تلنگی**- ا(تولەنگی- tulengî): گەدا، سواڵکەر، پارسەک.

**تلنگ**- ا(تیلینگ- tiling): سیرمە.

**تلنگ**- ا(تەلەنگ- teleng): لێدان بەسەری پەنجە، لێدانی دەف و دایەرە.

**تلنگر**- ا(تەلەنگور- telengur): دەنگی سەری قامکان کە لە شتێکی بدەن، پەلەپیتکە.

**تلو**- ا. ع(تیلڤە- tilve): دوا، پاش، بێچوە وشتر کە دوای دایکی خۆی دەکەوێت.

**تلوث**- مص. ع(تەلەڤڤوس- televvus): لەوتان، پیس بوون، ئاڵودەبوون.

**تلون**- مص. ع(تەلەڤڤون-televvun): رەنگاو رەنگ بوون، هەر دەمەی بە رەنگێ.

**تلویح**- مص. ع(تەل ڤیھ- telvîh): ئاماژەکردن لە دوورەوە، نیشان دان، حاڵی کردنی مەبەستێک بە هێماو ئاماژە، دەست شەکانەوە.

**تلویزیون**- ا.فر(تیلیڤزیون- tilivîzyun): تەلەفزیۆن.

**تله**- ا(تەلە- tele): تەڵە.

**تله**- ا(تیللە- tille): پلە، پلەی نەردەوان، زەرکەش.

**تلەبست**- ا. مر(تەلەبەست-telebest): داربەست، ئەسکەلە.

**تلەپاتی**- ا.فر(تیلیپاتی- tilipatî): تلەپاتی، پەیوەندی فیکری نێوان دوو کەس لەمەودای دوورەوە، گوێزانەوەی فیکر.

**تلهف**- مص. ع(تەلەهھوف- telehhuf): خەمخۆری، مشورخواردن، تامەزرۆیی.

**تلین**- مص. ع(تەلەییون- teleyyun): نەرم بوون، مەرایی کردن.

**تلیین**- مص. ع(تەلیین- telyîn): نەرم کردن.

**تم**- ا(تەم- tem): ئاوی سپی یان رەشی چاو، تاریکی، رەشی، لێلایی کە دەکەوێتە سەر چاو، تەمومژ.

**تم**- ا(تیم- tim): بابەتی سەرەکی، بابەت، باس، هەوێن، هامیژەن.

**تمائم**- ا. فر(تەمائیم- temaîm): چاوەزار.

**تمات**- ا. فر(تەمات- temat): تەماتە، گۆجەفەرِەنگی، باژاناسۆر.

**تماثل**- مص. ع(تەماسول- temasul): هاوتایی، وەک یەکی، هامتایی.

**تماثیل**- ا. ع(تەماسیل- temasîl): پەیکەران.

**تماخره**- ا(تەماخەرە- temaxere): گاڵتەو سوعبەت، شۆخی، حەنەک.

**تمادی**- مص. ع(تەمادی- temadî): راکشان، بەردەوام بوون، درێژبوونی ماوە، درێژخایەنی.

**تمار**- ا. ع(تەممار- temmar): خورمافرۆش، کەسێک کە سەوداو مامەڵەی خورما دەکات.

**تمارض**- مص. ع(تەمارِوز-temaruz): خۆ نەخۆش خستن، نەخۆشی نواندن.

**تماس**- مص. ع(تەماس- temas): پەیوەندی کردن، نزیکی.

**تماسک**- مص. ع(تەماسوک- temasuk): یەکگرتن، خۆڕاگرتن، خۆپاراستن.

**تماشا**- ع. مص(تەماشا- temaşa): سەیرکردن، تەماشاکردن، گەڕان و سەیران.

**تماشائی**- ص(تەماشائی- temaşa'î): شایستەی تەماشا، مایەی سەرنج، جوان و دیدەنی، تەماشاکەر.

**تماشاچی**- ص(تەماشاچی- temaşaçî): تەماشاڤان، کەسێک کە سەیری نمایش یان گەمە یا پێشبڕکێ بکات، بینەر، دیتەر.

**تماشی**- ع. مص(تەماشی- temaşî): پێکەوە رێ کردن، پیاسە کردن پێکەوە.

**تمالک**- مص. ع(تەمالوک-temaluk): بوونە خاوەنی خۆت.

**تمام**- ص. ع(تەمام- temam): تەواو، تەکمیل، دروست، بێ عەیب، هەموو، لاپ.

**تمامت**- مص. ع(تەمامەت- temamet): تەواوکردن، کامیل کردن.

**تمامی**- ص. ع(تەمامی- temamî): هەر هەموو، بە تەواوی، بە لاپی.

**تمایز**- مص. ع(تەمایوز- temayuz): جیابوونەوە، جیالێکدی، جیاوازی هەبوون لەگەڵ یەکدیدا.

**تمایل**- مص. ع(تەمایول- temayul): داشکان بە لایەکا، خواربوون بەلایەکدا، ئارەزووکردن، مەیلکردن.

**تمبر**- ا.فر(تەمبر- tember): پول، پولی پۆستە.

**تمتع**- مص. ع(تەمەتتوء- temettu'): بەرخوردار بوون، سودبردن، لەزەت بردن، چێژوەرگرتن.

**تمثال**- مص. ع(تەمسال- temsal): نموونە هینانەوە، مەسەل هێنانەوە، شتێک وەکو شتێکی تری لێ بکرێت.

**تمثال**- ا. ع(تیمسال- timsal): نیگار، وێنە، پەیکەر، کۆتەڵ، هەیکەل.

**تمثل**- مص. ع(تەمەسسول- temessul): هاوشێوەبوون، مەسەل هێنانەوە، نموونە هێنانەوە.

**تمثیل**- مص. ع(تەمسیل- temsîl): مەسەل هێنانەوە، نموونە هێنانەوە، حیکایەت هێنانەوە.

**تمجمج**- مص. ع(تەمەجموج- temecmuc): منجەمج، مینگە مینگ، جولان.

**تمجید**- مص.ع(تەمجید- temcîd): ستایش کردن، گەورەکردن، ڕێزگرتن.

**تمدد**- مص. ع(تەمەددود- temeddud): کشان، ڕاکشان، پاڵکەوتن، هەلاّژان، ڕازان.

**تمدن**- مص. ع(تەمەددون- temeddun): بەمەدەنی بوون، شارنشینی، شارستانیەت.

**تمدید**- مص. ع(تەمدید- temdîd): کشاندن، درێژکردنەوە.

**تمرد**- مص. ع(تەمەڕود- temerud): سەرپێچی کردن، یاخی بوون، سەرکێشی.

**تمرمر**- مص. ع(تەمەرمور- temermur): جولاّن، لەرزین.

**تمرین**- مص. ع(تەمرین- temrîn): تەمرین، ڕاهێنان، نەرم کردن، فێرکردن.

**تمساح**- ا. ع(تیمساه- timsah): تیمساح.

**تمسخر**- مص. ع(تەمەسخور- temesxur): ڕیش خەن، گاڵتەپێ کردن، مەسخرە پێ کردن.

**تمسک**- مص. ع(تەمەسسوک- temessuk): گرتن، چنگ لێ گیرکردن، دەساوێز، پەلّپ و بیانوو.

**تمسکن**- مص. ع(تەمەسکون- temeskun): هەژاربوون.

**تمشاء**- مص. ع(تیمشاء- timşa’): ڕۆییشتن، ڕۆیین، پیاسەکردن.

**تمشک**- ا(تەمیشک- temişk): توترک، توڕک.

**تمشی**- مص. ع(تەمەششی- temeşşî): ڕۆیین، پیاسەکردن.

**تمشیت**- مص. ع(تەمشییەت- temşîyet): بەڕێ کردن، ڕەوان کردن، ڕایی کردنی کارێک.

**تمضمض**- مص. ع(تەمەزموز- temezmuz): ئاو لەدەم وەردان، غەرغەرە.

**تمغا**- ا. ت(تەمغا- temxa): تەمغە، مۆر، داغمە.

**تمکن**- مص. ع(تەمەککون- temekkun): دەوڵەمەند بوون، وەدەست هێنانی پلەو پایە، جێگیربوون.

**تمکین**- مص. ع(تەمکین- temkîn): جێگیرکردن، قەبوڵ کردن، دەوڵەمەند کردن.

**تملق**- مص. ع(تەمەللوغ- temellux): مەرایی، ڕیابازی، زمان لوسی، ڕیایی، دووڕوویی.

**تملک**- مص. ع(تەمەللوک- temelluk): بوونە خودان موڵک، موڵکداربوون.

**تمنه**- ا(تەمەنە- temene): دەرزی لێفەدرون، دیلوان، دلیوان، تەبەنە.

**تمنی**- مص. ع(تەمەننی- temennî): خۆزیا خواستن، ئارەزووکردن، تەمەناکردن، ئاواتخوازی.

**تموج**- مص. ع(تەمەڤڤوج- temevvuc): شەپۆل دان، پیلدان.

**تموز**- ا(تەمموز- temmûz): مانگی تەمموز (۷)، گەرمای سەخت.

**تمول**- مص. ع(تەمەڤڤول-temevvul): بۆنە خاوەن ماڵ، زەنگین بوون.

**تمهید**- مص. ع(تەمهید- temhîd): هەموارکردن، ئامادەکردن، ڕێگەخۆش کردن.

**تمهیل**- مص. ع(تەمهیل- temhîl): مۆڵەت دان، دەرفەت پێ دان، موراعات، نەرمی کردن.

**تمیز**- ا. ص(تەمیز- temîz): پاک، پاکیزە، زیرەکی و هوشیاری، فەرق و جیایی.

**تمیز**- مص. ع(تەمەیوز- temeyyuz): ناسینەوە، جیابوونەوە.

**تمیمە**- ا. ع(تەمیمە- temîme): چاوەزار.

**تمییز**- مص. ع(تەمییز- temyîz): ناسینەوە، جیاکردنەوە، جیاکردنەوەو ناسینی شتان لێکدی.

**تن**- ا(تەن- ten): تەن، لەش، بەدەن، بەژن و باڵا.

**تن**- ا. فر(تۆن- ton): تۆن، بەرزی و نزمی دەنگ و گۆرانی.

**تن**- ا. فر(تەن- ten): تەن، هەزار کیلۆ.

**تناد**- مص.ع(تەناددود- tenaddud): لێکدی رەوینەوە، پەراگەندەبوون.

**تنازع**- مص. ع(تەنازوء- tenazu’): بەشەڕهاتن، کێشمانەکێش، گێنگەشە، قەرقەشە.

**تن اسا**- ص. فا(تەن ئاسا- tenasa): ئیسراحەتخواز، خۆشگوزەران، یەکێک دایمە دەربەستی ئیسراحەتی خۆی بێ.

**تن اسان**- ص(تەن ئاسان- tenasan): تەندروست، ساغ، تەمەڵ، تەن پەروەری، خۆشگوزەرانی، تەوەزەلی.

**تناسب**- مص.ع(تەناسوب-tenasub): هاوئاهەنگی، گونجان، پەیوەندی، خزمایەتی، هاوڕێژە.

**تناسخ**- مص. ع(تەناسوخ-tenasux): دۆنای دۆن، گۆڕان، بەتاڵ کردنەوە.

**تناسل**- مص. ع(تەناسول- tenasul): زاوزێ، نەوە خستنەوە، زورییەت خستنەوە.

**تنافر**- مص. ع(تەنافور- tenafur): نەسازان، لێکدی دوورکەوتنەوە، بێزاربوون لێکدی، نەگونجان.

**تنافی**- مص. ع(تەنافی- tenafî): دژایەتی یەکدی، ناحەزی، نەیاری.

**تناقض**- مص. ع(تەناغوز-tanaxuz): دژ بوون لەگەڵ یەکدیدا، ناکۆکی.

**تنانی**- ص.ن(تەنانی- tenanî): بەدەنی، جەستەیی.

**تناوب**- مص. ع(تەناڤوب-tenavub): بەنۆرە، ئەنجامدانی کارێک نۆرە بە نۆرە.

**تناور**- ص(تەناڤەر- tenaver): تۆکمە، قەڵەو، بەهێز.

**تناول**- مص. ع(تەناڤول- tenavul): نان خواردن، دەست گەیاندن، گرتن.

**تناهی**- مص. ع(تەناهی- tenahî): گەییشتنە کۆتایی، بنەتایی.

**تنباکو**- ا(تەنباکو- tenbaku): تووتن، تەماکۆ.

**تنبان**- ا(تونبان- tunban): بیجامە، دەرپێ.

**تنبسە**- ا(تەنبەسە- tenbese): مافور، فەرش، قاڵی، رایەخ.

**تنبک**- ا(تونبەک- tunbek): دومبگ، تەپڵ.

**تنبل**- ص(تەنبەل- tenbel): تەمەڵ، تەوەزەل، ئیش نەکەر.

**تنبل**- ص(تونبول- tunbul): فێڵ، حیلە، تەڵەکە، جادو، ئەفسوون.

**تنبور**- ا(تەنبور- tenbûr): تەموره، تەنبور، تەمبوره، تەميره.

**تنبوشه**- ا(تەنبوشە- tenbûşe): ئاوەڕۆ، مەنهۆڵ.

**تنبه**- مص. ع(تەنەببوه- tenebbuh): وەئاگاهاتن، وەخۆهاتن، بێداربوون، ئاگاداربوون.

**تن‌بها**- ا(تەن‌بەها- tenbeha): پارەی کەفالەت، ئەو پارەیەی کە یەکێک بۆ ئازادبوونی یەکێک لە زندان، لە قاسەی مەحکەمە دای بنێ.

**تنبیدن**- مص (تەنبیدەن-ten bîden): رووخان، هەرەس هێنان، دارووخان، داتەپین.

**تنبنده**- ا. فا(تەنبەندە- tenbende): دارووخاو، هەرەس بردوو.

**تنبیده**- ص. مف(تەنبیدە-ten bîde): رووخاو.

**تنبیه**- مص. ع(تەنبیە- tenbîh): بێدارکردنەوە، ئاگادارکردن.

**تن پرور**- ص. فا(تەن پەروەر- tenperver): تەمەڵ، لەش بە دۆشاو، خۆشگوزەران، دەست و پێ سپی.

**تن‌پوش**- ا. مر(تەن پوش- tenpûş): پۆشاک، جل، بەرگ.

تنجیدن- مص. (تەنجیدەن- tencîden): تێک ترنجان.

**تنجیده**- ص. مف(تەنجیدە- tencîde): تێک ترنجاو.

**تنجیز**- مص. ع(تەنجیز- tencîz): ئەنجامدان، رەواکردن.

**تنجیم**- مص. ع(تەنجیم- tencîm): ئەستێرەناسی، ئەستێرەوانی، بەختگرەوە.

**تنحنح**- مص. ع(تەنەهنوه- tenehnuh): کۆکین بە مەبەستی سافکردنی دەنگ.

**تنخواه**- ا(تەنخا- tenxah): سەرمایە، پولی نەغد، زێڕو زیو، سەروەت و سامان.

**تنخواه‌گردان**- ا. مر(تەنخاهی گەردان- tenxahîgerdan): ئیحتوباری بزاو، پارەیەک کە لە قاسەی دایەرە دابنرێ تا لە کاتی پێویستدا خەرج بکرێ.

**تند**- ص (توند- tund): چالاک، چاپوک، توڕە، خێرا، تون و تفت، تیژ، بڕندە.

**تنداب**- ا.ص(تونداب- tundab): تێزاب، قەڵبەزە، تاڤگە، سولاڤ، تێژەنگ، رێژاوی بە خوڕ.

**تندباد**- ا. ص(توندباد- tundbad): تۆفان، باوبۆران، بارۆڤە.

**تندبار**- ا. ص(توندبار- tundbar): گیانەوەرانی دڕندە.

**تندخو**- ص(توندخو- tundxû): توڕە، سەرچڵ، توندە میزاج.

**تندر**- ا(توندەر- tunder): هەورە تریشقە، هەورە بروسکە.

**تندر دادن**- مص(تەندەر دادەن- tenderdaden): رازی بوون، قایل بوون، هاتنە رەدا، ئامادەبوون بۆ کارێ.

**تندرست**- ص. مر(تەندوروست- tendurust): لەش ساغ، سەلامەت.

**تندرو**- ص.فا(توندرەو- tundrew): توندڕەو، بێ پەروا، خۆشبەز، تیژڕۆ.

**تندرو**- ص. مر(توندرو- tundrû): رووگرژ، مۆن، رژد، بەغیل، چاوچنۆک.

**تندم**- مص. ع(تەنەددوم-

cahiliyet): دەورانی پێش ئیسلامی عەرەب.

**جای**- ا(جای- cay): جێ، شوێن.

**جای باش**- ا. مـر(جای باش- cay baş): شوێنی نیشتەجێ، ماڵ، سەرا.

**جایز**- ا. فا. ع(جایز- cayîz): شیاو، حەلاڵ، جایز، رەوا.

**جایزه**- ا. ع(جایزه- cayîze): بەخشش، خەلات، پاداشت.

**جایگاه**- ا. مـر(جایگاه- caygah): پایەو پلە، ماڵ، سەرا، شوێن.

**جایگزین**- ص. فا(جای گوزین- cayguzîn): جێگیر، کەسێ کە شوێنێ بۆ خۆی هەڵبژێرێ.

**جایگه**- ا. مـر(جای گەه- caygeh): جێگە، شوێن، ماڵ، سەرا، پلەو پایە.

**جایگیر**- ص. فا(جای گیر- caygîr): جێگیر، جێ گرتوو، کەسێک یان شتێک لە شوێنی جێگیر بووبێ.

**جای مند**- ص(جای مەند- cay mend): تەمەڵ، تەوەزەل، بێکارە.

**جایی**- ا(جایی- cayî): ئاودەستخانە، ئەدەب.

**جاییدن**- مص. م(جاییدەن- cayîden): جووین، جاوین، جاکاندن.

**جب**- ا. ع(جوب- cub): بیری قوڵ، بیری پڕ ئاو، چاڵ.

**جب**- مص. ع(جەب- cebb): بڕین، پەرچکردنی دار خورما، زاڵ بوون، سەرکەوتن.

**جبا**- ا. ع(جەبا- ceba): باج و خەراج، کۆلی ئاو بۆ ئاودانی وشتران، ئەستێلی ئاو.

**جباء**- مص. ع(جباء- ciba’): ترسان، سست بوون، خاوبوونەوە.

**جبـاء**- ص. ع(جوباء- cuba’): ترسنۆک، بێ زات.

**جبائر**- ع(جەبائیر- ceba’ir): جەبیرە.

**جباب**- ا. ع(جیباب- cibab): بیری قووڵ، بیری پڕ ئاو، چاڵ.

**جباب**- مص. ع(جیباب- cibab): زاڵبوون، سەرکەوتن.

**جباب**- ا. ع(جوباب- cubab): قاتی، خۆرایی، کەفی شیر.

**جباب**- ع.ص. ع(جەبباب- cebbab): جبەدرو، جبەفرۆش.

**جبابره**- ع(جەبابیرە- cebabire): سەرکێشان، یاخیان، دلێران، سوڵتانانی بە جەبەروت، پاشایانی ستەمکار.

**جباجب**- ا. ع(جەباجیب- cebacib): زەمیلەی چەرمی.

**جباجب**- ا. ع(جەباجیب- cebabib): تەپڵ.

**جباخانه**- ا. مـر(جەبباخانە- cebbaxane): کارخانەی کەرەستەسازی شەڕ، جبەخانە، چەکخانە، عەماری جل و بەرگ و چەکی جەنگی.

**جبادارباشی**- ا. مـر(جەببادارباشی- cebbadar başî): سەرۆکی جبەخانە، بەرپرسی جبەخانە (لە زەمانی سەفەویاندا).

**جبار**- ص. ع(جەببار- cebbar): سیفەتێکی خوایە، زاڵ، سەرکێش، لووت بەرز، پاشای ستەمکار.

**جبارت**- مص. ع(جیبارەت- cibaret): شکستبەندی، گرتنەوەی ئێسکی شکاو.

**جبال**- ا. ع(جیبال- cibal): کێوان، شاخان، چیایان، جەوەڵان.

**جبان**- ص. ع(جەبان- ceban): ترسنۆک، بێ زاخ، بێ جورئەت.

**جبان**- ص. ع(جەببان- cebban): دەشتی کاکی بە کاکی، سارا، گۆڕستان، بیابان.

**جبان**- ص. ع(جەببان- cebban): پەنیر فرۆش.

**جبان**- ا. ع(جەببان- cebban): دەشتی تەختی رووتەن، سارا، بیابان، گۆڕستان.

**جبانت**- مص. ع(جەبانەت-cebanet): ترسان، ترسنۆکی، بێ جورئەتی، بێ ورەیی.

**جبانه**- ا. ع(جەبانە- cebane): دەشت، سارا، گۆڕستان، دەشتی تەختی بێ درەخت.

**جباوت**- مص. ع(جەباڤەت- cebavet): کۆکردنەوەی باج و خەراج.

**جباه**- ا. ع(جیباه- cibah): تەوێڵ، نێوچەوان، ئەنی، هەنیە، جەمین، توێڵ.

**جبایت**- مص. ع(جیبایەت-cibayet): باج وەرگرتن، خەراج سەندن.

**جبت**- ا.ع(جیبت- cibt): بت، سەنەم، سیحر، جادوباز، بێ خێر، بێ کەڵک.

**جبجاب**- ا. ع(جەبجاب- cebcab): ئاوی زۆر.

**جبجبه**- ا. ع(جوبجوبە- cub cube): زەمیلەی چەرمی.

**جبر**- مص. ع(جەبر- cebr): گرتنەوەی ئێسکی شکاو، چاککردنی حاڵی کەسێک.

**جبر**- ا.ع(جەبر- cebr): جەبر، یەکێکە لە زانستەکانی بیرکاری.

**جبرائیل**- ا. خ. ع(جیبرائیل- cibra’îl): جبراییل، پەیکی خوا، ئەو فریشتەیەیە کە سروشی بۆ پێغەمبەر دێنا.

**جبراهنگ**- ا(جەبراهەنگ- cebraheng): زەردەسیری، زەردەدڕک، دڕکەزی.

**جبرئیل**- ا. خ. غ(جیبرەئیل- cibre’îl): جبراییل.

**جبروت**- ا. ع(جەبەروت- ceberût): دنیای تواناو عەزەمەتی خوایی، گەورەیی و شکۆداری، تواناو دەسەڵات.

**جبری**- ص. ن(جەبری- cebrî): پەیرەوی رێبازی جەبری.

**جبریل**- ا. خ- ع(جیبریل- cibrîl): جیبراییل.

**جبریه**- ا. ع(جەبرییە- cebrîye): یەکێکە لە فیرقەکانی ئیسلام کە باوەڕیان بە جەبرەو بەندە بە موختار نازانن.

**جبس**- ص. ع(جیبس- cibs): ترسنۆک، لەگام، گەچ، بێچوە ورچ، فاسیق.

**جبسین**- ا(جەبسین- cebsîn): گەچ، گەچین.

**جبغوت**- ا.ع(جەبغوت- cebxût): ناوەخن، ناوەخنی دۆشەک و لێفەو سەرین.

**جبلاهنگ**- ا(جەبلاهەنگ- ceblaheng): دڕکەزی، زەردەسیری، زەردەدڕک.

**جبلت**- ا. ع(جیبیللەت- cibillet): تەبیعەت، سروشت، ئەسڵ، فیترەت، خیلقەت.

**جبلهنگ**- ا(جەبلەهەنگ- cebleheng): درکەزی، زردەسیری، زردەدڕک.

**جبلی**- ص.ن. ع(جەبەلی- cebelî): جەوەڵی، کێوی، کوێستانی، چیایی، شاخاوی.

**جبلی**- ص. ن.ع(جیبیللی- cibillî): تەبیعی، سروشتی، فیتری، ئەسڵی، خودی.

**جبن**- ا. ع(جوبن- cubn): پەنیر.

**جبن**- مص. ع(جوبون- cubun): ترسان.

**جبناء**- ص. ع(جوبەناء- cubena’): ترسنۆکان، بێ جورئەتان.

**جبه**- ا. ع(جوببە- cubbe): جبە، جۆرە کەوایەکە زیاتر مەلایان لەبەری دەکەن.

**جبهات**- ا.ع(جەبەهات- cebehat): نێوچەوان، توێڵ، هەنیە.

**جبهخانه**- ا. مر(جوببەخانە- cubexane): قۆرخانە، جبەخانە، کارخانەی کەرەستەسازی شەڕ.

**جبهه**- ا. ع(جەبهە- cebhe): تەوێڵ، سەرداری قەوم، بەرەی شەڕ، کۆمەڵی خەڵک.

**جبیره**- ا. ع(جەبیرە- cebîre): تەختەی باریک کە شوێنی شکاوی پێ دەبەستن.

**جبیز**- ا. ع(جەبیز- cebîz): نانی وشک.

**جبیس**- ا. ص(جەبیس- cebîs): بێچوە ورچ، خوێری و ناکەس بەچە، لەگام.

**جبیل**- ص. ع(جەبیل- cebîl): بەدخوو، ناشیرین، دزێو، کرێت.

**جبیل**- ا. ع(جوبەیل- cebeyîl): کێوی بچوک.

**جبین**- ا. ع(جەبین- cebîn): توێڵ، ناوچەوان، هەنیە، ئەنێ.

**جبین**- ص.ع(جەبین- cebîn): ترسنۆک، بێ زات.

**جت**- ا. انگل(جەت- cet): جۆرە فرۆکەیەکە، فوارە.

**جثالقه**- ا. ع(جەسالیغە- cesalîxe): قەشە.

**جثام**- ا. ع(جوسام- cusam): کابوس، پیرەهەڤۆک، شەوگ، مۆتەکە.

**جثث**- ا.ع(جوسەس- cuses): بەدەن، لەش، لاک، تەرم، جەنازە.

**جثلیق**- ا. ع(جەسلیغ- ceslîx): قەشە.

**جثمان**- ا. ع(جوسمان- cusman): بەدەن، جەستە، لەش، تەرم.

**جثه**- ا. ع(جوسسە- cusse): جەستە، بەدەن، تەن، لەش، تەرم.

**جحا**- ا. خ(جوها- cuha): ناوی کابرایەکی عەرەبە کە لە سەردەمی خیلافەتی مەهدیدا لە کوفە ژیاوە، نوکتەو حیکایەتی پێکەنینئاوەری لێ دەگێردرێتەوەو وەکو نموونەی گێلێتی یا خۆ لە گیلی دان دەهێنرێتەوە.

**جحاش**- ا. ع(جیهاش- cihaş): جاشەکەران.

**جحاف**- ا. ع(جوهاف- cuhaf): سکچوون و بەلەفیرێ، مەرگی گشتی،

لافاوێک هەرچی هەیە رایماڵێ.

**جحاف**- مص. ع(جیهاف- cihaf): کوشتار، شەڕکردن، جەنگ کردن.

**جحافل**- مص. ع(جەهافیل-cehafil): سوپا، لەشکری زۆر.

**جحد**- مص. ع(جەهد- cehd): ئینکارکردن، بەدرۆخستنەوە، نکۆڵی کردن لە کارێک یان هەقی کەسێک بە ئانقەست.

**جحر**- ا. ع(جوهر- cuhr): لانەی گیانلەبەرانی درندەو کونی خشۆکان و مێرووان.

**جحر**- ا.ع(جوهر- cuhr): ئەشکەوتی قووڵ.

**جحش**- ا. ع(جەهش- cehş): جاش، جاشەکەر، جوانوو.

**جحش**- مص. ع(جەهش- cehş): رووشاندنی پێست.

**جحف**- مص. ع(جەهف- cehf): کەوڵکردن، گرون، وەدەستهێنانی شتێک.

**جحفل**- ا. ع(جەهفەل- cehfel): لەشکری زۆر، سوپا، جوامێر، گەورەپیاو، پیاوی قەدرگران.

**جحل**- ا.ع(جەهل- cehl): مارمیلۆک، گوخلکەر، شای مێش هەنگ، گوخڵێنە، قاڵۆنچەی ریخ گلێن.

**جحم**- مص. ع(جەهەم- cehem): هەڵگیرساندنی ئاگر، ئاگر کردنەوە.

**جحود**- مص. ع(جوهود- cuhûd): نکۆڵی کردن، نکۆڵی کردن لە هەقی کەسێک، بەدرۆخستنەوە، سپڵەیی.

**جحیم**- ا.ع(جەهیم- cehîm): دۆزەخ، دۆزەق، جەحەندەم.

**جخاف**- ص. ع(جەخخاف- cexxaf): فەخرکەر، کەسێک کە لە ئەندازەی خۆی زیاتر فەخر بکات.

**جخج**- ا(جەخج- cexc): لو، لوی بێ ئازار، گرێی ژێر قورگ و گەردنی مرۆڤ.

**جخش**- ا(جەخش- cexş): گواتر (فەرەنسی)، لو، گرێ.

**جخیف**- ا. ص(جەخیف- cexîf): دەنگی پرخە پرخی خەوتوو، زۆر، لەشکری زۆر، بەفیزو دەعیە.

**جد**- مص. ع(جید- cid): هەوڵدان، کۆشش، پەلە، راستی، هەقیقەت.

**جد**- ا.ع(جەد- ced): باپیر، باوەگەورە، بابی دایک، بابی باوک.

**جد**- ا. ع(جەد- ced): بەش، بەخت، کەنار، قەراخ، رەخی رووبار.

**جدا**- ص(جودا- cuda): جودا، دوور لێکدی، تەنیا، دیار.

**جداء**- ا. ع(جەداء- ’ceda): بەخشش، سود، قازانج.

**جدات**- ا. ع(جەددات- ceddat): داپیران.

**جداجدا**- ق(جوداجودا- cuda cuda): جیاجیا، یەک یەک، بەجیا.

**جدار**- ا. ع(جیدار- cidar): دیوار.

**جداشدن**- مص. ل(جوداشودەن- cuda şuden): جیابوونەوە، دوورکەوتنەوە.

**جدا کاسبرگ**- ا. مر(جودا کاسبەرگ- cuda kasberg): ئەو گوڵانەی کە پەڕەکانیان جیایە، وەکو هەڵاڵە.

**جداکردن**- مص. م(جوداکەردەن-

cuda kerden): هەڵبژاردن، جیاکردنەوە.

**جداگانە**- ق. ص(جوداگانە- cudagane): ئەلاحەدە، بەتەنیایی، بەجیا.

**جداگلبرگ**- ا. مر(جودا گولبەرگ- cuda gulberg): جۆرە گیاو گۆڵێکە، وەکو گوڵەباخ.

**جدال**- مص. ع(جیدال- cidal): شەڕکردن، مشتو مڕکردن، کێشمانەکێش، جەنگ و قەرقەشە.

**جدال**- ص. ع(جەددال- ceddal): شەڕانی، مریشک فرۆش، فرۆشیاری قەفەزی مریشک.

**جدامیشی**- ا(جەدامیشی- cedamîşî): جۆرە سیحرێکە گوایە دەتوانێ لە هەر وەرزێکا بۆران و تۆفان هەڵبکا تەنانەت لە ناوەندی هاوینیشدا.

**جداول**- ا. ع(جەداڤیل- cedavîl): خشتە، جۆگە.

**جدب**- ع. ا(جەدب- cedb): مادەیەکی ئامال سپییە لەسەری دار خورما پەیدا دەبێ تامی شیردەدا لەگەڵ هەنگوین و شیرینیدا دەخورێ، بەزی دار خورما (شحم النخلە).

**جدب**- مص. ع( جەدب- cedb): وشکەساڵی، قات و قڕی، عەیب دەرخستنی کەسێک.

**جدباء**- ص. ع(جەدباء- cedba’): زەوی رووتەن و بێ گیا، رووتەن.

**جدت**- مص. ع(جیدەت- cidet): نوێبوون، تازەیی.

**جدجد**- ا.ع(جودجود- cudcud): زیکزیکە، سیسەرک.

**جدد**- ا. ع(جەدەد- ceded): دەشت، تەختانی، راستانی، زەوی هەموار.

**جدر**- ا(جەدر- cedr): وشتری مێچکەی چوار ساڵە.

**جدر**- ا. ع(جەدر- cedr): دیوار.

**جدر**- ا. ع(جودر- cudr): دیواران.

**جدر**- ا. ع(جەدر- cedr): ئاوڵە.

**جدران**- ا. ع(جودران- cudran): دیواران.

**جدره**- ا. ع(جەدرە- cedre): ئاوڵە وردە.

**جدری**- ا. ع(جودەری- cuderî): نەخۆشی ئاوڵە، خوریکە، خروکە.

**جدع**- مص. ع(جەدء- ced’): بڕین، بڕینی گوێ یان لووت یان لێو، حەپس و بەندکردن.

**جدعاء**- ص. ع(جەدئاء- ceda’): کەپووبڕیاگ، گێ بڕاو.

**جدکاره**- ا(جودکارە- cudkare): بیروبۆچوونی جیاواز، رەوشو رێبازی جۆراوجۆر.

**جدل**- ا. ع(جەدەل- cedel): مشتومڕ، دەحکە، موقاشەی توند، شەڕو قەرقەشە، کێشمانەکێش.

**جدوا**- ا.ع(جەدڤا- cedva): بەخشش، عەتا.

**جدوار**- ا(جەدڤار- cedvar): جۆرە رووەکێکە.

**جدول**- ا. ع(جەدڤەل- cedvel): جۆگە، خشتە.

**جدول بندی**- ا. مص(جەدڤەل بەندی- cedvel bendî): جۆگە سازی،

ڕەسـمکردنی خـشـتـە لەسـەر کـاغـەز، جۆگەسازی لە کەناری شەقامان.

**جده**- ا. ع(جەددە- cedde): داپیرە، دایە گەورە.

**جدی**- ا. ع(جەدی- cedî): کارژۆڵە، گیسکە نێر، ناوی بورجی دەیەمی فەلەکییە.

**جدی**- ا. ع(جیددی- ciddî): جدی، هەقیقەت، کۆششکار.

**جدیت**- مص. جع(جیددییەت- ciddîyet): جدیەت، کۆشش، هەوڵدان.

**جدید**- ص. ع(جەدید- cedîd): نوێ، تازە.

**جدید الاحداث**- ص. مر(جەدیدول ئیحداس- cedîdul ihdas): نۆ بونیاد، تازە سازکراو.

**جدید الاختراع**- ص. مر. ع(جەدیدول ئیختیراء- cedîdul ixtira’): تازە داهێنراو.

**جدید الاسلام**- ص. مر.ع(جەدیدول ئیسلام- cedîdul islam): تازە موسوڵمان، نوێ موسوڵمان.

**جدید البناء**- ص. مر. ع(جەدیدول بیناء- cedîdul bîna’): نوێساز، نەوبونیاد.

**جدید التأسیس**- ص. مر ع(جەدیدوت تەئسیس- cedîdet te’sîs): تازە ساز، تازە دامەزراو.

**جدید الورود**- ص. مر.ع(جەدیدول ڤرود- cedîdul vrûd): تازە هاتوو، تازە گەییشتوو.

**جدید الولاده**- ص. مر. ع(جەدیدول ڤیلادە- cedidul vilade): نەوزا، تازە لە دایکبوو.

**جدیدان**- ا. ع(جەدیدان- cedîdan): شەو و ڕۆژ (بەو حەساوەی کۆن نابن).

**جدیر**- ص. ع(جەدیر- cedîr): شایستە، شایان، هەژ.

**جدیر**- ا.ع(جەدیر- cedîr): چوار دیوار، هەر جێیەک دیواری بەدەورا کێشرابێ.

**جدیره**- ص. ع(جەدیرە- cedîre): شایستە(بۆمێ)، هەژ، شایان.

**جذ**- مص. ع(جەزز- cezz): هەڵکێشان لەبن و بێخەوە، بڕین و بڕینەوە، شکاندن.

**جذاب**- ص. ع(جەززاب- cezzab): دڵکێش، دلڕفێن، سەرنج ڕاکێش.

**جذاع**- ا. ع(جەزاء- ceza’): حەیوانی وردە (مەڕو بزن و... هتد).

**جذال**- ا. ع(جزال- cezal): قەدی درەخت.

**جذام**- ا.ع(جوزام- cuzam): گولی.

**جذب**- مص. ع(جەزب- cezb): ڕاکێشان، ڕاکێشانی بەرەوخۆ.

**جذبه**- ا. ع(جەزبە- cezbe): ڕاکێشان، ماوەی نێوان دوو قۆناغ: (لەسەفەردا) جەزبەی سۆفی و دەروێشان بەرەو خوا، حاڵ لێهاتن.

**جذر**- ا.ع(جەزر- cezr): ڕەگ، ریشە، بێخ، ئەسڵ.

**جذر**- ا.(جەزر- cezr): زێڕی قەڵب، مێچکە وشتری چوار ساڵە.

**جذع**- ا.ع(جیزء- ciz’): قەد.

**جذع**- ا.ع(جەزەء- ceze’): حەیوانی

ورده، مەڕو بزین و....
**جـذل**- ا .ع(جـیـزل- cizil): رەگ و ریشە، قەدی درەخت.
**جـــذل**- مص. ع(جـــەزەل- cezel): شادبوون، شادی کردن، شادمانی.
**جذم**- مص. ع(جەزم- cezm): بڕین.
**جـذم**- ا. ع(جـیـزم- cizm): بن و بێـخی شـتـێک، شـوێنی رووان، قـەوم و قیلە.
**جـذوب**- ص. ع(جـەزوب- cezûb): کوشندە، وشتری کەم شیر.
**جـذور**- ا. ع(جـوزور- cuzûr): رەگ و ریشان، بنج و بناوان.
**جـذوع**- ا. ع(جـوزوء- cuzû’): قـەدی درەخت.
**جـذول**- ا. ع(جـوزول- cuzûl): ئەسڵ، رەگ و ریشە یان قەدی درەخت.
**جذوە**- ا. ع(جەزڤە- cezve): پشکۆ، پنگر، سکڵ.
**جر**- ا(جـەر- cer): درز، کـون، جـۆگـە، قەڵشتی زەوی، روبارۆکە.
**جـر**- ا(جـیـر- cir): دەنگی دڕاندنی کاغەز یان کوتاڵ (جڕ).
**جـرخـوردن**- مص. ل(جـیـرخـوردەن- cirxûrden): دڕان، درزبردن.
**جـــــردادن**- مص. م(جـــیـــردادەن- cirdaden): دڕاندن، دادڕین.
**جرزدن**- مص(جیرزەدەن- cirzeden): سەرپێچی کردن لە بنەماکانی قومار.
**جر**- ا(جور- cur): زینی ئەسپ.
**جر**- مص. ع(جەد- cer): راکـێـشـان، ژێری وشـە (کـسـرە)، رانینی وشـتـر بە هێواشی.
**جرا**- ا(جەرا- cera): نەفەقە، موچە.
**جـــراء**- ا. ع(جـــیـــراء- cira’): هەرزەکـاری، لاوێنی، جـەوانی، بەهاری تەمەن، منداڵی کچان.
**جرائد**- ا.ع(جەرائیـد- cera’id): لقی دار خورما، رۆژنامە.
**جـرائر**- ا. ع(جـەرائیـر- cera’ir): گوناح، خەتا.
**جـرائم**- ا. ع(جـەرائیم- cera’im): تاوان، تاوانان.
**جراب**- ا. ع(جیراب- cirab): هەنبانە، توێشودان، کیفی شمشێر، هەمانە.
**جراب**- ا.ع(جوراب- curab): کەشتی بێ بار، کەشتی بەتاڵ.
**جرائیم**- ا.ع(جەراسیم- cerasîm): میکرۆبان، مێروستان، شارەمێرولە.
**جراجر**- ا. ع(جەراجیر- ceracir): جەنجەڕ، خەرمان کوت.
**جراجر**- ا. ع(جیراجیر- ciracir): جیـڕەجیـڕ، دەنگی دڕاندنی کـاغـەز یان کوتاڵ(جیڕ).
**جراح**- ا.ع(جیـراه- cirah): برینان، زەمان، رێشان.
**جـــراح**- ص. ع(جـــەڕاه- cerah): جەڕاح، برینگەر، نەشتەرگەر.
**جراحی**- ا. مص. ع(جەراهی-cerahî): جەراحی، نەشتەرگەری.
**جراحات**- ا. ع(جیراهات- cirahat): برینان، زامان.
**جراحت**- ا. ع(جیـراهەت- cirahet): برین، زام، کوان، چڵک و کێم.
**جـراد**- ا. ع(جـەراد- cerad): کـولو، کولە حاجی، کولە.

**جـراد البـحـر**- ا. مـر(جـەرادول بەهر- ceradul behr): مـــەيگو، كـــولـەی دەريايی.

**جـرار**- ا. ع(جـيـرار- cirar): جـەڕە، گۆزەی گەورەی دەسكدار.

**جـرار**- ص. ع(جـەڕار- cerar): زۆر، لەشكری بێشومار.

**جـراره**- ا. ص. ع(جـەراره- cerare): جـۆرە دوپشكێكی زەردە، كلكی بە دووی خۆيدا رادەكێشێت، زوڵفی يارو دوڵبەر.

**جـراز**- ا.ع(جـوراز - curaz): تيغ، شمشێری تيژو بڕندە.

**جراسک**- ا(جـەراسـەک- cerasek): زيكزيكە.

**جراسيا**- ا(جەراسيـيا- cerasîya): ئاڵوباڵو، هەڵوژە.

**جـــراف**- ص. ع(جـــوراف- curaf): سـێلاوێک کـە هەمـوو شـتـێک رامـاڵێ، پياوی زۆر خۆر، پڕ خۆر.

**جـراف**- ا. ع(جـيـراف- ciraf): جـۆرە پێوانەيەكە.

**جراميز**- ا. ع(جەراميز- ceramîz): حەوزی بچووک، مـاڵی بچـووک، بێچـووە گورگی نێر.

**جـرات**- مص. ع(جـورئەت- curet): جورئەت، زات كردن، دلێری، بێباكی.

**جرب**- ا(جورەب- cureb): پۆڕ.

**جرب**- ا. ع(جەرەب- cereb): گەڕی.

**جـرباء**- ا. ص. ع(جـەربا‌ء- cerba’): ئاسـمـان و سـتـێران، زەوی وشک و قـات و قڕی.

**جربز**- ص(جوربوز- curbuz): فريودەر، تەڵەكە، فێڵبازی.

**جربزه**- ا(جوربوزه- curbuze): فێڵ و تەڵەكە، زيرەكی، شايستـەيی، لێهاتوويی لە كاردا، جەربەزە.

**جــرثقـــيـل**- ا.ع(جـــەری ســـەغـــيـل- ceri sexîl): سلينگ.

**جرثومه**- ا. ع(جورسومه- cursûme): ميكرۆب، مێروستان، رەگ و ريشە، گڵی دەوری رەگی درەخت.

**جـرجـر**- ا(جـيـرجـيـر- circir): دەنگی دڕينی كاغەز يان قوماش.

**جـرجــر**- ا.ع(جــەرجــەر- cercer): جەنجەڕ.

**جرجر**- ا. ع(جەرجەر- cercer): پاقلە.

**جـرجـيـر**- ا. ع(جـەرجـيـر- cercir): تەرەتيزە.

**جـرح**- مص. ع(جـەرە- cerh): بريندار كـــردن، بەدگـــوتـن، عـــەيب گـــرتـن، رەتكردنەوەی شايەتی شايەدان.

**جرح**- ا. ع(جورە- curh): زام، برين.

**جـرد**- ص(جــەرەد- cered): بريندار، زامدار.

**جرد**- ا(جەرد- curd): تەختی پاشايی.

**جرد**- ص. ع(جەرد- cerd): جلی كۆنە، دەشتی رووتەن.

**جرده**- ا. ع(جورده- curde): رووتی.

**جرده**- ا. ص(جورده- curde): ئەسپی يەختە، ئەسپی خەسيو، ئەسپێک كە بابی ئەسـپی عـەرەبی و دايكی غـەيرە عـەرەبی بێ.

**جـرده**- ا. ص(جـەرده- cerde): زەردە، ئەسپی ئامال زەرد.

**جـــرذ**- ا. ع(جـــورەز- curez): جـــرج، مشكە كوێرە، مشكی دەشتی، رسک.

**جــرژان**- ا. ع(جـــيـــرزان- cirzan): جرجان، مشکه کوێران.

**جــرز**- ا(جــيــرز- cirz): ديوار، پايەی تەلار.

**جــرز**- ا(جــەرز- cerz): باڵندەيەکــە، هۆبرە، ميشەسی، چرگ، چێرک.

**جــرز**-ا.ع(جـــەرز، جـــەرەز، جــوروز- cerz, cerez, curz): زەوی بـەيـار، زەوی رووتەن.

**جــرز**- ا.ع(جــەرەز- cerez): ســاڵی تووش، ســاڵی قــات و قــڕی، کــۆپەوانەی وشتر.

**جـــرس**- مص. ع(جــــەرس- cers): قسەکردن، نەرمە گۆرانی.

**جـرس**- ا. ع(جـيــرس- cirs): دەنگ، نەرمە ئاواز.

**جـرس**- ا.ع(جـەرس- cers): پاژێک لە شتێک.

**جـرس**- ا. ع(جـيــرس- cirs): ئەسڵ، بێخ.

**جرس**- ا. ع(جەرەس- ceres): زەنگ، زەنگوڵە.

**جــرس**- ا (جـــەرەس- ceres): بەندو زيندان، ئەشکەنجەو ئازار.

**جـرشـفت**- ا(جـەرشــەفت- cerşeft): هەجو، زەم، شيعری داشۆرين.

**جرعه**- ا. ع(جورئە- cur'e): قوم، يەک فڕ.

**جــرعـــه نوش**- ص. فـــا(جـــورئەنوش- cur'e nûş): شـــەراوخـــۆر، بادەنۆش، مەی خۆر، مەست.

**جــرغند**- ا(جـــەرغــەند- cerxend): پارچە ڕێخۆڵەی پاککراوی مەڕ کە بە پلە گـــۆشت يان جگەرو چەوری ئاخنرابێ و لێنرابێ، پاستورمە.

**جرغـول**- ا(جەرغـول- cerxûl): جـۆرە روەکێکە، بە عەرەبی (لسان الحمل)ی پێ دەڵێن.

**جرغون**- ا(جەرغون- cerxûn): بڕوانە (جەرغول).

**جـرف**- ا. ع(جــورف- curf): کــەناری رۆخـانە، کـەناری ئاودڕ، کـەنارێک کـە ئاو دڕی بێ، کەنددڕ.

**جرف**- ا.ع(جەرف- cerf): سـەروەت و سامانی زۆر لە ماڵاتەوە تا زێڕو زيو، هاتە ساڵ، گيای تێک ئاڵاو.

**جـرفـادقــانی**- ص. ن(جـورفـادەغــانی- curfadexanî): گوڵپايگانی، خەڵکی گوڵپايگانی.

**جرقــه**- ا(جـيــرەغـغــە- cirexxe): پزيسکی ئاگر.

**جرگ**- ا(جورگ- curg): سارا، دەشت، بيابان.

**جرگ**- ا(جەرگ- cerg): ئەنجــوومـەن، کۆڕ، گروپ.

**جرگه**- ا(جەرگە- cerge): ريزو ئەڵقە، کۆڕ، ئەنجوومەن، گروپ، دەستە.

**جـرل**- ا. ع(جــەرەل- cerel): شــوێنی سەخت و بەردەڵان.

**جـرم**- ا. ع(جــورم- curm): گــوناح، تاوان، خەتا.

**جرم**- ا. ع(جيرم- cirm): رەنگ، تەن، هەر ئەستێرەيەکی ئاسمان.

**جـرم**- ص. ع(جــەرم- cerm): گــەرم، گەرمەسێر، جۆرە بەلەمێکە.

**جـــرم پوش**- ص. فـــا(جــــورم پـوش-

curm pûş): خەتاپۆش، کەسێ کە چاو پۆشی لە خەتاو تاوان بکات و بیبەخشێت.

**جرمزه**-مص. ع(جەرمەزە- cermeze): هەڵاتن، گردبوونەوە، هەڵاتن، دڵتەنگ بوون، سەفەرو سیاحەت.

**جرم شناسی**- ا. مص(جورم شیناسی- curm şinasî): لقێکی زانستی کۆمەڵناسییە کە لە خەتاو تاوانان دەکۆڵێتەوە.

**جرموز**- ا. ع(جورموز- curmuz): حەوزی بچووک،ماڵی بچووک، جوڕنە.

**جرموق**- ا. ع(جورموغ- curmûx): پیڵاوی لاستیک.

**جرنده**- ا(جەرەندە- cerende): کرکراگە، کرکرۆکە، خرتە، قرتێنک.

**جرنگ**- ا(جەرەنگ- cereng): زرینگە، دەنگی پێکدادانی شمشێرو ئەو شتانە.

**جرنگی**- ص. عا(جیرنگی- cirengî): نەغد، پارەیەک کە بە نەغدو لەیەک شوێن بە کەسێک بدرێ، کاش.

**جرنگیدن**- مص. ل(جەرەنگیدەن- cerengîden): زرینگانەوە.

**جرو**- ا. ع(جەرو- cerû): گوجیلە، توتەڵە سەگ، تویتک.

**جرواسک**- ا(جەرڤاسەک-cervaseg): زیکزیکە، سیسرکەی شەو.

**جروح**- ا.ع(جوروھ- curûh): زامان، برینان.

**جرور**- ص. ع(جەرور- cerûr): تۆسن، سەرکێش، بیری قووڵ.

**جروز**- ص. ع(جەروز- cerûz): زۆرخۆر، نەوسن، خێرا لە خواردن.

**جروم**- ا. ع(جوروم- curûm): گەرمەسێران.

**جروند**- ا(جەرڤەند- cervend): چرا.

**جره**- ا. ع(جەرە- cere): جەرە، گۆزەی گەورەی دەسکدار، گۆزەی مل باریک.

**جره**- ا. ص(جورە- cure): باز، هەڵۆ، نێرەی باڵندان و گیانداران بە گشتی، پیاوی ئازاو دلێر.

**جری**- ص.ع(جەری- cerî): دلێر، جوامێر، رەشید، ئازا، بوێر، عگید.

**جری**- ا(جیری- cirî): مووچە، راتب.

**جریان**- مص. ع(جەرەیان- cereyan): لە بەرڕۆیین، رۆیینی ئاو، رووداوی کارێک، دەستاو دەستکردنی پارە.

**جریب**- ا(جەریب- cerîb): پانتایی ١٠ هەزار مەتر دووجا- (بۆ زەوی).

**جریح**- ص(جەریھ- cerîh): زامدار، بریندار.

**جریحه**- ا(جەریھە- cerîhe): برین، نەخۆشی و بێ تاقەتی.

**جرید**- ا .ع(جەرید- cerîd): تەنیا، سەڵت، لقی دار خورما، لقی رووت.

**جریده**- ا . ع(جەریدە- cerîde): دەفتەر، رۆژنامە، لقی دارخورما، لقی بێ گەڵا، دەستەیەک سوارەی بێ پیادە.

**جریر**- ا. ع(جەریر- cerîr): هەوساری وشتر، دەم گەرم، زمان تیژ.

**جریره**- ا. ع(جەریرە- cerîre): گوناح، خەتا، تاوان.

**جریش**- ا. ص(جەریش- cerîş): ساوەر، برۆش.

**جریم**- ص. ع(جەریم- cerîm): کەتە،

زەلام، تۆکمە، قەسپ، خورمای وشک، تاوانبار، گوناحکار.

**جـریمه**- ص. ع(جـەریمە- cerîme): تاوان، خـەتا، سـزا، سـزای نەغـدی (پارەیەک لە تاوانبار بسەنرێ).

**جرین**- ا.ع(جەرین- cerîn): خەرمان، خـەرمـانجـار، شـوێنی وشک کـردنەوەی خورما، خەرمانگا.

**جز**- حرف(جوز- cuz): جگە لە، مەگەر، خێن ژ...

**جز**- ا(جیـز- ciz): چز، چزە چزی رۆنی قرچاو، چزەی ئاو کە دەکرێ بە ئاگردا.

**جـــززدن**- مـص. ل(جــیـــززەدەن- cizzeden): سـوتان و چزەچزی شـتی سەر ئاگر، ناڵین و زاری کردن.

**جــز**- ا(جــەز- cez): سـوکـەڵەی (جــزیرە)یە، بە واتـا دورگـــە، پارچە زەوییـەکی ناوەندی دەریا کـە لە هەر چوار لاوە ئاو دەوری دابێ.

**جــز**- مص. ع(جــەزز- cezz): بڕین، بڕینەوە، پەرچکردنی دارو درەخت.

**جـــزاء**- مص. ع(جــــەزاء- ceza’): پاداشت دانەوە، پاداشتی چاکە یان خراپە، سزا، هەق.

**جزاء**- ا. ع(جیزاء- ciza’): سەرانە.

**جــزائر**- ا. ع(جــەزائیــر- ceza’ir): دوڕگان، کۆی دوڕگە، گراڤ.

**جــزار**- مص. ع(جـــیـــزار- cizar): سەربڕین، کوشتنەوەی حەیوانات، ژێکرن.

**جــزار**- ا. ص. ع(جــەززار- cezzar): قەساو.

**جــزاز**- ا.ع(جــەزاز- cezaz): درەو، وەختی درەو، دروێنە.

**جزاف**- ص(جەزاف- cezaf): گەزاف، بێهودە، بەتاڵ، ناهەق.

**جزاف**- ص. ع(جیزاف- cizaf): گۆترە، کڕین و فرۆشتنی بە گۆترە، گۆترەکاری.

**جــزاف**- ص. ع(جــەززاف- cezzaf): راوچی، ماسیگر.

**جـزال**- ا.ع(جـیـزال- cizal): گـەورە، مەزن، زۆر، فراوان، قسەی پاراوو رەوان و سوار.

**جزالت**- مص. ع(جەزالەت- cezalet): گـەورەبوون، مکوم بوون، پاراوی و پتـەوی و رەوانی قسە.

**جـــزاندن**- مـص. م(جـــیـــزان دەن- cizan den): چزە لێ هەسـتـاندن، دڵ یەشاندنی کەسێک، رەنجاندن.

**جـزء**- ا. ع(جـوزء- cuz’): پاژ، بەش، پارچە.

**جـــزء لایتـــجـــزأ**- ا. مـــر.ع(جـــوزئی لایەتەجەززە- ciz’i layetecezze’): گەردیلە کە نایەتە دابەش بـوون، گەوهەری تاک.

**جـزئی**- ص. ن. ع(جـوزئی- cuz’î): کەم، هەندەک، هەندێک.

**جزئیه**- ص. ن.ع(جوزئییە- cuz’îye): لاوەکی.

**جــزد**- ا(جـــەزد- cezd): زیکزیکە، سیسرکی شەو.

**جزدر**- ا(جـیـزدەر- cizder): چزلیک، چزیلکە، جزیلک.

**جزر**- مص. ع(جەزر- cezr): سەربڕینی حەیوان، میوەکردنەوە لە دار.

**جــــزر**- مـص. ع(جـــــەزر- cezr): نیـشـتـنەوەی ئاوی دەریا، داکـشـانی ئاوی

دەریا.

**جزر**- ا. ع(جەزەر- cezr): گێزەر.

**جـــزع**- مص. ع(جـــەزەء- ceze’): نـاڵـەوزاری، بـێ تـاقـــــەتـی، پـەژارەو دڵتەنگی، شین و گرین.

**جـزع**- ا. ع(جـەزء- cez’): مـوروی یەمەنی، عەقیق.

**جزع**- ا. ع(جـیـزء- ciz’): گـوزەرگـەی دۆڵ.

**جـزغـال**- ا(جـیـزغـال- ziz¨xal): چزلیک، چزیلکە، چزیلە.

**جـزل**- ص. ع(جـەزل- cezl): گـەورە، خـەست، زۆر، فـراوان، قـسـەی سـوارو رەوان.

**جـزم**- مص. ع(جـەزم- cezm): بڕین، بنج بڕ، بێ دوو دڵی، نیشانەیەکە دەخرێتە سەر پیتی بێدەنگ.

**جزمازج**- ا(جەزمازەج- cezmazec): جۆرە روەکێکە.

**جزمـه**- ا.ع(جیـزمـە- cizme): یەک مێگەلی مەڕ، پاژێک لە شتێک.

**جـزو**- ا(جـوزڤ- cuzv): دەفـتـەری هەڵـســـەنگـانـدنـی بـاجـی نـاوچـەیـەکـی دیاریکراو.

**جزور**- ا. ع(جەزور- cezûr): دابەستە، وشتر یان مەڕ بۆ سەربڕین و کوشتنەوە.

**جـــزوع**- مص. ع(جـــوزوء- cuzû’): بێتاقەتی، دڵتەنگی، خەمباری، ناڵین و زاری و شین.

**جـزوع**- ص. ع(جـەزوء- cezû’): بێ تاقەت، خەمبار.

**جزوه**- ا(جوزڤە- cuzve): نامیلکە.

**جـــزوەدان**- ا.مـــر(جـــوزڤـــەدان- cuzvedan): فایل، کارتۆن.

**جزیره**- ا. ع(جەزیرە- cezîre): دوورگە، گراف، پارچە زەوی ناو دەریا کە هەر چوار دەوری ئاو بێ.

**جزیل**- ص. ع(جەزیل- cezîl): گەورە، مکوم، زۆر، فراوان، قسەی سوارو رەوان.

**جزیه**- ا.ع(جیـزیە- cizye): سـەرانە، ئەو پارەیەی کە جاران دەوڵەتانی ئیسلامی سـاڵانە لە هاووڵاتیـانی نا مـوسـوڵـمـانی ئەهلی کیتابیان دەسەند.

**جس**- مص. ع(جـــەس- ces): دەست پێداهێنانی شتێک.

**جـــســـاد**- ا.ع(جـــەســـاد- cesad): زەعفەران.

**جـــســـاد**- ا. ع(جـــوســـاد- cusad): ژانەسک، پێچ پێداهاتنی زگ.

**جسـار**- ص. ع(جوسسـار- cussar): دلێران، بوێران.

**جـــســـارت**- مص. ع(جـــەســـارەت- cesaret): دلـێـــــــری، ئـازایـەتـی، جەسارەت، زاتکردن.

**جساس**- ص.ع(جەسساس- cessas): جاسوس، جاسوسیکار، شۆفار، خەوەردز، هەواڵدز.

**جـــســـامـت**- مـص. ع(جـــەســـامـــەت- cesamet): ئەسـتـوربوون، تۆکـمـەبوون، قەبەبوون.

**جست**- ا. مص(جەست- cest): جوڵە، جـــوڵان، بەرزی، رزگـــاربوون، راکـــردن، راپەڕین.

**جـــســـت**- ا. مص(جـــوست- cust): گـــــەڕان، پشـکـنـین، پـرسـین، دۆزیـنـەوە، توێژینەوە.

**جستار**- ا.مص(جوستار- custar): باس، لێکۆڵینەوە، کۆششکار.
**جستان**- ص. فا(جەستان- cestan): بەجوڵە، بەرزی، رزگاربوو.
**جستجو**- ا. مص(جوست جو- custcû): بەشوێندا گەڕان، تاقیب، هەوڵدان، گەڕان، داواکردن، پرسین، پشکنین، جوست و جۆ.
**جستن**- مص. م(جوستەن- custen): تاقیبکردن، پشکنین، دۆزینەوە، پەیداکردن، داواکردن.
**جستن**- مص. ل(جەستەن- cesten): رزگاربوون، راکردن، هەڵاتن، راپەڕین، بازدان.
**جسد**- ا. ع(جەسەد- cesed): بەدەن، جەستە، لەش، جەنازە.
**جسد**- ا. ع(جەسەد- cesed): خوێن، خوێنی وشک، زەعفەران.
**جسر**- ا. ع(جیسر- cisr): پرد، کۆپری، پر، رێبازی سەرئاو.
**جسک**- ا(جەسک- cesk): مەینەت، رەنج، بەڵا، ئافەت، ئازار، ناخۆشی.
**جسم**- ا. ع(جیسم- cism): هەرشتێک بۆشاییەک پڕ بکاتەوەو کێشی هەبێ، تەن.
**جسمان**- ا. ع(جوسمان- cusman): جەستە، بەدەن، لەش.
**جسمانی**- ص. ن. ع(جیسمانی- cismanî): بەدەنی، مەتریالی، بەرانبەر بە روحانی.
**جسمی**- ص. ن.ع(جیسمی- cismî): جەستەیی، بەدەنی.
**جسمی**- ا(جەسمی- cesmî): پێکوڵ، پێکوڵە، جۆرە درکێکە.
**جسور**- ص. ع(جەسور- cesûr): جەسور، ئازا، دلێر، دلاوەر، بێباک.
**جسور**- ا.ع(جوسور- cusûr): پردان، پران.
**جسورانە**- ق. ص. ع(جەسورانە- cesûrane): جەسورانە، ئازایانە، دلێرانە، بوێرانە، بێباکانە.
**جسوم**- ا.ع(جوسوم- cusûm): کۆی جسمە، تەن، تەنان.
**جسید**- ا.ص. ع(جەسید- cesîd): خوێنی وشک.
**جسیم**- ص. ع(جەسیم- cesîm): گەورە، بەهەیکەل، کەتەو زەلام، بەداروبار.
**جش**- ا(جەش- ceş): کوژەکە، جۆرە مورورویەکی مۆرە بۆ چاوەزار بەکاردێت.
**جش**- ا. ع(جەشش- ceşş): چەقەن، رەقەن، زەوی تمتم، زەوی بەردەڵان..
**جشاء**- ا. ع(جوشاء- cuşa’): قرپ، قرقێنە، شەپۆل، شەپۆلی دەریا.
**جشان**- ا(جەشان- ceşan): گەز.
**جشمیزج**- ا(جەشمیزەج-ceşmîzec): جۆرە رووەکێکە لۆ چاویەشە بەکاردێ.
**جشن**- ا(جەشن- ceşn): شادی، خۆشی، جەژن، سور، ئاهەنگ.
**جشن**- ا(جەشەن- ceşen): تا، بەرزبوونەوەی حەرارەتی بەدەن و خێرابوونی لێدانی دڵ.
**جشنوارە**- ا. مر(جەشنڤارە- ceşnvare): فستیڤال، میهرەجان.
**جشە**- ا. ع(جوششە- cuşşe): کۆمەڵە خەڵکێک کە پێکەوە بێن.

**جشه**- ا (جوشـشـه- cuşşe): قـۆڵی کراس، قۆڵی عەبا.

**جشه**- ا(جەشـشـه- ceşşe): پەیمانەی رۆن.

**جشیر**- ا(جـەشیـر- ceşîr): پەلولە، ئاردەوا.

**جشیر**- ا. ص(جەشیر- ceşîr): جۆلا، جاڵجاڵۆکە، داپیرۆشک.

**جشیر**- ا.ع(جەشیر- ceşîr): تیـردان، هەنبانە، جەواڵی ئەستور.

**جشـیش**- ا.ع(جـەشـیش- ceşîş): ساوەر، ساوار.

**جشـیم**- ص. ع(جـەشـیم- ceşîm): درشت، غەلیز، مکوم، قایم، سەنگین.

**جص**- ا. ع(جەس- cess): گەچ.

**جـصـاص**- ا. ص. ع(جـەسـسـاس- cessas): گەچکار، گەچ فرۆش.

**جعاب**- ا. ع(جیئاب- ci'ab): جانتا، باوڵ، ساک، پاکەت، تیـردان، سـەندوقی بچووک.

**جعـابیب**- ا.ع(جەئابیب- ce'abîb): پیاوی کوڵەباڵای خوێری و ناشیرین.

**جعاد**- ا.ع(جیـئـاد- ci'ad): بەخیل، لەگام، رژد، چروک، دەست قوچاو، رەزیل.

**جعاشیش**- ا. ع(جەئاشیش-ce'aşîş): گەدا، خوێری، پیـاوی باریکەڵەی دەموچاو ناشیرین.

**جعال**- ا. ع(جیئال- cial): کرێ، کرێی کرێکار، ئەو کرێیـەی لە کاتی جەنگدا بە سەربازو لەشکریان دەدرێ.

**جعال**- ا.ع(جیئال- ce''al): دەست بڕ، درۆسـاز، درۆپەروەر، تەزویرچی، درۆزن، ساختەچی.

**جـعـاله**- ا. ع(جـیـئـاله- ciale): هەقدەست، موزد، کرێی کرێکار.

**جعبوب**- ص. ع(جوئبوب- cu'bûb): کوڵەبنەی خوێری و ناشیرین.

**جعبه**- ا. ع(جەئبە- ce'be): تیـردان، جـانتـا، باوڵ، سـەندوقی بچـووک، ئامێرێکی مۆسیقایە.

**جعد**- ص. ع(جەئد- ce'd): لوول، قژی لوول، پێچەوانەی خاو، گرژ.

**جـعـد**- ص. ع(جـەئد- ce'd): رژد، چروک، دەست قـوچاو، بەغـیل و رەزیل.

**جـعـده**- ا. ع(جـەئدە- ce'de): بەرخەمێ، گیایەکی بۆن خۆشە لە کەناری روباران دەڕوێ.

**جعشوش**- ص. ع(جوئشوش-cu'şûş): گـەدا، خـوێری، پیـاوی درێژی دەم و چاو ناشیرین.

**جعفر**- ا.ع(جەئفەر- ce'fer): رووبار، رۆخانە، وشتری بەشیر.

**جـعـفـری**- ص. ن . ع(جـەئفـەری- ce'ferî): جـافـەری، پەیڕەوانی ئیـمـام جـافـەری سـادق کـە ئیـمـامی شـەشـەمی شـیـعـەیەو ئەم مـەزەبە لە سـەردەمی سەفەوییەکانەوە برەوی سەندو تا ئێستا مەزەبی رەسمی ئێرانە.

**جعفری**- ا(جەئفەری- ce'ferî): جۆرە رووەکێکە، زەعفەران.

**جـعـل**- مص. ع(جـەئل- ce'l): دروسـتکردن، خـوڵقـاندن، داهێنان، تەزویرکردن.

**جعل**- ا.ع(جوئەل- cu'el): قالۆنچە، گوخلێنە.

**جـعل**- ا .ع(جـوئـل- cu’l): کـرێـی کرێکار، هەقدەست.
**جعیله**- ا.ع(جەئیله- ce’île): کرێ.
**جغ**- ا(جوغ- cu¨x): ئەبەنوس، تەختەی رەشی ئەبەنوس ئاسا کە تەخت و کورسی لێ دروست بکرێ.
**جغ**- ا(جوغ- cux): نیر.
**جغجغه**- ا(جیغجیغە- cixcixe): شەقشەقە، جۆرە روەکێکە، خڕخاشە.
**جـغـد**- ا(جـوغـد- cuxd): کـونەپەپو، کوند، کوندەبۆ.
**جغرات**- ا(جوغرات- cuxrat): تۆراخ، ماستی ئاولێگیراو.
**جغرافی**- ا. فر(جوغرافی- cuxrafî): جـوگـرافـیـا، زانسـتـێکە لە بارودۆخی سـروشـتی و سـیـاسی ولاتان و چۆنیـەتی ژیانی مـیللەتان و بوونەوەرانی سەر زەوی دەکـۆڵێـتـەوەو چەند بەشـێکی هەیە: جوگرافیای سروشتی، سیاسی، ئابووری، مرۆڤانی.
**جـغـزواره**- ا. مـر(جـەغـزڤـارە- cexzvare): قەوزە، کڤز، جلە شینەی سەر ئاو.
**جـغش**- ا(جـەغـەش- cexeş): جـۆرە رووەکێکە.
**جغله**- ا. ص(جـغله- cxle): کـۆسـە، پیاوی کولەبنەی وردیلە.
**جغنه**- ا(جـغنە- cixne): باڵندەیەکی کێوییە.
**جـغـور**- ا(جـەغـور- cexûr): جگەری سوورەوەکراو بە پیازەوە، قەلی پیفاز.
**جغه**- ا(جیـغـغە- cixxe): تاج، هەر شتێکی تاج ئاسا کە لە کلاوی بنەن.

**جف**- ا. ع(جـەفف- ceff): کـۆمـەڵە خەڵکێک، ژمارەیەکی زۆر، جماعەت.
**جف**- ا.ص. ع(جـوفف- cuff): پیـری کـەنەفت، شـتی ناو بەتاڵ (وەکـو نەی)، قاوغ، قاوغی شکۆفەی خورما.
**جـفـاء**- ا. ع(جـوفـاء- cufa’): ئاومـاڵکە، شـتی بێ کـەڵک، غـەش، بێهودە.
**جفاء**- مص. ع((جەفاء- cefa’): زوڵم کردن، ستەم کردن، ئازاردان، بێ ئەمەکی کردن، دوور کەوتنەوە لە کەسێک.
**جفاپیشه**- ص. مر.ع(جەفاپیشە- cefapîşe): ستەمکار، زۆردار، دۆست و ماشوقی نا میهرەبان، زاڵم.
**جـفـات**- ص. ع(جـوفـات- cufat): نەگونجاو، بەدخوو، بەدڕەفتار، ستەمکار.
**جفاجف**- ا.ع(جەفاجیف- cefacif): شێوەو جل و بەرگ، قەدو قەلافەت، قەدو بالا.
**جفاخ**- ص. ع(جەففاخ- ceffax): لووت بەرز، بەدەعیە، لاف لێدەر، لافوگەزاف لێدەر، خۆ هەڵکێش، فڕناخ.
**جفار**- ا. ع(جیفار- cifar): جفرەزان.
**جـفـاف**- مص. ع(جـەفـاف- cefaf): وشک بوون.
**جـفـاف**- ا. ع(جـوفـاف- cufaf): وشـکـەوەبـوگ، وشـکـەوە بـووی نـاو ئـەو شتانەی بۆ وشک بوونەوە هەڵخرابێ.
**جفال**- ا. ع(جـوفـال- cufal): کـەفی شـیـر، خـوری زۆروپڕ، ئاو مـاڵک، ئاومالکە.
**جفاله**- ا. ع(جوفاله- cufale): کەفی شیـر، ئەو کـەفـەی بە کـەوگـیـر لەسـەری

مـەنجـەڵ دەگــیـرێت، جــمـاعــەتێک، دەستەیەک.

**جفان**- ا. ع(جیفان- cifan): رەگ یان لقی مـێـو، کـاسـەی گـەورە، بیـر یـان چاڵی بچووک.

**جــفت**- ا(جــوفت- cuft): جــووت، پێچەوانەی تاک، ژن و مێرد، نێرەو مێیەی حەیوان.

**جفت**- ا(جوفت- cuft): هاوەڵ منداڵ، (پلاسنتا)، وێڵداش منداڵ.

**جـفت افـرید**- ا. مـر(جـوفت ئافـەرید- cuft aferîd): جـــۆرە رووەکـــێـکە، بە عـەرەبی (خصیه الثعلب- گونی رێوی)ی پێ دەگوترێ.

**جفتک**- ا(جوفتەک- cuftek): لەقە، جووتەی حەیوانی بەرزە، لوشکە.

**جفتک**- ا(جوفتەک- cuftek): بازدانی جـووتەپایی، جـۆرە بازدانێکە هەردوو پێ جووت دەکرێ و ئەوجا باز دەدرێ.

**جـفـتک چهـارکش**- ا. مـر(جـوفـتــەک چەهارکـــوش- ceftek çeharkuş): جۆرە وەرزشێکە، یەکێک دادەنوێ و دەست دەخاتە سەر ئەژنۆی و یەکێک بەسەریا باز دەدات.

**جـفت گـیـری**- ا. مص(جـوفت گـیـری- cuft gîrî): جـووت بوون، جـووتبـوونی نێرومێی حەیوان.

**جـفـتـه**- ا(جـوفـتـە- cufte): لوشکە، کەفەڵ، گرێی پەت.

**جـفـتـه**- ص(جـەفـتـە- cefte): کـەچ، خوار، چەوت، چەماوە، چەفت.

**جـفـجـاف**- ص(جەفـجـاف- cefcaf): قەحپە، فاحیشە، داوێن تەڕ، سوزانی.

**جـفـجف**- ا. ع(جـەفـجـەف- cefcef): دەشت، تەختانی، بای توند.

**جفجفه**- ا. ع(جەفجەفە- cefcefe): دەنگی هێواشی جلی نوێ.

**جـفـر**- ا. ع(جـەفـر- cefr): زانسـتی حەرفان، جفرەزانی، ئایندەزانی.

**جفرسته**- ا(جەفەرەستە- cefereste): مـاسـولکەی جـۆلایی، مـاسـۆڵـە، گـلـۆڵەی فرێت، ماسور.

**جفن**- ا.ع(جەفن- cefn): پێڵـوی چاو، کێلانی شمشێر.

**جفنات**- ا. ع(جـەفـەنات- cefenat): رەگ یان لقی مێو، کـاسەی گەورە، بیری بچووک.

**جـفـنگ**- ص(جـەفـەنگ- cefeng): جەفەنگ، قسەی قۆڕ، گاڵتەو سوعبەت، هەرزەوێژی، حەنەک.

**جفنه**- ا.ع(جەفنە- cefne): رەگ یان لقی مـێـو، کاسـەی گەورە، کوپەی گەورە، گۆزەی گەورە.

**جفون**- ا. ع(جوفون- cufûn): پێڵوان.

**جفیر**- ا. ع(جەفیر- cefîr): تیردان.

**جک**- ا(جــەک- cek): دارێکە کـە دۆ یان ماستی پێدەشڵەقێنن.

**جک**- ا(جـەک- cek): شـەوی بەرات، شەوی پازدەی شەعبان.

**جک**- ا. انـگـل(جـــــــــەک- cek): جەک، ئامێرێکە بۆ بەرزکردنەوەو راگرتنی شـتـی قـورسی وەکـو ترومـبـێـل بەکـار دەهێنرێ.

**جکاشـه**- ا(جـەکـاشــە - cekaşe): سیـخـور، سیـخـچـولە، جۆرە ژیشکێکی گەورەیە، سوچەڕ.

**جگاره**- ا(جەگارە- cegare): میتۆدی جیاواز، راوبۆچوونی جۆراوجۆر.
**جگر**- ا(جـــیگـەر- ciger): جــەرگ، جگەر.
**جگر اگند**- ا. مــر(جــیگـەر ئاگــەند- ciger agend): باسترمە، باستورمە، جگەری لە ریخۆڵە ئاخنراوی لێنراو.
**جگراور**- ص. فـــا(جـــیگـەر ئاڤـــەر- ciger aver): بـە جـــــەرگ، دلاوەر، چاونەترس، بێباک، ئازا.
**جگربند**- ا. مــــر(جـــــیگـەر بەند- ciger bend): جــەرگ و ناو، منداڵ، فەرزەن، جگەرگۆشە.
**جگرخـــای**- ص. فـــا(جـــیگەرخـــای- cigerxay): خەمخۆر، کەسێک کە خەم زۆر بخوات.
**جگرخـراش**- ص.فـا(جـیگەر خـەراش- ciger xeraş): خـەمـهـێن، دڵـتـەزێن، جەرگبڕ.
**جگرخسـتـه**- ص مر(جـیگەر خـەسـتـە- ciger xeste): دڵبرین، خەمگین.
**جگرخـــوار**- ص. فـــا(جـــیگەرخـــار- ciger xar): ســـەبرو تەحـــەمـــول، غـەمـخـۆر، یاری دڵسـۆزو غـەمـخـۆر، رەنجکێش، مەینەتپەرست.
**جگرداشتن**- مص. ع(جـیگەرداشـتـەن- ciger daşten): بـەجـــــەرگ بـوون، ئازایەتی.
**جگردار**- ص(جـیگەردار- cigerdar): دلێر، دلاوەر، ئازا، بێباک.
**جگرســـوز**- ص. فـــا(جـــیگـەرســـوز- cigersûz): جگـەرســـوتێـن، ئەوەی مایەی خەم و خەفەتی زۆربێ.

**جگرک**- ا(جـــیگـەرەک- cigerek): جـــەرگـــۆکـــە، جگەری لە رۆن و پیـــازا سوورەوەکراو، قەلی پیفاز.
**جگرکی**- ص(جیگەرەکی- cigerekî): جگەرچی.
**جگرگـــاه**- ا. مـــر(جـــیگـەرگـــاه- cigergah): شـــوێـنی جگـەر لـە ناو سکدا، جگەرگە.
**جگرگـوشـه**- ا.مـر(جـیگەرگـوشـە- cigergûşe): پـارچـەیـەک لـە جـگـەر، گـۆشـەیەک لە جگەر، فـەرزەن، ئەولادی ئازیز.
**جگرگون**- ص(جیگەرگون-cigergûn): جەرگی، سوری تۆخ.
**جگرنه**- ا(جـــــیگـەرنە- cigerne): کـاروانە، باڵندەیەکـە بە قــەد مـامـرێ دەنووکی درێژە.
**جگن**- ا(جــەگــەن- cegen): پوش و پەڵاش، هەژگ، جەگەن، گیـایەکە لاسکی سێ سوچە لە زەلکاودا دەڕوێ.
**جل**- ا(جەل-cel): کەرەواڵە، کلاوکوڕە.
**جل**- ا.ع(جـول- cul): پاڵان، کـورتان، کۆپان، جل، پۆشاک.
**جل**- ا. ع(جولله- culle): زۆربە.
**جـل**- ع(جـــــــــەلـلـە- celle): گەورەیە، هەمیشە لەگەڵ ناوی خودادا دێ وەک (جَلّ الخــالق) گــەورەیە خــالیق، گەورەیە خوا.
**جـــلاء**- مص. ع(جـــەلاء- cela’): دوورکـەوتنەوە لە مـاڵ و وڵات، کـۆچکردن لە وڵات، روونکردنەوە، جـەلایی کـردن، مـــشت و مـــاڵکردن، لابردنی ژەنگی شمشێرو....

**جـلاء**- ا. ع(جـيــلاء- cila’): كل، سورمه.

**جلائل**- ا. ع(جەلائيل- cela’îl): ژنی گران قـەدر، وشتریّ کـە لەیەک سک پتـر نەزابیّ.

**جـلاب**- ص. ع(جـەللاب- cellab): سەرنجڕاکێش، جەڵەبچی کۆیلان، کەسێک کـە کـۆیلە لە شـارێکەوە بۆ شـارێک بۆ فرۆشتن بەریّ.

**جلاب**- ا.ع(جوللاب- cullab): گولاو، ئاوی گولّ.

**جلابيب**- ا. ع(جەلابیب- celabîb): عەبای ژنان، جبە، جلی دەڵب و فەریح.

**جلاجل**- ا. ع(جـەلاجـیل- celacil): دەف و دایـەرەی زەنـگـوڵـەدار، زەنـگـوڵـە، بەرۆکی ئەسپ یان وشـتـر کـە زەنگۆڵەی پێوە دورابێ.

**جـلاد**- ا.ع(جــیــلاد- cilad): یەخ، سەهۆڵ، جەمەد.

**جــلاد**- ص. ع(جــەللاد- cellad): بکوژی مەحکومان، پیاوکوژ، میرغەزەب، ئەشکەنجەچی بەندییان.

**جلادت**- مص. ع(جەلادەت-celadet): بەهێــزبوون، چاپوک بوون، رەشـیــدی، چاپوکی، بەهێزی، جوامێری، قارەمانی.

**جــلاس**- ا. ع(جــوللاس- cullas): دانیشتووان.

**جلافت**- مص. ع(جەلافەت- celafet): بیّ مـێـشـک، سـوکی، کـەودەنی، درشت رەفتاربوون، ناو بەتاڵ بوون.

**جـلال**- ا. مص. ع(جــەلال- celal): گـەورەیی، عــیــزەت و شکۆ، پیــربوون، بەقەدربوون.

**جلالت**- مص. ع(جەلالەت- celalet): گەورەبوون، مەزنایەتی.

**جــلاله**- ص. ع(جــەلالە- celale): حەیوانی حەلاڵ گۆشت کە سەرگین بخوا، مانگای سەرگین خۆر.

**جــلالی**- ص. ن(جــەلالی- celalî): تـاریخی جــەلالی کــە دەدرێتــە پاڵ جەلالەدینی مـەلەکـشـای سەلجـوقی، جـا مـێـژووی جـەلالی بە ئەمـری ئەو پاشـایە لـەلایـەن ژمـــــارەیـەک لـە زانـایـانـی ئەستێرەناسییەوە کە یەکێکیان عومەری خەیام بووە، ئامادەکراوە.

**جلامید**- ا. ع(جەلامید- celamîd): بەرد، تاوێر، گاکەڤر.

**جلاوزه**- ا.ع(جـەلاویزە- celawize): پاسـەوان، خـزمـەتکار، نۆکـەر، خـولام، رەشەک.

**جـلاهق**- ا. ع(جـەلاهیخ- celahîx): گـلاهەک، جۆرە کـەوانێکە کـە گـزمـوڵەی بەردین یان گـلـینی پیّ هاوێژراوە بۆ راوە باڵندە.

**جـلـب**- ا(جـــــــــەلـەب- celeb): هەراوهەنگامـە، فـیـتنەو ئاژاوە، هات و هاوار.

**جلب**- ص(جــــەلـەب- celeb): ژنی بەدکار، فێڵباز، بەدخوو، خوێری.

**جلب**- ا(جەلەب- celeb): ژالاب، جۆرە رووەکێکە لە تیرەی نیلۆفەر.

**جلب**- مـص. ع(جـــــەلب- celb): راکێشان، بردن، رفاندن، رفاندنی دڵان.

**جلب**- ا.ع(جەلەب- celeb): جەڵەب، ئەوەی لە شـوێنێکەوە بۆ شـوێنێکی دی بۆ فرۆشتن ببریّ وەکو ئەسپ و حەیوان و....

**جلبـــاء**- ا.ع(جـــولبـــا ء- culba’): جەڵەب، جەڵەبان.
**جلبــاب**- ا.ع(جــيلبــاب- cilbab): عــەبای ژنان، گــەلەبی، جلی دەڵبی ســەر جلان، جبە.
**جلبان**- ا. ع(جولبان – culban: جۆرە رووەکێکە، خلێرە، پۆڵکە، گاگۆز.
**جلبک**- ا(جـــــولبـــــەک- culbek): جەلاوی، قەوزەی سەراوان، کڤز.
**جلبـوب**- ا(جـەلبـوب- celûb): جـۆرە لاولاوێکی خۆهەڵواسە.
**جلبـــــهـنـگ**- ا(جـــــەلبـــــەهەنگ- celbeheng): زەردە درک، دروی زەرد، دروە زەردە.
**جلبـيـز**- ا. ص(جـەلبـيـز- celbîz)" کەمەند، هەڵبژاردە، گەندەڵکاری.
**جلجل**- ا.ع(جـــولجـــول- culcul): زەنگوڵە، دەف و دایەرە، زەنگ، مـەلێکی خۆش ئاوازە.
**جلجـــــلان**- ا. ع(جــــول جــــولان- culculan): گژنیژ، گژنێژ.
**جلد**- ص. ع(جـــەلد- celd): چالاک، چاپوک، زرنگ، پاڵەوان.
**جلد**- ا. ع(جـــيلد- cild): پێـــست ، بەرگی کتێبان، پووسە.
**جلـد**- مـص. ع( جـــــــەلد- celd): جەڵدەلێدان، شەلاق لێدان، قامچی لێدان.
**جلداء**- ا.ع(جولەداء- culeda’): یەخ، سەهۆڵ، جەمەد.
**جلز**- ا(جـيليـز- ciliz): چزەچز، دەنگی ســوورببوونەوەی گــۆشت یان شــتی دی لە رۆندا.
**جلسـاء**- ا. ع(جـولەسـاء- culesa’): هاونشینان.
**جلســـــه**- ا.ع(جـــەلســـــە- celse): کۆبوونەوە، یەک دانیشتن.
**جلعاء**- ص. ع(جەلئاء- cel’a’): ژنی ددان زەق، ژنێـک کـە هەمـيـشـە ددانی بە دەرەوە بی و لێوی نەیەتەوە یەک.
**جلغوزه**- ا(جەلغوزە- celxûze): داری سنۆبەر، بەری داری سنۆبەر.
**جلف**- ص. ع(جـيلف- cilf): ســوک و سەلیم، خوێری، کەودەن، گەوج، خۆسەر، ستەمکار.
**جلـق**- مـص. ع(جـــــــەلغ- celx): سەرتاشین، قژبڕین.
**جلق**- ا(جـەلغ- celx): دەســتــپـــەڕ، دەســـپــــەڕ، خـــۆ رەحـــەتکردن بەدەست، دەستگان.
**جلک**- ا(جەلەک- celek): کەڕەواڵە.
**جلگه**- ا(جـــولگە- culge): دەشــتـی هەموارو تەختانی، چۆڵگە، بان (هضبة).
**جلل**- ا.ع(جـــەلەل- celel): کـــاری گەورە.
**جلم**- ا(جـــــەلەم- celem): جـــــۆرە درەخـــتـێـکی کـێـوییــە، بۆ قــورگ یەشـە گەڵاکەی دەکوڵێنن و بە ئاوەکەی غـەرغـەرە دەکرێت.
**جلمد**- ا. ع(جەلمەد- celmed): تاوێر، بەردی گــەورە، بەردی ســـەخت، پیـــاوی تۆکمەو بەهێز، گاکەڤر.
**جلمود**- ا.ع(جولمود- culmûd): تاوێر، بەردی گــەورە، بەردی ســـەخت، پیـــاوی تۆکمەو بەهێز، گاکەڤر، بەرەت.
**جلنار**- ا. ع(جــوللەنار- cullenar): گوڵی هەنار، گوڵنار.

**جلنبـر**- ص(جـولەنبـەر- culenber): شرپۆش، شروشەپریو، کەسێک کە بەرگی جل ئاسای لەبەر بێ، سیپالپۆش.

**جلنبە**- ا(جـولەنبـونە- culenbûne): گەلاوکوتک.

**جلنجـــبین**- ا. ع(جـــولەنجـــەبین- culencebîn): گـوڵ هەنگوین، پەرەی گـــوڵ و هـەنگوین تێکەڵ دەکـــرێ و دەکـولێنرێن و مـاجـومـێکی لێ دروست دەکەن پێی دەڵێن گوڵەنگوین.

**جلنگ**- ا(جـیلینگ- ciling): جـۆرە قوماشێکی ئاوریشمی ئەستوورە، جاران عەباو پانتۆڵ و کلاویان لێ دروست دەکرد.

**جلنگ**- ا(جـیلینگ- ciling): برک، برکی کـاڵک و شـوتی و کـولەکـەو ئەو شتانە، بنجی بێستان.

**جلو**- ا(جـــیلەو- cilew): پێش، پێشرەو، رەشمەو هەوساری ئەسپ، جڵەو.

**جلواد**- ا(جەلڤاد- celvad): خوی بەد، تەبیعەتی بەد.

**جلواز**- ا. ع(جـــیلڤـــاز- cilvaz): پاسەوان، خولام، خزمەتکار، نۆکەر.

**جلوه**- مص. ع(جـــەلڤـــە- celve): ئاشکرا کردن، دیارخستن.

**جلوخـــان**- ا. مـــر(جـــیلەوخـــان- cilewxan): پێـشی مـاڵ، مـەیدانی بەردەم ماڵ و ساختمان.

**جلود**- ا.ع(جـولود- culûd): پێـست، کەوڵ، پووسە.

**جلودار**- ا. ص(جیلەودار-cilewdar): جەڵەودار، هەوسارکێش، پێشرەو، نۆکەرێ کە پیادە یان سوارە جڵەوی ئەسپی ئاغای خۆی راکێشێ.

**جل و زغ**- ا. مـــر(جـــول فـــەزەغ- cul vezex): جـــەلاوی، قـــەوزەی سەراوان، کڤز.

**جلوزه**- ا(جـەلوزە- celuze): بەری دار سنۆبەر.

**جلوس**- مص. ع(جـــولوس- culûs): دانیشتن، رۆنیشتن.

**جلوف**- ص. ع(جولوف- culûf): سوک و سـەلیم، خـوێری و بەرەڵلا، کـەودەن و گەوج، خۆسەر، ستەمکار.

**جلوگـیـر**- ص. فـا(جـیلەوگـیـر- cilewgîr): کـۆسـپی سـەر رێگە، پێشگیر.

**جلوند**- ا(جەلڤەند- celvend): چرا.

**جلونک**- ا(جـــەلونەک- celûnek): برکی کالەک و شوتی و ئەو شتانە، بنجی بێستان.

**جلوه**- مص. ع(جـەلڤـە، جـیلڤـە- celve, cilve): جیلوە، خۆ نیشاندان، ئاشکراکـــردن، دیاری زاوا بـۆ بووک لە شەوی زەماوەندا، پرشنگی نوری خوایی لە دڵی عارفدا.

**جلوه**- ا.ع(جـەلڤـە، جـیلڤـە- celve, cilve): دیاری زاوا بـۆ بـووک لە کاتی زەماوەندا.

**جلوەکنان**- ص. ق(جـەلڤـەکـونان- celvekunan): ئـاشـکـراو دیـارو درەخشان.

**جلوەگـر**- ص. فـا(جـەلڤـەگـەر- celveger): ئاشکراو دیارو درەخشان.

**جلویز**- ا(جەلڤیـز- celvîz): کەمـەند، کـــەمـــەن، پەتی درێژ، هەڵبـــژاردە، گەندەڵکاری.

**جله**- ا(جــولله- culle): ســەبەتە، زەمـیلەی گـەورەی لە حـەسـیـر، پشـقل، کولەکەی ناو بەتاڵ.

**جله**- ا(جــولله- culle): گــلاهەک، گلۆڵە، جۆرە روەکێکە.

**جلی**- ص . ع(جــەلی- celî): روون، ئاشکرا، مشتو ماڵدراو، پەرداخت کراو.

**جلیب**- ص.ع(جــەلیـب- celîb): جەڵەب.

**جلیتغه**- ا(جلیتغە- cilîtxe): ئێلەک.

**جلید**- ص. ع(جەلید- celîd): بەهێز، چالاک، زیرەک و بە هۆش، توندو تۆڵ.

**جلید**- ا.ع(جەلید- celîd): سەهۆڵ، جەمەد، شەونم، ئاونگ، خوناڤ.

**جلیدیه**- ا. ع(جەلیدییە- celîdîye): عەدەسەی چاو، گلێنەی چاو.

**جلیز**- ا(جـەلیـز- celîz): کـەمـەن، گەندەڵکار.

**جلیس**- ص. ع(جــەلیس- celîs): هاونشین، هاودەم.

**جلیف**- ص. ع(جــەلیف- celîf): درشتخو، زاڵم، خوێڕی، گەوج، کەودەن.

**جلیفه**- ا.ع(جەلیفە- celîfe): ساڵی نەهات و قات و قڕی.

**جلیل**- ص. ع(جەلیل- celîl): ڕێزدار، گرانقەدر، بەتەمەن، گەورە، مەزن.

**جلیل**- ا. ع(جـولەیل- culeyl): جلی ولاخان، پەردەی سەر کەژاوە.

**جلیله**- ص. ع(جەلیلە- celîle): ژنی ڕێزدار، ژنی گرانقەدر، ژنی هێژا، وشترێک کە لە یەک سک پتر نەزابێ.

**جلیه**- ص. ع(جـەلیـیـە- celîye): هەواڵی دروست، حـەقـیـقـەت، ئاشکرا، دیار.

**جم**- ا(جـەم- cem): سـوکـەڵەی ناوی جەمشـیـدە کە بە گـوێرەی شـانامـە چوارەم پاشای پێشدادییەکان بووە، پاشای گەورەو پایەبەرز.

**جم**- ا.ع(جـــەمم- cemm): زۆر، فراوان، جەماوەرێکی زۆر.

**جماء**- ا. ص. ع(جەمما ء- cemma’): ژنی قــەڵەوی گــۆشتن، زەوی تەخت و هەموار، دەشت.

**جمائع**- ا. ع(جەمایع- cemaî’): هەر هەمووان، خڕگشتیان.

**جماجم**- ا. ع(جەماجیم- cemacim): کاسەسەران، کەپۆلان، کلۆخێن.

**جماح**- مص. ع(جیماه- cimah): خۆ سەری کردن، سەرکێشی کردنی ئەسپ.

**جماد**- ا. ع(جـەمـاد- cemad): بێ گیان وەکو بەرد.

**جمادی**- ا.ع(جـومـادا- cumda): مـانگی پێنجـەم وشـەشـەمی سـاڵی کـۆچی مانگی.

**جمار**- ا.ع(جیمار- cimar): وردەبەرد، چەو، پشکۆ، سکڵ، زیخ.

**جمار**- ا.ع(جـەمـار- cemar): جماعەت، کۆمەڵە خەڵکێک لە شوێنێکدا خڕ ببنەوە.

**جمار**- ا.ع(جـومار- cummar): شتێکی سپییە لەناوی سکی نەمامی دار خورما پەیدا دەبێ و تامی شیر دەدات..

**جماز**- ص. ع(جـەمماز- cemmaz): تیژڕەو، خۆشبەز، وشتری خۆشبەز، بلەز.

**جمازه**- ص. ع(جەممازە- cemmaze): تیژڕەو، بلەز، خۆشبەز، وشتری بەدەو.

**جماش**- ص(جەمماش- cemmaş): دڵڕفێن، مەست، غەزەلخوان.
**جماع**- مص.ع(جیماء- cima’): جووت بوونی ژن و پیاو، گان، رازان.
**جماعت**- ا.ع(جەمائەت- cema’et): جڤات، کۆمەڵە خەڵکێک.
**جمال**- مص. ع(جەمال- cemal): جوان بوون، جوانی، شۆخوشەنگی، خوشیکی، قەشەنگی.
**جمال**- ا.ع(جیمال- cimal): وشتران.
**جمال**- ص. ع(جەممال- cemmal): وشترەوان، وشتردار.
**جمام**- ا.ع(جیمام- cimam): زۆر، ئاپۆرە، هەیشەت.
**جمام**- ا. ع(جەمام- cemam): ئیسراحەتی ئەسپ پاش ماندوو بوون، ئەسپی ئیسراحەت کە سواری نەبن.
**جمان**- ا(جومان- cuman): جۆرە رووەکێکە.
**جمان**- ا.ع(جومان- cuman): مرواری، مراری، لولو.
**جماهیر**- ا. ع(جەماهیر- cemahîr): جەماوەر، کۆمەڵانی خەڵک، ئاپۆرە.
**جمایع**- ا.ع(جەمایئ- cemayi’): جەماوەری خەڵک.
**جمبوری**- ا. انگل(جەمبوری- cembûrî): کۆبوونەوەی سەرانی یەک وڵات لە شوێنێکدا، کۆنگرە، کۆنگرەی پێشەوایان و سەرانی چەند وڵاتێک لەیەک شوێندا.
**جمجم**- ا(جومجوم- cumcum): گیوە، کڵاش، کڵاشی بن چەرم.
**جمجمه**- ا. ع(جوم جومە- cumcume): کەللەسەر، کاسەسەر، کاژەڵە، قاپێلکەسەر، کەپۆڵ، کلۆخ.
**جمد**- ا. ع(جەمەد- cemed): بەفر، سەهۆڵ، بەرف، جەمەد، وەفر، یەخ.
**جمرات**- ا.ع(جەمەرات- cemerat): پشکۆیان، سکڵان، پەنگران.
**جمره**- ا.ع(جەمرە- cemre): سکڵ، پۆلو، پەڕەنگ، پەنگر، پشکۆ.
**جمری**- ص(جەمری- cemrî): چەورە، سپلە، خوێڕی، گەداو ناکەس بەچە.
**جمزیور**- ا.ص(جەمزیڤەر- cemzîver): ئەسپی تەوێڵ ماڕۆی چوار پەل و بن سک سپی.
**جمست**- ا(جەمەست- cemest): جۆرە یاقوتێکی هەرزان بەهایە، رەنگی شینی مەیلەو سوور یان زەرد یان سپییە.
**جمشاک**- ا(جەمشاک- cemşak): کەوش، پێڵاو.
**جمع**- مص. ع(جەمء- cem’): کۆکردنەوە، جەماعەت، کومەڵ، دەستە.
**جمعه**- ا.ع(جومئە- cum’e): هەینی، حەوتەم رۆژی هەفتە.
**جمعه الصلبوت**- ا. مر(جومئەتوس سەلبوت-cum’etusselbûst): رۆژی لە خاچدانی حەزرەتی عیسایە کە بە رێکەوتی رۆژی هەینیان زانیوە.
**جمعیت**- مص. ع(جەمئییەت- cem’îyet): خەڵکی شارێک یان وڵاتێک، خڕبوونەوەو کۆبوونەوە.
**جمل**- ا.ع(جومەل- cumel): هەموو، گشت.
**جمل**- ا. ع(جەمەل- cemel): وشتر.
**جمل**- ا.ع(جومل- cuml): کندر،

حەبل.
**جـمـل**- ا.ع(جـوم مــەل- cummel): كندڕی ئەسـتور، حەبلی کەشتی، حەساوی پیتێن ئەبجەد.
**جمله**- ا.ع(جوملە- cumle): هەموو، هەمووان سەرانسەر، رستە.
**جـمند**- ص(جـەمــەند- cemend): تەمەڵ، بێکارە، ئەسپی تەمەڵ.
**جمنده**- ا. فا(جومەندە- cumende): بزواو، جماو، چوارپێ.
**جـمـوح**- مص. ع(جـومـوه- cumûh): سـەرکـێـشی کـردن، خـۆ سـەری کـردن، سەرکێشی کردنی ئەسپ.
**جـمـوح**- ص. ع(جـەمـوه- cemûh): پیـــاوی ســـەرکـــێش، پێـــاوێ نەتوانێ دەسـتـبـەرداری هەواو هەوەسی خـۆی بێ، ئەسپی سڵ و رەوەک.
**جـمـود**- مص. ع(جـومـود- cumûd): بەستن، سەهۆڵ بەستن، ژاکان.
**جموس**- مص. ع(جوموس- cumûs): بەستن و مەیینی رۆن و پیوو چەوری.
**جـمـوش**- ا. ع(جـەمـوش- cemûş): دارڕو، نورە، دەرمان حەمام.
**جــمــوع**- ا.ع(جــومــوء- cumû’): جماعەتان، دەستەو گروپان.
**جـموم**- مص. ع(جـومـوم- cumûm): زۆربوونـی شــتــێک، کــۆبوونەوەی ئـاو لە شوێنێ، قەڵەو بوون.
**جـموم**- ا. ص(جـەمـوم- cemûm): پڕ ئاو، بیری ئاودار.
**جموم**- ا. ع(جوموم- cumûm): زۆر، فراوان، جەماوەری خەڵک.
**جـمـه**- ا.ع(جـەمە- cemme): زۆربە، بیری پڕئاو، جمە (شار لە خەڵکدا جمەی دێ).
**جــــمـــــهــــــره**- مص. ع(جــــەمـــــهـــــەرە- cemhere): خڕکردنەوەو کەڵەکە کردنی شتێک، جەماوەر.
**جمهره**- ا. ع(جەمهەرە- cemhere): زیخ و چەو.
**جـمـهـور**- ا.ع(جومـهـور- cumhûr): جەماوەر، کۆمەڵەچەو.
**جــــمـــــهـــــوری**- ا. ع(جــــومــــهـــــوری- cumhûrî): شـــەرابی کـــۆنە، شـــەرابی ترێی چەند ساڵە کە خەست بووبێتەوە.
**جمهوری، جمهوریت**- ا.ع(جومهوری، جــــومــــــهــــــوریــیــــــەت- cumhûrî, cumhûrîyet): جـۆرە سیـسـتـەمـێکی حوکمڕانییەکە سەرۆکەکەی بۆ ماوەیەکی دیاریکراو هەڵدەبژێردرێ، کۆماری.
**جـمـیـز**- ا. ع(جومـمەیز- cummeyz): جۆرە هەنجیرێکە، نۆبەرەی هەنجیر.
**جمیش**- ا. ص. ع(جەمیش- cemîş): دارڕو، نورە، زەوی روتەن.
**جمیع**- ا.ع(جەمیء- cemî’): هەموو، هەمووان، جماعەت.
**جمعیه**- ا. ع(جەمئیـە- cem’iye): کۆمەڵ، کۆمەڵگە.
**جـمـیـل**- ص. ع(جـەمـیـل- cemîl): جــوان، باش، چاک، خـــشـکـۆک، خــۆش رەفتار.
**جمیله**- ص.ع(جەمیلە- cemîle): ژنی جوان، ژنی چاک، قەشەنگ.
**جمیم**- ا. ص. ع(جەمـیم- cemîm): چیمەن، فریز.
**جن**- ا. (جــەن- cen): لا، تەنیـــشت،

قەراخ، کەنار.

**جن**- ا. ع(جن- cinn): گوڵ و شکۆفە، هەڕەتی جەوانی، تافی لاوی.

**جن**- ا.ع(جینە- cinne): جنۆکە، لەمەچێتر.

**جنائب**- ا. ع(جەنائیب- cena'ib): باشوور.

**جنائز**- ا.ع(جەنائیز- cena'iz): جەنازان.

**جناب**- ا(جەناب- cenab): تەڵەمەشکێنە، چەڵەمەشکێنە، گرەوی نێوان دوو کەس، کەڵەمەشکێنە.

**جناب**- ا. ع(جەناب- cenab): ئاستانە، دەرگا، وشەی ڕێزە بۆ گەورە پیاوان.

**جنابت**- مص. ع(جەنابەت-cenabet): پیس بوون، لەش پیسبوون لە ئەنجامی شەیتانی بوون یان گانکردن.

**جنابە**- ا.ص(جونابە- cunabe): دووانە، لفانە، جمکانە، جوی.

**جنات**- ص. ع(جونات- cunat): تاوانکاران، تاوانباران.

**جنات**- ع(جەننات- cennat): بەهەشتی بەرین، فیردەوس، باخان.

**جناح**- ا. ع(جەناح- cenah): باڵ، دەست و بازوو، هەر یەکێک لە باڵی ڕاست و چەپی لەشکر.

**جناح**- ا. ع(جوناح- cunah): گوناه، تاوان.

**جنادره**- ا. ع(جەنادیرە- cenadire): پاسەوانان، حیمایە، گارد.

**جنادل**- ا.ع(جەنادیل- cenadil): بەرد، بەردی گەورە، گاکەڤر، بەڕەت.

**جنازه**- ا. ع(جەنازە- cenaze): مردوو، جەنازە، تەرم، تابوتی مردوولەناو.

**جناس**- مص. ع(جیناس- cinas): هاوڕەگەز بوون، ڕەگەزدۆزی.

**جناغ**- ا(جەناغ- cenax): چۆڵەمە.

**جناغ سینه**- ا. مر(جەناغی سینە- cenaxi sîne): پەراسووبەند.

**جنان**- ا. ع(جینان- cinan): بەهەشت، باخ، بێستان، فیردەوس.

**جنان**- ا. ع(جەنان- cenan): دڵ، شەو، تاریکی شەو، کاری پەنهان و شاراوە.

**جنان**- ا. ع(جونان- cunan): مەتاڵ، سوپەر، سپێر.

**جنایات**- ا.ع(جینایات- cinayat): گوناحان، خەتایان، تاوانان.

**جنایت**- مص. ع(جینایەت-cinayet): خەتا، گوناه، تاوان.

**جنب**- ا. ع(جەنب- cenb): تەنیشت، کەنار، سەمت، تەک، کن.

**جنب**- ص. ع(جونوب- cunub): غەریب، غەوارە، بێگانە، دوور، شەیتانی بوون، لەش پیس بوون.

**جنبان**- ص. فا(جونبان- cunban): جوڵان، جوڵاو، جماو، بزاو.

**جنباندن**- مص. م(جونباندەن- cunbanden): جوڵاندن، بزاوتن، بزواندن، جماندن.

**جنباننده**- ا. فا(جونبانەندە- cunbanende): تەکاندەر، جوڵێنەر، جمێنەر، بزوێنەر.

**جنبانیده**- ا. مف(جونبانیدە- cunbanîde): جوڵاو، بزاو، جماو.

**جنب جنبان**- ص. فا (جونوب جونبان- cunub cunban): له حاڵی جوڵاندا.

**جنبش**- ا. مص (جونبیش- cunbiş): بزووتنەوە، بزاڤ، جولانەوە، تەڤگەر.

**جنبه**- ا. ع (جەنبە- cenbe): قەراخ، لا، لایەن، گۆشەگیری، کەنارگیری.

**جنبیدن**- مص. ل (جونبیدەن- cunbîden): جوڵان، بزوان، جمین.

**جنبنده**- ا.فا (جونبەندە- cunbende): جوڵێنراو، جوڵاو.

**جنبیده**- ا. مف (جونبیده- cunbîde): جوڵاو.

**جنت**- ا.ع (جەننەت- cennet): باخ، بەهەشت، بێستان.

**جنتر**- ا (جەنتەر- center): جۆرە سازێکی هیندییە.

**جنتلمن**- ص. انگلی (جینتیلمان- cintilman): جەنتڵمان، جوامێر، نەجیب، نەجیب زادە، خانەدان.

**جنتیانا**- ا. فر (جەنیتیانا- centîyana): جۆرە رووەکێکە بۆ دەرمان بەکار دێت.

**جنثی**- ا. ع (جونسییە- cunsîye): باشترین جۆری ئاسن، ئاسنی باش، شمشێر.

**جنح**- ا (جەنه- cenh): هات و هاوار، هەراو هەنگامە، هاوارو فریاد.

**جنجال**- ا (جەنجال- cencal): قەرەباڵغی، هات و هاوار، ئاژاوەنانەوە، ژاوەژاو، گارەگار.

**جنجر**- ا (جەنجەر- cencer): جەنجەڕ، خەرمان کوت.

**جنح**- ا.ع (جینح- cinh): بەتلێیکی شەو، پەنا، کەناری رێ.

**جنحه**- ا (جونهە- cunhe): وردەخەتا.

**جند**- ا.ع (جوند- cund): سوپا، لەشکر، شار.

**جند**- ا. ع (جەنەد- cened): زەوی ناهەموار، بەردەڵان.

**جندار**- ا. ع (جیندار- cindar): پاسەوان، گاردی تایبەتی فەرماندەی سوپا.

**جندب**- ا. ع (جوندوب، جیندەب- cundub, cindeb): جۆرە کولەیەکە.

**جندبیدستر**- ا. مر (جوندی بیدەستەر- cundi bîdester): جۆرە دەرمانێکە، گونی سەگی ئاوی.

**جندر**- ا (جەندەر- cender): پۆشاک، جندۆڕ، بەرگ.

**جندره**- ا.ص (جەندەرە- cendere): گڵاوکوتک، بەرگی شڕو دڕاو، هەر شتێکی چرچ و لۆچ، ناساف.

**جندک**- ا (جیندەک- cindek): دراوێکی مسینی سەردەمی قاجارییەکان بوو.

**جندل**- ا. ع (جەندەل- cendel): بەرد، گابەرد، گاکەڤر، بەرەت، تاوێر.

**جنده**- ص (جیندە- cinde): قەحبە، رووسپی، ژنی بەدکردەوە، سۆزانی.

**جندی**- ا. ص. ع (جوندی- cundî): سەرباز، عەسکەر.

**جنرال**- ا. فر (جینیرال- ciniral): جەنەراڵ، ژەنەراڵ.

**جنس**- ا.ع (جینس- cins): کاڵا، کەلوپەل، رەگەز، رەگەزی نێر، رەگەزی مێ.

**چش**- (چیش- çiş): هەرچی ئەو.
**چش**- ا. فــا (چەش- çeş): چێـــژەر، کەسێ تامی خواردن بچێژێ.
**چشـام**- ا(چیــشــام - çişam): جـۆرە رووەکێکە بۆ دەرمانی چاو بەکاردێ.
**چشــان**- ص. فـا (چەشــان- çeşan): چێژەر، چەشتن.
**چشـــــاندن**- مـص. م(چەشــــاندەن- çeşanden): چێژاندن.
**چشــــاننده**- ا. فــــا (چەشــــانەندە- çeşanende): کەسێ کە تامی شتێ بە کەسێک بچێژێ.
**چشایی**- ا(چەشایی- çeşayî): هەستی چەشتن.
**چشـتـه**- ا(چەشـتـە- çeşte): تێـشت، چەشە.
**چشــتــه خــوار**- ص. فـا (چەشـتـەخـار- çeşte xar): چەشەخۆر، بەرتیل خۆر.
**چشخام**- ا(چەشخام- çeşxam): جۆرە رووەکێکە.
**چشش**- ا.مص(چەشـــیش- çeşiş): چەشتن.
**چشـک**- ا. ص(چیـــشـک- çişk): زیادی، فراوانی، زاڵی، براوە.
**چشم**- ا(چەشم- çeşm): چاو.
**چشــم ارو**- ا. مـــــــر(چەشم ئـارو- çeşm arû): نوشتە، چاوەزار.
**چشم اغــیـل**- ا. مــر(چەشم ئاغــیـل- çeşm axîl): مۆرەکردن.
**چشم الـوس**- ا. مـــــر(چەشم ئالـوس- çeşm alûs): روانین بەگـۆشـەی چاو، مۆرەکردن، نیگای بە غەزەب.
**چشــم انــداز**- ا. مــــــر(چەشم ئـەنـداز- çeşm endaz): دیمەن، ئاســۆ، دیمەنی بەریـن و جـــــوان، چاوەنداز، بـەرچـاو، روانگە، پانۆراما.
**چشم اویز**- ا. مـــر(چەشم ئاڤــیـــــز- çeşm avîz): پێـــچــە، چاو بەست، نوشتە، دوعا، چاوەزار.
**چشم بـازکــــردن**- مص. ل(چەشم بـاز کـــــــەردەن- çeşm bazkerden): چاوکردنـەوە، بێداربوونەوە لـە خەو، روانین بەوردی.
**چشم بد**- ص. مـــر(چەشـــــمی بەد- çeşmi bed): چاوی بەد، چاوی پیس.
**چشم براه**- ص. مــــــر(چەشم بەراه- çeşm berah): چاوەڕوان، چاو لە ڕێی هاتنی میوانێ یان گەیـیشتنی هەواڵێک.
**چـــشـــم بـــرداشـــتن**- مـــص. ل(چـــەشـــم بەرداشــــتــەن- çeşm berdaşten): چاوپۆشـی کـردن، سـەیرنـەکـردنی کـەسـێک یان شتێک، روو وەرگێڕان لە کەسێک یان شتێ.
**چشم بستن**- مص. ل(چەشم بەســتــەن- çeşm besten): چـاولێـک نـان، چـاو نوقاندن.
**چشم بلبل**- ا. مـــــر(چەشم بـول بـول- çeşm bulbul): چاوی بـولبـول، جـۆرە قـومـاشـێکی بە خـاڵی وردە وەکـو چاوی بولبول.
**چشم بلبلی**- ا. مــر(چەشم بول بولی- çeşm bulbulî): جۆرە لۆبیایەکە.
**چـشــم بـنـد**- ا.ص(چـەشـم بـەنـد- çeşm bend): چـاوبـەن، چـاوبـەنـد، چاوبەست.

**چشم بندک**- ا. مـــر(چەشم بەندەک- çeşm bendek): چاوشارکێ.

**چشم بندی**- ا. مص(چەشم بەندی- çeşm bendî): جادوگەری، چاووڕاو.

**چشم بی اب**- ص.مر(چەشمی بی ئاب- çeşmi bîab): بێ چاوو روو، بێ حەیا، بێ شەرم.

**چشم بیمار**- ص.مر(چەشمی بیمار- çeşmi bîmar): چاوی خومار.

**چشم پزیشک**- ا. ص(چەشم پزیشک- çeşm pizîşk): دکتۆری چاو، پزیشکی چاو.

**چشم پنام**- ا. مـــر(چەشم پەنام- çeşm penam): نوشتە، چاوەزار.

**چشم پوشیدن**- مص. ل(چەشم پوشیدەن- çeşm pûşîden): چاوپۆشین.

**چشم پیش**- ص. مـــر(چەشم پیش- çeşm pîş): شەرمن، شەرمین.

**چشم تنگ**- ص. مـــر(چەشم تەنگ- çeşm teng): چاوتەنگ، رژد، رەزیل، حەسود، چاوچنۆک.

**چشم چران**- ص. فـــا((چەشم چەران- çeşm çeran): چاو لەوەڕێن، چاوباز، چاوچلێس، نەزەرباز.

**چشمخانه**- ا. مـر(چەشمخانە- çeşmxane): چاڵی چاو.

**چشم خروس**- ا. مـر(چەشم خورووس- çeşm xurûs): جۆرە رووەکێکە، چاوکەڵەشێرە.

**چشم خروس**- ا. مـر(چەشمی خورووس- çeşmi xurûs): شەرابی سوورو ئاڵ.

**چشم خاباندن**- مص. ل(چەشم خاباندەن- çeşm xabanden): چاوخەواندن، چاوپۆشی کردن.

**چشم خوردن**- مص. ل(چەشم خوردەن- çeşm xûrden): بە چاوەوە بوون.

**چشـمداشت**- ا.مص(چەشم داشت- çeşm daşt): بە تەمـا بوون، چاو لە کۆمەکی کەسێک، چاوەڕوانی گەییشتنی شتێک.

**چشم داشتن**- مص. ل(چەشم داشتەن- çeşm daşten): چاوەڕوان بوون، بە تەما بوون.

**چشمدان**- ا. مـر(چەشمدان- çeşmdan): کاسەی چاو، چاڵی چاو.

**چشم دریده**- ص. مـــر(چەشم دەریدە- çeşm derîde): بێ شەرم، بێ حەیا، روودار، بێ ئەدەب.

**چشم دل**- ا. مـــر(چەشمی دل- çeşmi dil): چاوی دڵ، چاوی باتین، چاوی ئەقڵ، چاوی ئاوەز.

**چشم دوختن**- مص. م(چەشم دوختەن- çeşm dûxten): چاوتێ برین.

**چشم رسیدن**- مص. ل(چەشم رەسیدەن- çeşm resîden): بە چاوەوە بوون.

**چشم روشنی**- ا. مـر(چەشم رەوشەنی- çeşm rewşenî): چاوڕوونی، مژدەی خۆش، دیاری بردن بۆ بوک و زاوا، پیرۆزبایی.

**چشم زاغ**- ص. م(چەشمەزاغ- çeşmezax): چاوکەوە، بێ شەرم، بێ حەیا.

**چشم زخ**- ا.مـــر(چەشم زەخ- çeşm zex): بە چاوەوە بوون.

**چشم زخم**- çeşm zexm): به چاوەوە بوون.
**چشم زد**- ا. مـــــر(چەشم زەد- çeşm zed): مـــيـــرووييەكی رەش و سـپـی‌يە بۆ چاوەزار لەملی منداڵ دەكرێ، چاوتروكانێک.
**چشم زد**- ا.مـــــر(چەشم زەد- çeşm zed): چاوتروكانێک، ماوەيەكی زۆر كورت.
**چـشـم زد**- ا. مـف(چـەشـم زەد- çeşm zed): چاولێدراو.
**چـشـم زدن**- مـص. م(چـەشـم زەدەن- çeşm zeden): چـاولـێـــدان، ئاماژەكردن، ترسان.
**چـشـم زده**- ا.مـف(چـەشـم زەدە- çeşm zede): چاولێدراو.
**چـشـم زدن**- مـص. ل(چـەشـم زەدەن- çeşm zeden): چـاوتـروكــانـدن، چاولێدان.
**چشم سـفـيـد**- ص. مـر(چەشم سـەفـيـد- çeşm sefîd): روودار، بێ حـەيا، بێ ئەدەب، بێ شەرم، بێ چاو و روو.
**چشم شـور**- ص. مـر(چەشم شـور- çeşm şûr): چاوی بەد، چاوی پيس..
**چشم غـره**- ا. مـر(چەشم غـورە- çeşm xure): مـــــۆرە، چاو لـێ سووركردنەوە، هەرەشە، ترساندن.
**چشم فـــروبستن**- مـص. ل(چەشم فـروبەسـتـەن- çeşm furûbesten): چاولێک نان، چاوپۆشی كـردن، تەمـاشا نەكردن.
**چشم فـسـا**- ص. فـا(چەشم فـەسـا- çeşm fesa): كـەسێ كـە كـاری چاوی بەد بەتاڵ بكاتەوە.
**چشـمک**- ا(چەشـمـەک- çeşmek): چاوی چكۆڵە، ئامـاژە كـردن بە گـۆشـەی چاو، چاو لێ داگرتن.
**چشـمک**- ا(چەشـمـەک- çeşmek): چاو داگرتن، ئاماژە بە گۆشەی چاو.
**چشـمک زدن**- مص(چەشـمـەک زەدەن- çeşmek zeden): چاوداگرتن.
**چشـمک**- ا(چەشـمـەک- çeşmek): چاويلكە، عەينەک.
**چشـمک**- ا(چەشـمـەک- çeşmek): جـۆرە رووەكـێكە بۆ دەرمـانـی چاو بەكـار دێت.
**چشم كـردن**- مص. م(چەشم كـەردەن- çeşm kerden): بە چاوەوە كـــردن، چاولێدان.
**چشم گـاو**- ا. مـر(چەشـمـی گـاڤ- çeşmi gav): جۆرە گوڵێكە.
**چشم گــــردانـدن**- مـص. ل(چـەشم گـــەرداندەن- çeşm gerdanden): چاوگێڕان، مۆڕەكردن، نيگاكردنی پڕ رق و غەزەب.
**چشم گـرم كـردن**- مص. ل(چەشم گـەرم كـــەردەن- çeşm germ kerden): چاو گەرم كردن، نووستن، نووستنی كەم.
**چشم گـشتـه**- ص. مـر(چەشم گەشـتـە- çeşm geşte): چاو چەپ و خـــێـل، خێل و قيچ.
**چشملان**- ا(چەشمەلان- çeşmelan): بيلبيلەی چاو، گلێنەی چاو.
**چشم نهـادن**- مص. م(چەشم نەهادەن- çeşm nehaden): چـاو تـێ بـڕيـن، بەتەما بوونی كەسێک يان شتێک.

**چشم نهــان**- ا. مــر(چەشــمی نیــهــان- çeşmi nihan): چاوی باتین، چاوی دڵ، چاوی پەنهان، چاڤی هندور.

**چشم و چار**- ا. مـــــر(چەشم و چار- çeşm u çar): چورو چاو، چاو و هێزی بینایی، سۆمای چاڤ.

**چشم و چراغ**- ا.مـــر(چەشم و چەراغ- çeşm u çerax): کەسی هەڵبژاردەو ناوداری مایەی فەخری ماڵباتی خۆی، دڵبەری جوان و ئازیز.

**چشم ودل پاک**- ص. مـــر(چەشم و دیل پاک- çeşm u dil pak): چاو و دڵ پاک، داوێن پاک، ئەمین، کـەسێ کـە خیانەت لە ماڵ و ناموسی خەڵکی نەکات.

**چشم و دل سیـر**- مص. مـر(چەشم و دڵ سیــر- çeşm u dil sîr): چاو و دڵ تێر، بێ تەماح، کەسێ کە چاوی لە ماڵی خەڵکی نەبێ.

**چشم و گوش باز**- ص. مر(چەشم و گوش باز- çeşmu gûş baz): چاوو گـوێ کــراوە، زاناو داناو وریاو بە ئەزمـــوون، فامیدە.

**چشم وهام**- ا. مــــر(چەشم ڤـــە هام- ceşm veham): چاوەزار.

**چشم و همچشمی**- ا. مص(چەشم و هەم چەشـمی- çeşm u hemeçeşmî): رکـــابەری، رقـــەبەری، ملمـــــلانێ، کێشمانەکێش.

**چشمه**- ا(چەشمە- çeşme): کانیاو، سەرچاوە.

**چشـمـه**- ا(چەشـمـە- çeşme): کـون، کونی بچووک وەکو کونی سوژن.

**چشمه**- ا(چەشمە- çeşme): هەتاو، خۆر، رۆژ.

**چشمهء افتاب**- ا. مر(چەشمەی ئافتاب- çeşmey aftab): هەتاو، خۆر، رۆژ.

**چشمهء الیاس**- ا. مر(چەشمەی ئیلیاس- çeşmey ‘ilyas): سـەرچاوەی خـدر پێغەمبەر، ئاوی زنەگی، ئاوی حەیات.

**چشمهء حیات**- ا. مر(چەشمەی هەیات- çeşmey heyat): کانی ژین.

**چشمهء حیوان**- ا. مر(چەشمەی هەیڤان- çeşmey heyvan): کانی ژین.

**چشـمـهء خضـر**- ا. مـر(چەشـمـەی خزر- çeşmey xizr): کانی ژین.

**چشـمـهء خیـز**- ص. مر(چەشـمە خـیـز- çeşme xîz): شوێنی پڕ کانی، کانیاو زار.

**چشـــمــه زار**- ا. مــر(چەشـــمــەزار- çeşmezar): سەرچاوە زار، کانی زار.

**چشـمـه سـار**- ا. مـر(چەشـمـە سـار- çeşme sar): شوێنێ کە کانی و ئاوی زۆر بێ، کانیاو زار.

**چشـمـهء سیـمـاب**- ا. مـر(چەشـمـەی سـیـمــاب- çeşmey sîmab): سەرچاوەی هەتاو.

**چشـمـهء قـیـر**- ا. مـر(چەشـمـەی غـیـر- çeşmey xîr): شـــەوی تـاریـک و نوتەک، شەوەزەنگ.

**چشـــمـــهگـــاه**- ا. مـــر(چەشـــمـــەگـــاه- çeşmegah): شـوێنی هەڵقـــوڵینی کانی.

**چشـمـهء نوش**- ا.مـر(چەشـمـەی نوش- çeşmey nûş): کانی ژین، کانی خدر پێغەمبەر.

**چشـــمـــیـــزک**- ا(چەشـــمـــیـــزەک-

çeşmîzek): جۆرە رووەکێکە.

**چشوم**- ا(چەشوم- çeşûm): جۆرە رووەکێکە.

**چشیدن**- مص. ل(چەشیدەن- çeşîden): چەشتن، چەژتن، تام و چێژکردن.

**چشنده**- ا. فا(چەشەندە- çeşende): چێژەر.

**چشیده**- ا. مف(چەشیدە- çeşîde): چێژراو، تام کراو.

**چغ**- ا(چوغ- çux): نیر، نیله.

**چغ**- ا(چیغ- çix): چیغ.

**چغ**- ا(چەخ- çex): خەرەک، دارێکە ماستی پێ دەشلەقێنن تا کەرەکەی جیا بکەنەوە.

**چغاز**- ص(چەغاز- çexaz): ژنی جنێوفرۆش، سەلیتە، بێ حەیا، قرمێچە.

**چغاله**- ا.ص(چەغالە- çexale): میوەی نەگەییوی وەک بادەم و زەردەلو و ئەو شتانە.

**چغامه**- ا(چەغامە- çexame): چامە، شیعر، قەسیدە، چەکامە.

**چغان**- ا(چەغان- çexan): ئامێرێکی مۆسیقایە.

**چغانه**- ا(چەغانە- çexane): ئامێرێکی مۆسیقایە، چەقەوانە.

**چغانی**- ص. ن(چەغانی- çexanî): خەڵکی چەغانیان.

**چغبوت**- ا(چەغبوت- çexbût): ناواخنی لێفە یان دۆشەک.

**چغبه**- ا(چەغبە- çexbe): جۆرە سازێکە.

**چغته**- ا(چوغتە- çuxte): پێتاو، جۆرە پێلاوێکە لە بەفرا لە پێ دەکرێ تا پێ لە بەفر رۆنەچێ.

**چغر**- ص(چەغەر- çexer): چەرمی دەست و پێ لە ئەنجامی کارکردن و رۆییشتنی زۆر.

**چغرات**- ا(چوغرات- çuxrat): تۆراغ.

**چغز**- ا(چەغز- çexz): بۆق، قورباقە.

**چغز**- ا(چەغز- çexz): دوومەڵ، قونێر.

**چغز**- ا(چەغەز- çexez): جۆرە رووەکێکە.

**چغزواره**- ا. مر(چوغزڤارە- çuxz vare): قەوزە.

**چغزیدن**- مص. ل(چەغزیدەن- çexzîden): ترسان، ناڵەکردن، سکاڵاکردن.

**چغزنده**- ا. فا(چەغزەندە- çexzende): ترسێنەر، ناڵەوزاریکەر.

**چغزیده**- ا.مف(چەغزیدە- çexzîde): ترساو.

**چغک**- ا(چوغەک- çuxek): پاساری، چۆلەکە، کێشکە.

**چغل**- ص(چەغەل- çexel): چەق، نەکوڵەک.

**چغل**- ا(چەغەل- çexel): چرچ و لۆچ.

**چغل**- ا(چوغەل- çuxel): زرێ، بەرگی شەڕ، جەوشەن.

**چغل**- ص(چوغول- çuxul): دوو زمان.

**چغند**- ص(چوغوند- çuxund): گەورە، قایم، گرێی گەورە.

**چغندر**- ا(چوغوندەر- çuxunder): چەوەنەر.

**چغندرکــار**- ص. فــا (چوغــوندەرکـــار- çuxunder kar): جوتیاری چەوەنەری شەکر.
**چغـنە**- ا(چەغـنە- çexne): جـــــۆرە سازێکە، چەقەنە.
**چغــو**- ا(چوغــو- çuxû): چۆلەکــەو کوندەپەپوو، بایەقوش.
**چغـــیــــدن**- مص. ل(چەغـــیـــــدەن- çexîden): ئارەزووکـردن، تاقـیـبکردن، گەڕان.
**چـفـت**- ا(چـەفـت- çeft): داربـەس، قایمەمێو.
**چفت**- ا(چەفت- çeft): مـیچ، مـیـچی گومەزی.
**چفت**- ا(چیفت- çift): ئەڵقەو زنجیری دەرگا، سورگی.
**چفــتـک**- ا(چەفـــتـــەک- çeftek): کاروانە.
**چفــتـە**- ص(چەفــتــە- çefte): پێچ، چەماوە، کەچ، تاق و میچی کەوانەیی.
**چفته**- ا(چەفتە- çefte): درۆ، بوختان، گومانی خراو.
**چفـتـە پشت**- ص. مـر(چەفـتـە پوشت- çefte puşt): قەمبور، کوور، کۆم.
**چفــتـــیــدن**- مـص. ل(چەفـــتـــیـــدەن- çeftîden): چەمینەوە.
**چفـــدە**- مـص. ل(چەفــــدە- çefde): چەماوە.
**چفـــســانـدن**- مـص.م(چەفـــســـاندەن- çefsanden): چەسپاندن، لکاندن.
**چفـــســیـــدن**- مـص. ل(چەفــســیـــدەن- çefsîden): لکان، چەسپان.
**چقشور**- ا(چەغشـور- çexşûr): جۆرە شەرواڵێکە ژنان لە پێی دەکەن.
**چک**- ا. فــــر(چیـک- çik): حــەواڵە، چەک.
**چک**- ا(چەک- çek): شەنە.
**چک**- ا(چیک- çik): چکە، تکە.
**چک**- ا(چەک- çek): چەناگە.
**چک**- ا(چەک- çek): زللە، شـەقـازللە، دەمانچە.
**چک**- ا(چوک- çuk): چۆک، دانیشتنی دەستەو ئەژنۆ.
**چک**- ا(چوک- çuk): تـاق تاقـکـەرە، مـەلێکە تا بەیانی دەڵێ: «توت، توت»، قژاوکە، توتەک.
**چکاچاک**- ا(چەکـاچاک- çekaçak): دەنگی پێک کەوتنی چەک وەکو شمشێرو گورزو ئەو شتانە.
**چکاچک**- ا(چەکـاچەک- çekaçek): دەنگی پێک دادانی چەکی وەکو شمشێرو گورزو ئەو شتانە.
**چکاچک**- ا(چوکـاچوک- çukaçuk): مقۆ مقۆ، دەمگۆ، گوتگوتک.
**چکاد**- ا(چەکــاد- çekad): ترۆپک، قوللە، لوتکە، تەپڵی سەر.
**چکاســە**- ا(چەکـــاســـە- çekase): سیخور، سوچەر.
**چکامــە**- ا(چەکـــامـــە- çekame): قەسیدە، شیعر، چامە.
**چکامـە سرا**- ص. فـا(چەکـامـەسـەرا- çekame sera): شـــــاعـــــیـــــــر، هەڵبـەسـتـەوان، هۆزانڤـان، قـەسـیـدەبێژ، چامەسرا.
**چکامــەگــو**- ص. فــا(چەکـــامـــەگـــو- çekamegû): شـاعـیـر، قـەسـیـدەبێژ،

هۆزانڤان.

**چکان**- ص. فـــا (چەکـــان- çekan): چکان، تکان، لە حـالّی چکان یان تکان دا.

**چکـاندن**- مـص. م (چەکـــــــانـدەن- çekanden): تکاندن، چکاندن.

**چکاننده**- ا.فــــا (چەکــــانەندە- çekanende): تکێنەر.

**چکانه**- ا (چەکــــــانە- çekane): ئامێرێکی مۆسیقایە.

**چکانه**- ا (چەکـانە- çekane): تکە، دڵۆپە، تنۆک.

**چکاو**- ا (چەکـاڤ- çekav): نەوایەکی مۆسیقایە، کڵاوکوڕە، کڵاونە.

**چکاوک**- ا (چەکـاڤـەک- çekavek): کڵاو کوڕە، کڵاونە.

**چکاوک**- ا (چەکـاڤـەک- çekavek): نەوایەکی مۆسیقایە.

**چکاوگـــاه**- ا. مـــر (چەکـــاوگـــاه- çekawgah): گۆشەی کەوان.

**چکاوه**- ا (چەکــــاڤــــە- çekave): کڵاوکوڕە.

**چکچـاک**- ا (چەکـچـاک- çekçak): دەنگی لێکدانی چەکی وەکـو شـمـشـێـرو گورزو ئەو شتانە.

**چکـچـک**-ا (چـەک چـەک- çekçek): دەنگی لێکدانی شمشێر.

**چک چک**- ا (چیک چیک- çikçik): دەنگی چکەچکی ئاو.

**چک چک**- ا (چەک چەک- çekçek): چۆقە چۆقی ددان لە سەرمادا.

**چک چک**- ا (چوک چوک- çuk çuk): مقۆ مقۆ، چپەدوو.

**چـکـرنـه**- ا (چـیـکـەرنـە- çikerne): کاروانە.

**چکره**- ا (چەکرە- çekre): دڵۆپەی ئاو، تکەی ئاو، بڵقی سەر ئاو، تنۆک.

**چکری**- ا (چوکـــری- çukrî): ڕێواس، نێرکی ڕێواس، چەقەرە، چەکەرە.

**چکس**- ا (چەکەس- çekes): هێلانەی تایبـــەتی باڵدارانی راوی: بازو هەڵۆ و چێرگ.

**چکســه**- ا. ص (چەکـســە- çekse): کـاغـەزێ کـە داودەرمـانی تێـوەپێـچن، جقجقە.

**چکسه**- ا (چەکسە- çekse): هێلانەی بازو هەڵۆو...

**چکش**- ا. ا (چـەکـــــوش- çekuş): چاکوش.

چکش پرانی- ا. مص (چەکـوش پەرانی- çekuş peranî): جۆرە وەرزشێکە.

**چکش خـور**- ص. مـر (چەکـوش خـور- çekuş xûr): کانزایەکە بکوتکرێتەوەو بۆ چەکوش خۆش بێ وەکو مس.

**چکش کـاری**- ا.مص (چەکـوش کـاری- çekuş karî): چەکوش کاری.

**چکک**- ا (چوکوک- çukuk): چۆلەکە، پاساری، مەلوچک، چێشکە.

**چکـک**- ا (چـەکــــــــەک- çekek): ئاهەنگێکی مۆسیقییە.

**چکله**- ا (چەکلە- çekle): تکەی ئاو، چکەی ئاو، تنۆک، دڵۆپ.

**چکمــه**- ا. ت (چەکـمــە- çekme): چەکمە، جزمە، پووت، پۆستاڵ.

**چکمــه پوش**- ص.فـا (چەکـمـە پوش- çekme puş): چەکمە لە پێ.

**چکمــــه دوز**- ا. ص(چەکـــمـــە دوز- çekme dûz): چەکـمـەساز، وەسـتـای چەکمە.

**چکمـیـزک**- ا. مـر(چەک مـیـزەک- çekmîzek): میزە چۆڕتکێ.

**چـکـن**- ا(چـەکـین- çekin): پـارچـەی زەڕدۆزی.

**چــکــن دوز**- ا. ص(چــەکــین دوز- çekin dûz): کەسێ کە پارچە زەڕدۆزی بکات.

**چکنه**- ا.ص(چیکەنە- çikene): وردە مـوڵکدار، ئاو یان زەوی یان پەز کـە چەند خاوەنێکی هەبێ.

**چکوک**- ا(چوکوک- çukûk): چۆلەکە، پاساری، چێشکە، مەلوبچک.

**چکه**- ص(چەکە- çeke): زۆر بچووک، ورد، قۆشمە.

**چکه**- ا(چەککـــە- çekke): تکە، چکە، دڵۆپ، تنۆک.

**چکی**- ص. ق(چەکی- çekî): گۆترمە، گۆترە، کڕین و فرۆشتن بە گۆترە.

**چکیــــدن**- مص. ل(چەکـــیــــدەن- çekîden): تکان، چکان.

**چکیـده**- ا. مف(چەکیـدە- çekîde): تکاو، چکاو، گوشراو، دڵۆپێندراو.

**چکـین**- ا(چـەکـین- çekîn): پـارچـەی زەڕدۆزی.

**چگال**- ا.ص(چەگال- çegal): سفت و قورس، چڕ.

**چگالی سنج**- ا. مـر(چەگـالی سـەنج- çegali senc): چڕی پێـو، ئامـێـری پێوانەو دیاریکردنی چڕی، هیدرۆمەتر.

**چگر**- ا(چوگـــور- çugur): جـــۆرە سازێکە.

**چگل**- ص. ن(چیگل- çigil): خەڵکی چیگل، جوان.

**چگور**- ا(چوگـــور- çugûr): دووتار، سازێکە پتر لە ناو گوندییاندا باوە.

**چگونه**- (چیگونە- çigûne): چۆنی، چتۆ.

**چل**- ا(چیـل- çil): چل، دوو جـــاران بیست.

**چـــل**- ا(چـــەل- çel): بـــەربـــەســـت، بەربەستێک کە بە دارو بەردو خـاک لەبەر ئاو دروست کرابێ.

**چل**- ا.ص(چیل- çil): ئەسـپـێـک کـە دەستی راست و لاقی چەپی سپی بێ.

**چل**- ص(چیل- çil): کـەم ئاوەز، گـێـل، کەودەن، شێت.

**چلاس**- ص(چیـلاس- çilas): چلێس، نەوسن، چەورە.

**چـلاغ**- ص(چـولاغ- çulax): لـەنـگ، شەل.

**چـــلانــــدن**- مـــص- م(چــەلانـــدەن- çelanden): گوشین.

**چـلانـنـده**- ا.فـــــــا(چـەلانـەنـدە- çelanende): کـەسێ کـە ئـاوی شـتـێ بگرێ، شتێ بگوشێت، گوشینەر.

**چلاو**- ا(چیلاو- çilaw): پلاو.

**چلب**- ا(چەلەب- çeleb): سنج.

**چـلـب**- ا(چـەلـەب- çeleb): ئـاژاوە، هەراوهەنگامە، فیتنەو ئاشوب.

**چل بسم الله**- ا. مر(چیل بیسـمـیل لاه- çil bismil lah): چل بیسـمـیللا، چل پارچەپولەکەی مس یان زیو یان ئاڵتون کە وشەی ئایەتی قورئان و بیسمیلای لەسەر

نەخش کرابێ و بکرێ بەرستەوەو لە ملی منداڵ بکرێ بۆ سەلامەتی و چاوەزار.
**چلبله**- ا. ص(چولبولە- çulbule): پەلەپەل و نیگەرانی، بەخشیشی شاعیر.
**چل بند**- ا. مر(چیل بەند- çil bend): جۆرە جلێکی تایبەتی سەماچیانە.
**چلبی**- ا. ق(چەلەبی- çelebî): سەروەر، نازناوێکە لە کۆناو لە زمانی تورکی عوسمانیدا بە زانایان و ئەدیبان و شازادان گوتراوە.
**چلپاسه**- ا(چەلپاسە- çelpase): مارمێلکە.
**چلپ چلپ**- ا(چیلپ چیلپ- çilp çilp): شلّپە شلّپ، شلّپە شلّپی ئاو.
**چلپک**- ا(چەلپەک- çelpek): چنگاڵ.
**چل تاج**- ص. مر(چیل تاج- çiltac): کەڵەشێری پۆپنە پان و گەورە.
**چل تکه**- ا. مر(چیل تیککە- çil tikke): پارچە یان پۆشاکێک کە لە سەرە پارچەی رەنگاورەنگ دروست کرابێ.
**چلتوک**- ا(چەلتوک- çeltûk): چەڵتووک، برنجی نەکوتراو.
**چلچراغ**- ا(چیلچیراغ- çilçirax): چلچرا، ثورەیا، پەروین.
**چلچله**- ا(چیل چیلە- çilçile): پەرەسێلکە، پریسیلک.
**چلچلی**- ا. مص(چیلچیلی- çilçilî): هەوەسبازی و خۆشگوزەرانی و رابواردن، بە تایبەتی لە چل ساڵیدا.
**چلر**- ا(چیلەر- çiler): جۆرە درەختێکە.
**چلش**- ا(چولوش- çuluş): ترشوکە.

**چلغوز**- ا(چەلغوز- çelxûz): ریقنە، جیقنە.
**چلغوزه**- ا. مر(چیللغوزە- çilxûze): بەری درەختی سنۆبەر، بوندق، فستق.
**چلفتی**- ص. عا(چولوفتی- çuluftî): گێل، بێکارە، هیچ لە بارانەبوو، دەست و پێ سپی.
**چلک**- ا(چولەک- çulek): کلافە ئاوریشم، گلۆڵە بەن، پەت.
**چلک**- ا(چیلک- çilk): کەوگیر.
**چل کلید**- ا.مر(چیل کلید- çil kilîd): جامێکی کانزاییە کە بە دەوراو دەوریدا دوعا هەڵکەنراوە، چل پارچە کانزای کلیل ئاسای بە قەراخەوە کراوەو پری لە ئاو دەکەن و دەیدەن بە نەخۆش کە بیخواتەوە یان دەیرێژن بەسەریا تا چاک بێتەوە. هەندێ جار بۆ کردنەوەی بەختی کچان دەیبەن بۆ گەرماوو بەو جامە ئاوی بەسەردا دەکەن.
**چلم**- ا(چەلەم- çelem): تووی فەرەنگی.
**چلم**- ا(چیلیم- çilim): جۆرە نێرگەلەیەکە.
**چلمله**- ا.ص(چەل مەلە- çelmele): خۆڕایی، مفت.
**چلنگر**- ا.ص(چیلینگەر- çilinger): قفڵ و کلیلساز.
**چلو**- ا(چیلەو- çilew): پلاوی برنج.
**چلوار**- ا(چیلڤار- çilvar): کەتان، جۆرە قوماشێکی سپی تەنکە کراس و بیجامەی لێ دروست دەکەن.
**چلونک**- ا(چەلونەک- çelûnek): برک، برکی کاڵەک و شوتی و ئەو شتانە،

پنجی بێستان.
**چله**- ا(چیلله- çille): دەزوی بادراو، ژێی کەوان.
**چله**- ا(چیلله- çille): چله، چلەی لە دایک بوون، چلەی مردن، چلەی زستان و....
**چلەبری**- ا.مص(چیلله بوری- çille bûrî): چلەبڕی.
**چله تابستان**- ا. مر(چیللەی تابیستان- çilley tabistan): چلەی هاوین، چل ڕۆژی یەکەمی هاوین و وەرزی هەرەتی گەرما.
**چله زمستان**- ا. مر(چیللەی زەمیستان- çilley zemistan): چلەی زستان.
**چله گرفتن**- مص. ل(چیلله گیریفتەن- çille giriften): چله گرتن، ڕێ و ڕەسمی چلەی مەرگی کەسێک.
**چلەنشستن**- مص. ل(چیلله نیشەستەن- çille nişesten): چلەنشینی بە مەبەستی عیبادەت و تاعەتی خوا.
**چلەنشین**- ص. فا(چیللەنیشین- çille nişîn): چله نشین، کەسێ لە چلەخانە دانیشێت و خواپەرستی بکات، چلەکێش.
**چلیپا**-ا(چەلیپا- çelîpa): سەلیب، خاچ، چەلیپا.
**چلیپائیان**- ا(چەلیپائیان- çelîpa'îyan): سەلیبیان، جۆرە رووەکێکە کە گوڵەکانی چوار پەرەو بە شێوەخاچە وەکو گوڵی شەوبۆ.
**چلیپاوش**- ص. مر(چەلیپاڤەش- çelîpaveş): خاچ ئاسا، وەکو خاچ.
**چلیک**- ا(چیلیک- çilîk): بەرمیل، جلیکانە.
**چلیم**- ا(چیلیم- çilîm): جۆرە نێرگەلەیەکە، قلیانی ئاوی.
**چلینگر**- ا. ص(چیلینگەر- çilînger): قفڵ و کلیلساز، وەستای قفڵ و کلیلان.
**چم**- ا(چەم- çem): رۆیینی بەلارو لەنجە، نازو خۆنواندن.
**چم**-ا(چەم- çem): ئامادە، ساز، تەیار.
**چم**- ا(چەم- çem): مانا، شەرح و شرۆڤە، جەوهەری قسە.
**چماق**- ا. ت(چوماغ- çumax): گورز، چۆماغ، گۆپاڵ، داردەستی گەورەو ئەستور.
**چمان**- ص.فا(چەمان- çeman): خەرامان، رۆیینی بەلارو لەنجە.
**چمان**- ا(چەمان- çeman): پیاڵە، جام، کولەکەی شەراب، هەر شتێ شەرابی تیا بخورێتەوە.
**چمان**- ا(چەمان- çeman): چیمەن، سەوزەزار، مێرگ.
**چماندن**- مص. م(چەماندەن- çemanden): بەلارولەنجە رۆییشتن.
**چمانه**-ا(چەمانە- çemane): گیانلەبەر، زیندەوەر.
**چمانه**- ا(چەمانە- çemane): سوراحی، پیاڵەی شەراب، کودی شەراب تێ کردن.
**چمانی**- ص. ن(چەمانی- çemanî): ساقی، بەلەنجەولار، مەیگێڕ.
**چمانیدن**- مص. م(چەمانیدەن- çemanîden): بەلارولەنجە رۆییشتن.
**چمباتمه**- ا(چومباتمە- çumbatme): دانیشتن بە چیچکانەوە، توتەکان،

سەرتوتک، سەرچنجک.

**چمپا**- ا(چەمپا- çempa): جۆرە برنجێکە، برنجی گردە.

**چمچاچ**- ص(چەم چاچ- çemçaç): چەماوە، خوار، قەمور، پشت کۆم، کوور، قەمبور.

**چمچارە**- ا(چیم چارە- çimçare): جوێنە.

**چمچم**- ا(چومچوم- çumçum): کلاشی پەڕۆیین، کلاشی هەورامی.

**چمچم**- ا(چوم چوم- çumçum): سم، سمی وڵاخ.

**چمچم**- ا(چەم چەم- çemçem): لارولەنجە.

**چمچمە**- ا(چوم چومە- çumçume): دەنگی پێی مرۆڤ یان چوارپێ لە رۆیشتنا.

**چمچە**- ا(چەمچە- çemçe): کەوگیر، مراک، کەوچکی گەورە، ئەسکوێ.

**چمخال**- ا(چەم خال- çemxal): جۆرە تفەنگێکی کۆنە، تفەنگ یان دەمانچەی سەرتۆپ.

**چمدان**- ا(چەمەدان- çemedan): جانتا.

**چمش**- ا(چەمش- çemş): چاو.

**چمش**- ا. مص(چەمیش- çemiş): چەمانەوە، ری کردن بەنازو عیشوەوە.

**چمکانی**- ا(چیمکانی- çimkanî): جۆرە درەختێکە.

**چمن**- ا(چەمەن- çemen): چیمەن، مێرگ، سەوزەزار.

**چمن ارا**- ص. فا(چەمەن ئارا- çemen ara): چیمەن ئارا، کەسێ کە خزمەتی چیمەن بکات، باخەوان.

**چمن افروز**- ص. فا(چەمەن ئەفروز- çemen efrûz): گوڵێک کە رەونەق بە چیمەن و مێرگان بدا.

**چمن پیرا**- ص. فا(چەمەن پیرا- çemen pîra): باخەوان.

**چمنزار**- ا. مر(چەمەن زار- çemenzar): میرگوزار.

**چمنی**- ص.ن(چەمەنی- çemenî): بەڕەنگی چیمەن، هەر شتێ سەوز بێ وەکو چیمەن.

**چموش**- ص(چەموش- çemûş): چەمووش، تۆسن.

**چمیدن**- مص. ل(چەمیدەن- çemîden): بەلارولەنجە رۆیین.

**چمنده**- ا. فا(چەمەندە- çemende): کەسێ بەلارولەنجە بڕوات.

**چمیده**- ا. مف(چەمیدە- çemîde): چەماوە، بەلارو لەنجە.

**چمین**- ا(چەمین- çemîn): میز، پیسی، سەرگین.

**چناچن**- ا(چەناچەن- çenacen): دەنگی هاویشتنی تیری یەک لە دوی یەک بە کەوان.

**چنار**- ا(چینار- çinar): درەختی چنار.

**چنان**- ق(چونان- çunan): بەو جۆرە، وەکو ئەوە، ئاوها.

**چنانچون**- ق(چونان چون- çunançûn): بەو شێوەیە، هەمانجۆر.

**چنانچه**- ق(چونانچیە- çunan çih): وەکو ئەوە، هەر کاتێ.

**چنانکه**- ق(چونان کی- çunan ki): بە جۆرێ کە، بەو جۆرەی کە.

**چنبر**-ا(چەنبەر- çenber): بازنە، ئەڵقە، کەمەی دەف، چەمەرە.

**چنبر زدن**- مص. ل(چەنبەر زەدەن- çenber zeden): پەپکەخواردن.

**چنبرمینا**- ا. مر(چەنبەری مینا- çenberî mîna): ئاسمان.

**چنبره**- ص(چەنبەرە- çenbere): بازنەیی، بازنە ئاسا، چەمەرە.

**چنبرین**- ص. ن(چەنبەرین- çenberîn): بازنەیی.

**چنبک**- ا(چونبەک- çunbek): چیچکان.

**چنبه**- ص(چونبە- çunbe): گۆپاڵ، زەلام و قەڵەو.

**چنته**- ا(چەنتە- çente): هەگبە، تورەکە، توێشەبەرە.

**چند**- ق(چەند- çend): چەن، چەند.

**چندال**- ا. ص(چەندال- çendal): کەناس، کوچەماڵ.

**چنداول**- ا(چەنداڤول- çendavul): چریک، خەڵکانێک کە لە لەشکرکێشیدا لە دوای لەشکریان حەرەکەت بکەن.

**چندبر**- ا(چەندبەر- çendber): چەند لا.

**چندر**- ا(چون دەر- çunder): چەوەنەر.

**چندش**- ا. مص(چەندیش- çendiş): قێزهاتنەوە، دڵ تێک هەڵهاتن.

**چندضلعی**- ا. مر(چەند زیلئی- çend zil’î): چەند لایی.

**چندل**- ا(چەندەل- çendel): جۆرە درەختێکە، سەندەڵ، قاپ قاپ.

**چندن**- ا(چەندەن- çenden): جۆرە درەختێکە، سەندەڵ، قاپ قاپ.

**چنگ**- ا(چەنگ- çeng): چنگ.

**چنگ**- ا. ص(چەنگ- çeng): چەماوە، قولاپ.

**چنگ**- ا(چەنگ- çeng): چەنگ، جۆرە ئامێرێکی مۆسیقایە.

**چنگ**- ا(چینگ- çing): دەنووک، دەنووکی باڵداران.

**چنگار**- ا(چەنگار- çengar): شێرپەنجە، قرژاڵ.

**چنگال**- ا(چەنگاڵ- çengal): چنگاڵ، چنگ.

**چنگال خوست**- ا. مر(چەنگاڵ خوست- çengal xûst): چنگاڵ، نانەولاَی رۆن، نان تێوشەی رۆن.

**چنگالی**- ا(چەنگالی- çengalî): چنگاڵ، نان تێوشەی رۆن و شەکر.

**چنگ پشت**- ص.مر(چەنگ پوشت- çeng puşt): قەمور، کۆم، قەمبور.

**چنگک**- ا(چەنگەک- çengek): قولاپ.

**چنگل**- ا(چەنگەڵ- çengel): چنگ، چنگک.

**چنگلاهی**-ا(چەنگلاهی- çenglahî): کۆلارە، باڵندەیەکی جوجگ خۆرە.

**چنگلوک**- ص(چەنگلوک- çenglûk): چوارچنگۆڵە، کەسێ کە پەنجەی دەست و پێی خوارو خراپ بێ.

**چنگله**- ا(چەنگولە- çengule): چنگۆڵە.

**چنگ مریم**- ا.مر(چەنگی مەریەم- çengi meryem): چنگی مەریەم، جۆرە گیایەکی بۆن خۆشە.

**چنگوک**- ص(چەنگوک- çengûk):

چنگۆڵە.

**چـــنـگــولــک**- ص(چــەنــگــولــەک- çengûlek): چنگۆڵە.

**چـنـگـی**- ا. ص(چـەنـگـی- çengî): چەنگ ژەن.

**چنو**- مر(چونو- çunû): وەکو ئەو، چون ئەو.

**چنودپل**- ا. مـــــر(چین ڤـــــەد پـول- çin ved pul): پردی سیرات.

**چـنـە**- ا(چـیـنـە- çine): چـیـنـە، ئـەو دانەوێڵـــەیەی کـــە مـــریشـک لە زەوی هەڵیدەگرێتەوە.

**چنە**- ا(چەنە- çene): چەناگە.

**چنیدن**- مص. م(چینیدەن- çinîden): چنین، گوڵ چنین، میوە چنینەوە.

**چنیـــدە**- ا. مف(چنیـــدە- çinîde): چنراو.

**چنین**- ق(چونین- çunîn): بەمـجـۆرە، وەکو ئەمە.

**چو**- ق(چو- çû): وەک، کات.

**چوب**- ا(چوب- çûb): دار.

**چوب بـست**- ا. مــــــر(چـوب بـەسـت- çûb best): ئەسکەلە، کـەپری مـێـو، داربەست، قایمە مێو.

**چوب پا**- ا. مـــر(چوب پا- çûb pa): دارشەق.

**چوب پنبـــە**- ا. مـــر(چوپ پـەنبـــە- çûb penbe): تەپەدۆر.

**چوبخـــوارک**- ا. مـــر(چوب خـــارەک- çûb xarek): خۆرە، مۆریکە.

**چـوبـدار**- ا. ص(چـوبـدار- çûbdar): چێوار، چێودار.

**چـوبـدانـە**- ا.مــــــــــر(چـوب دانـە- çûbdane): درەخـتــێکی درکــاوییــە، سونجو.

**چـوبـدست**- ا. مــــــــر(چـوب دەسـت- çûbdest): دار دەست، دارعەسا.

**چـوبـدنـگ**- ا. مــــــــر(چـوب دەنـگ- çûbdeng): دنگ.

**چـوب رخـت**- ا. مــــــر(چـوب رەخت- çûb rext): چاکلا، عەلاگەی جل.

**چـــوب زدن**- مـــص. م(چـــوب زەدەن- çûbzeden): دارکـــاری کـــردن، هەڕاج کردنی شت.

**چوبزن**- ص. فـا(چوب زەن- çûbzen): داروەشێن.

**چوبک**- ا(چوبەک- çûbek): چۆغـــان، داری دەهۆڵ کوتین.

**چـوبـک**- ا(چـوبـەک- çûbek): داری بچوک، داری دەهۆڵ کوتان.

**چـــوبـــکـــاری**- ا. مـــص(چـــوبـــکـــاری- çûbkarî): دارکاری، سەرزەنشت کردن.

**چوبک اشنان**- ا. مـــر(چوبەک ئوشنان- çûbek ‘uşnan): چۆغان، ئەسپوون.

**چـوبـک زن**- ص. فـــــا(چـوبـەک زەن- çûbek zen): دەهۆڵ ژەن.

**چوبکش**- ا. مـر(چوبکەش- çûbkeş): ئامـێـرێکە بۆ بژارکـردنی دەنکی پەمـو لە پەمو.

**چوبکی**- ا. ص(چـوبەکی- çûbekî): دەهۆڵ ژەن.

**چـوبـکـین**- ا(چـوبـەکـین- çûbekîn): ئامـێـری پەمـووشـیـکردنەوەو بژارکـردنی دەنکەکەی، جیکنە، چیکەنە.

**چوب گز**- ا. مر(چوب گەز- çûbgez): دارێکی باریکی نیـوگـەزییـە بۆ پێـوانی

کوتاڵ.
**چوبنه**- ص. ن(چوبینه- çûbine): کاروانە، جۆرە مەلێکە.
**چوبه**- ا (چوبه- çûbe): تیرۆک، تیر، قامچی.
**چوبین**- ص. ن(چوبین- çûbîn): دارین.
**چوبینه**- ا(چوبینه- çûbîne): جۆرە مەلێکە بە قەد مریشکێ و دەنووکی درێژە، کاروانە.
**چوپان**- ا. ص(چوپان- çûpan): شوان، شڤان.
**چوچونچه**- ا(چوچونچه- çûçûnçe): بلوری، قوماشێکی ناسکی سپییە جلی هاوینەی لێ دروست دەکرێت.
**چوخا**- ا(چوخا- çûxa): چۆغە.
**چوخیدن**- مص. ل(چوخیدن- çûxîden): خزین، نوچدان، شەڕکردن.
**چور**- ا(چور- çûr): قرقاوڵ، جۆرە تەیرێکە.
**چوزه**- ا(چوزه- çûze): جوجک، جووجەڵە.
**چوشک**- ا(چوشک- çûşek): کۆزەی لولەدار، لولەینە، مەسینەی سواڵەت.
**چوشیدن**- مص. م(چوشیدن- çûşîdn): مژین.
**چوک**- ا(چوک- çûk): تاق تاقکەرە.
**چوک**- ا(چوک- çûk): کێر.
**چوکده**- ا(چوکده- çûkde): پێتاو.
**چوگان**- ا (چەوگان- çewgan): شەق، قاشۆ، گۆچان، گاڵۆک، گۆپاڵ.
**چوگان باز**- ا. ص(چەوگان باز- çewgan baz): قاشۆوان.
**چوگان بازی**- ا.مص(چەوگان بازی- çewgan bazî): ئەسپی مەشقدراو بۆ تەراتێنی قاشۆبازی.
**چوگک**- ا(چوگک- çûgek): جوجک، کوندەپەپو، بایەقوش.
**چول**- ص(چول- çûl): چەماوە، خوار.
**چول**- ا. ت(چول- çûl): چۆڵ، بیابان.
**چولگان**- ا(چولەگان- çûlegan): داری پاشایی، سەوڵەجان، داردەستی پاشایی.
**چوله**- ص(چەوله- çewle): کەچ، خوار، چەماوە.
**چون**- ق(چون- çûn): وەک، کاتێ، چونکە، چۆن؟.
**چون**- ا(چون- çûn): جەنجەڕ.
**چونتور**- ا(چونتور- çûntûr): جۆرە رووەکێکە.
**چونه**- ا(چونه- çûne): گونک، شونگە.
**چه**- ص(چی- çi): پیتی پەیوەندییە.
**چه**- حـ(چە- çe): ئامرازی بچوک کردنەوەیە وەک: باغ= باخچە.
**چه**- ا(چەهـ- çeh): سوکەڵەی (چاه)ە، بیر.
**چهار**- ا(چەهار- çehar): چوار، چار.
**چهار اخر**- ا. مر(چەهار ئاخور- çehar axur): ئاو، ئاگر، با، خاک.
**چهار اخشیج**- ا. مر(چەهار ئاخشیج- çehar axşîc): چوار رەگەزی: ئاو، ئاگر، با، خاک.
**چهاراس**- ا. مر(چەهارئاس- çehar as): چوار ئاس.
**چهارایین**- ا.مر(چەهار ئایین- çehar ayîn): چوار مەزەب، چوار

مەزەبی سونیان: حەنەفی، مالکی، شافعی، حەنبەلی.
**چهارایین**- ا. مر(چەهار ئایین- çehar ayîn): خێوەتی گەورەی چوارگۆشە.
**چهارایینه**- ا.مر(چەهار ئاییینە- çehar ayîne): جۆرە جل و بەرگێکی کۆنی جەنگییە.
**چهارابرو**- ا. مر(چەهار ئەبرو- çehar ebrû): کوڕێک کە تازە خەتی دابێ.
**چهارارکان**- ا. مر(چەهار ئەرکان- çehar erkan): چوارنکال، چوارلا، رۆژهەلات، رۆژئاوا، باکور، باشور.
**چهاربالش**- ا.مر(چەهار بالیش- çehar baliş): چوار بالیف، تەخت، کورسی، چوارنکال.
**چهاربر**- ا. مر(چەهار بەر- çehar ber): چواربەر، چوارگۆشە.
**چهاربند**- ا. مر(چەهار بەند- çehar bend): چوار جومگە، هەردوو ئانیشک و هەردوو ئەژنۆ.
**چهاربندی**- ا. مر(چەهار بەندی- çehar bendî): تورەکە، کۆڵەپشتی.
**چهاربیخ**- ا. مر(چەهار بیخ- çehar bîx): چوار رەگەزی: ئاو، ئاگر، با، خاک، چوار سروشت.
**چهارپا**- ا. مر(چەهارپا- çeharpa): چوارپێ، ولاخ.
**چهارپاره**- ا. مر(چەهارپارە- çehar pare): چەقەوانە، جۆرە سەمایەکی کۆنە، جۆرە گوللەیەکی تفەنگە.
**چهارپایه**- ا. مر(چەهارپایە- çehar paye): کورسی بچووک، تەپلەک، چوارپایە.
**چهارپهلو**-ا. مر(چەهار پەهلو- çehar pehlû): چوارپالوو، تۆکمە، قەلەو، زگ زل، ورگن، تەپالدان.
**چهارتخم**- ا. مر(چەهار توخم- çehar tuxm): جۆرە دەرمانێکە بۆ کۆکە و ئازاری سینگ.
**چهارتکبیر**- ا. مر(چەهار تەکبیر- çehar tekbîr): تەرک کردنی دنیا، نوێژی مردوو.
**چهارجوی**- ا. مر(چەهار جوی- çehar cûy): چوار رووباری بەهەشتە گوایە ئاوی سازگارو هەنگوین و شیرومەی پێدا دەڕوات.
**چهارجهت**- ا. مر(چەهار جیهەت- çehar cihet): چوارنکال: رۆژهەلات، رۆژئاوا، باکوور، باشوور.
**چهارچرخه**- ا. مر(چەهار چەرخە- çehar çerxe): گالیسکەی چوار تایە.
**چهارچوب**- ا. مر(چەهار چوب- çehar çûb): چوارچێوە.
**چهارده**- ا(چەهاردەه- çehardeh): چواردە.
**چهارده معصوم**- ا. مر(چەهاردە مەئسوم- çehardeh me'sûm): پێغەمبەرو فاتیمەی کچی و دوازدە ئیمامی شیعەیان.
**چهاردیواری**- ا.مر(چەهار دیڤاری- çehar dîvarî): چوار دیواری، مال.
**چهارراه**- ا. مر(چەهار راه- çehar rah): چوار رێیان.
**چهارزانو**- ا. مر(چەهارزانو- çehar zanû): چوارمشقی،

چوارمەشقی.

**چهارسمت**- ا.مر(چەهار سەمت- çehar semt): چوارلا، چوارنکال، سەر، خوار، چەپ، راست.

**چهارسو**- ا. مر(چەهار سو- çehar sû): چوار رێ، چوار ڕێی میان بازاڕ.

**چهارسوق**- ا. مر(چەهار سوغ- çehar sûx): دنیا، چوار ڕێیانی نێوان بازاڕ.

**چهارشاخ**- ا.مر(چەهار شاخ- çehar şax): شەنە.

**چهارشانه**- ص. مر(چەهار شانە- çehar şane): چوار شانە، کەتەو قەڵەو، تۆکمە.

**چهارشنبه**- ا. مر(چەهار شەنبە- çehar şenbe): چوارشەممە.

**چهارشنبه سوری**- ا.مر(چەهار شەنبە سوری- çehar şenbe sûrî): چوارشەممە سورێ، جۆرە جەژنێکە.

**چهارصد**- ا.مر(چەهار سەد- çehar sed): چوار سەد.

**چهارضرب**- ا. مر(چەهار زەرب- çehar zerb): جۆرە ساز ژەنینێکە.

**چهارضلعی**- ا.مر(چەهار زیلئی- çehar zil'î): چوارلا.

**چهارطاق**- ا. مر(چەهارتاغ- çehar tax): جۆرە خێوەتێکی چوارگۆشەیە. گومەز یان میچی لەسەر چوار پایە ڕۆنراو.

**چهارطبع**- ا.مر(چەهار تەبع- çehar teb'): چوار سروشت، گەرمی و ساردی و وشکی و تەڕی.

**چهارعمل اصلی**- ا.مر(چەهار ئەمەلی ئەسڵی- çehar emelî eslî): کۆکردنەوە، لێ دەرهێنان، لێکدان، دابەشکردن.

**چهارعنصر**- ا. مر(چەهار ئونسور- çehar 'unsûr): چوار سروشت، چوار رەگەزی: ئاو، ئاگر، با، خاک.

**چهارفصل**- ا. مر(چەهار فەسل- çehar fesl): چوار وەرزی ساڵ: بەهار، هاوین، پایز، زستان.

**چهارقب**- ا. مر(چەهار غەب- çehar xeb): جۆرە جلێک بووە کە لە کۆنا پاشایانی ئێرانی و توران لە بەریان دەکرد.

**چهارقل**- ا. مر(چەهار غول- çehar xul): چوار سورەتی قورئانی پیرۆزن کە هەر یەکێکیان بە وشەی (قُل) دەست پێدەکات: (قُل هو الله، قُل اعوذ برب الفلق، قُل اعوذ برب الناس، قُل یاأیها الکافرون).

**چهارگامه**- ا. مر(چەهارگامە- çehar game): ئەسپی خۆشبەز، ئەسپی رەهوان، رەهواڵ، خۆشڕۆ.

**چهارگاه**- ا(چەهارگاه- çehar gah): چوارگا، ئاهەنگێکی مۆسیقییە.

**چهارگل**- ا. مر(چەهارگول- çehar gul): جۆشانەی گوڵی وەنەوشەو پەنیرەک و کولەکەو نیلوفەر بۆ دەرمان.

**چهارگل**- ا.مر(چەهار گول- çehar gul): چوارگوڵ، چوارگۆشە.

**چهارگوش**- ا. مر(چەهار گوش- çehar gûş): چوارگۆشە.

**چهـارگـوشـه**- ا. مـر(چەهارگـوشـە- çehar gûşe): چوارگۆشە، چوارقوڕنە.
**چهـارگـوشی**- ا.مـر(چەهارگـوشی- çehar gûşî): گـۆزەی چوار قـوڵفـە، سوراحی چوار قوڵفە.
**چهـارگـوهر**- ا. مـر(چەهار گـەوهەر- çehar gewher): چوارسروشت، چوار جەوهەری ئاو، ئاگر، با، خاک.
**چهـارمـادر**- ا. مـر(چەهار مـادەر- çehar mader): چوار سروشت.
**چهـارمـذهب**- ا. مـر(چەهار مـەزهەب- çehar mezheb): چوار مـەزەبی سونییان: حەنەفی، مالکی، شافیعی، حەنبەلی.
**چهارمضراب**- ا.مرز(چەهار میزراب- çehar mizrab): جـۆرە ئاهەنگێکی مۆسیقایە.
**چهـارمـغـز**- ا. مـر(چەهار مـەغـز- çehar mexz): کاکڵە گوێز و فندق و بادەم و پستە.
**چهـارمـوج**- ا. مـر(چەهار مـەوج- çehar mewc): تۆفـان، گـێـژاو، گێژەنگ.
**چهـارمـیخ**- ا. مـر(چەهار مـیخ- çehar mîx): چوار مـێـخـە، جـۆرە ئەشکەنجەیەکە.
**چهـارنعل**- ا. مـر(چەهار نەئل- çehar ne’l): چوار ناڵە.
**چهـارنفس**- ا. مـر(چەهار نەفس- çehar nefs): چوارنەفس، نەفـسی ئەمارە، نەفسی لەوامە، نەفسی ملهمە، نەفسی مطمئنە.
**چهـاروهفت**- ا. مـر(چەهارو هەفت- çehar u heft): ئامـاژەیە بۆ چوار سروشت و حەوت هەسارە.
**چهـارهنگام**- ا. مـر(چەهار هەنگام- çehar hengam): چوار وەرزەی ساڵ.
**چهـاریـار**- ا. مـر(چەهار یار- çehar yar): چواریار، چوار خەلیفەی راشدین.
**چهـاریـک**- ا. مـر(چەهار یەک- çehar yek): چواریەک، چارەک.
**چهـچـهـه**- ا(چەه چەهە- çehçehe): چەهچـەهە، ئاوازی بولبـول و هەمـوو مەلێکی دەنگخۆش.
**چهر**- ا(چیهر- çihr): چارە، روخسار، روو.
**چهـرەپرداز**- ص. فـا(چیـهـرە پەرداز- çihre perdaz): نیـگـارکـێش، سورەتگەر.
**چهل**- ا(چیـهل- çihl): چل، ژمـارەی چل.
**چهل بند**- ا.مـر(چیـهل بەند- çihl bend): چل بەند، جـۆرە جلێکی تایبەتی سەماچیانە.
**چهل تاج**- ص. مـر(چیـهل تاج- çihl tac): چل تاج، کـەڵەشێری پۆپنە پان و گەورە.
**چهل تکه**- ا. مـر(چیـهل تیککە- çihl tikke): چل پارچە، پۆشاکێک کە لە سـەرە پارچەی رەنگاو رەنگ دروست کرابێ.
**چهل چراغ**- ا. مـر(چیـهـیل چراغ- çihil çirax): چلچـرا، سـورەیا، پەروین.
**چهل صـبح**-ا. مـر(چیـهل سـوبح-

çihl subh): چل رۆژەی تایبـــەت بە عیبادەت.
**چهل کلیـد**- ا. مـر(چیـهل کلیـد- çihl kilîd): چل کلیل، بڕوانە (چل کلید).
**چهله**- ا(چیهله- çihle): چللە.
**چی**- ا(چی- çî): سوکەڵەی (چیز)ـە کە دەکاتە شت.
**چی**- (چی- çî): چی؟ ئامرازی پرسیار.
**چی**- ت(چی- çî): پاشگرە، ئاوەڵناوەی بکەری پێ دروست دەکـــــرێت وەک: پینەچی.
**چیالک**- ا(چیالەک- çîyalek): تووی فەرِەنگی.
**چیت**- ا(چیت- çît): جۆرە کـوتاڵێکە، چیت.
**چیتــا**- ا. هن(چیتـــا- çîta): تولّە پڵنگ، یوز پڵنگ.
**چیچک**- ا(چیچەک- çîçek): خاڵ.
**چیـــدن**- مص. م(چیـــدەن- çîden): چنین، چنینەوەی میـوەو گـوڵ و...، کـەسێ کە میوە بچنێ.
**چیننده**- ا. فـا(چینەندە- çînende): میوەچنەوە.
**چیـده**- ا. مف(چیـدە- çîde): گـوڵ یان میوەی چنراو، هەڵبژاردە.
**چیر**- ص(چیر- çîr): زاڵ، سەرکەوتوو.
**چیـره**- ص(چیـرە- çîre): زاڵ، دلاوەر، بالادەست.
**چیره**- ا(چیره- çîre): مێزەر، دەرسۆک، شاشک.
**چیـــرەدست**- ص. مــر(چیـــرە دەست- çîre dest): کـــارامــــە، لێـــهـــاتوو، هونەرمەند، دەست رەنگین، بالا دەست.

**چیز**- ا(چیز- çîz): شت، هەر شتـێکی بێ گیان.
**چیـزک**- ا(چیــزەک- çîzek): ژیژک، شتۆکە.
**چیــزو**- ا(چیــزو- çîzû): ســیــخـــوڕ، سوچەر.
**چیست**- (چیـست- çîst): چیــیـە؟ ئامرازی پرسیار.
**چیستـان**- ا. مر(چیستـان- çîstan): مـەتەڵ، تشـتـان، ئەمـە چیـیـەو چی پێ دەڵێن، چەوچە.
**چیغ**- ا(چیغ- çîx): چیغ، مـــاڵـمـــان ماڵاوسێ چیغمان جودایی.
**چیـلان**- ا(چیـلان- çîlan): شـیـلان، عەنناب.
**چیلان**- ا(چیلان- çîlan): ئاسنجاوی وەک قـفـڵ و کلیل و ئەڵقـەرێزی دەرگـاو کێردو چەقۆ.
**چیـــــلانگر**- ا. ص(چیـــــلانگەر- çîlanger): کلیل و قفڵساز.
**چیـمکانی**- ا(چیـمکانی- çîmkanî): جۆرە رووەکێکە.
**چین**- ا(چین- çîn): قەد، نوشت.
**چینچیـلا**- ا(چینچیـلا- çîn çîla): جۆرە سمۆرەیەکە، گیانلەبەرێکە لە سمۆرە دەچێت و پێستەکەی زۆر بەقیمەتە.
**چین خـــوردن**- مص. ل(چین خـــوردەن- çîn xûrden): لۆچ بوون، چرچ بوون.
**چین خــــورده**- ا. مف(چین خــــوردە- çîn xûrde): لۆچ بوو، چرچ بوو.
**چـــین دادن**- مـــص. م(چـــین دادەن- çîn daden): قـەدکـردن، قـەدو نوشت کرن.

**چیندار**- ص. مــر(چین دار- çîndar): چیندار.

**چینود**- ا(چین ڤــەد- çînved): پردی سیرات.

**چیــنــە**- ا(چــیــنــە- çîne): چــیــنــە، چینەکردنی مریشک.

**چینە**- ا(چینە- çîne): مـــۆرە، چینە دیواری قوڕ.

**چینە**- ا(چینە- çîne): چین، توێژ.

**چینەدان**- ا. مر(چینەدان- çîne dan): چیکڵدانەی مریشک.

**چینەشناسی**- ا.مص(چینەشـــیناسی- çîne şinasî): جیولوجی.

**چینی**- ص.ن(چینی- çînî): خـــەڵکی چین، دەستکردی چین.

**چینی**- ا(چینی- çînî): قـــاپی چینی، فەخووری، جۆرە سواڵەتێکی زۆر باشە.

# ح

**ح – حر (ح– H):**
پیتی هەشتەمی ئەلیفبای فارسییە بە(ها) دەخوێنرێتەوە، بەحەساوی ئەبجەد دەکاتە (٨). ئەم پیتە لە وشەیێن رەسەنی فارسیدا بەدی ناکرێت، تایبەتە بەو وشانەی کە لە عەرەبییەوە وەرگیراون.
**حائر**- ا. فا، ع(هائیر- hair): سەرسام، سەرگەردان، حەیرماو، واق ورماو، داماو، سەرگەشتە.
**حائر**- ا. ع(هائیر- ha’ir): شوێنی کۆبوونەوەی ئاو، گۆلاوی باران.
**حائره**- ا. فا. ع(هائیره- ha’ire): ژنی سەرگەردان، حەیرماو، سەرسام، سەرگەشتە، داماو.
**حائری**- ص.ن. ع(هائیری- ha’irî): شوێنی مەزاری حەزرەتی حوسێن.
**حائز**- ا. فا. ع(هائیز- ha’iz): دارا، وەدەست هێنەر، خودان.
**حائض**- ا. فا.ع(هائیز- ha’iz): ژنی حەیزدار، بێ نوێژ.
**حائط**- ا. ع(هائیت- ha’it): دیوار.
**حائک**- ا.فا. ع(هائیک- ha’ik): جۆلا، شاڵباف.
**حائل**- ص. ع(هائیل- ha’il): بەرهەڵست، نەزۆک، رەنگ گۆڕاو.
**حابس**- ا. فا. ع(هابیس- habis): چەپسکەر.
**حابط**- ا. فا. ع(هابیت- habit): بەتاڵ، فاسید.
**حابل**- ص. ع(هابیل- habil): جادوگەر، سیحرباز، تان، رایەڵ، راوچی، داونەرەوە.
**حاتم**- ص. ع(هاتیم- hatim): داوەر، قازی، حاکم، قەلەڕەش، ناوی کابرایەکی سەر بە تیرەی تەی بووە کە لە دلاوایی و جوامێری و پیاوەتیدا بەناوبانگ بووەو لە دەوربەری سەدەی شەشەمی زایینیدا ژیاوە..
**حاج**- ا. فا(هاج- hac): کەسێ کە حەجی کردبێ، حاجی، کەسێک زیارەتی ماڵی خوای لە مەکە کردبێ.
**حاجات**- ا. ع(هاجات- hacat): پێداویستیان.

**حاجب**- ا. ص. ع(هاجیب- hacib): برۆ، دەرگاوان، پەردەداری بارەگای پاشا، بەرهەڵست، لە زانستی جوانکاریدا بەو وشەیە دەڵێن کە بەر لە قافیەی ئەسڵی دووبارە دەبێتەوە.
**حاجب ماوراء**- (هاجبی ماڤەرا- hacibi mavera): هەر شتێک لەو دیوییەوە هیچ نەبینرێ.
**حاجت**- ا. ع(هاجەت- hacet): زەرورەت، پێویستی، ئومێد، ئارەزوو.
**حاجت روا**- ص.مر.ع(هاجەت رەڤا- hacet reva): ئەوەی پێویستی جێبەجێ کرابێ.
**حاجتمند**- ص. مر. ع(هاجەت مەند- hacet mend): حەوجەمەند، ئحتیاج.
**حاجتومند**- ص. مر(هاجەتومەند- hacetû mend): حەوجەمەند، ئحتیاج، چاو لەدەست.
**حاجر**- ا. فا.ع(هاجیر- hacir): بەرهەڵست، زەوییەک ناوەندی چاڵ و دەوروبەری بەرزبێ.
**حاجز**- ا. فا. ع(هاجیز- haciz): لەمپەر، تەگەرە، کۆسپ.
**حاجم**- ا. فا. ع(هاجیم- hacim): خوێن بەردەر، حەجامات کێش.
**حاجه**- ا. فا. ع(هاجە- hace): ژنێ کە زیارەتی کابەی کردبێ.
**حاجی**- ص.فا(هاجی- hacî): کەسێک چووبێتە حەج، حاجی.
**حاجی فیروز**- ا. مر. ع. فا(هاجی فیروز- hacî fîrûz): لیبۆک، کەسێک کە دەموچاوی خۆی رەش و جلی سور لەبەر بکات و بە چەند رۆژێک بەر لە نەورۆزو تا دوای ئاهەنگێن نەورۆز بە ئەداو ئەتوارو گۆرانی خەڵکی شاد بکاو بێنێتە پێکەنین.
**حاجی لک لک**- ا. مر(هاجی لەک لەک- hacî lek lek): حاجی لەقلەق، باڵندەیەکی دەنوک و لاق درێژە.
**حاجیه**- ص(هاجییە- hacîye): ئافرەتی حەجکردوو.
**حاد**- ص. ع(هاد- had): تون و تفت، تیژ، بڕندە.
**حادث**- ا. فا. ع(هادیس- hadis): تازە داهاتوو، نۆباو.
**حادثات**- ا. ع(هادیسات- hadisat): پێشهاتان، رووداوان، قەوماوان.
**حادثه**- ا. فا. ع(هادیسە- hadise): نۆبەرە، نۆباو، تازە داهاتوو، رووداو، بەڵا، پێشهات.
**حادثه جو**- ص. فا- ع.فا(هادیسەجو- hadise cû): سەرکێش، چاو نەترس، سەر بەگۆبەنگ، کەسێ کە عەوداڵی رووداوی تازەیە، جەربەزە.
**حادثه زای**- ص.فا- ع.فا(حادیسەزای- hadise zay): رووداو خوڵقێن.
**حاده**- ص. ع(هاددە- hadde): تون، توند، تیژ.
**حادی**- ص.فا-ع(هادی- hadî): وشترەوان، کەسێک کە بەدەم گۆرانی و ئاوازەوە وشتران بڕانێ.
**حاذق**- ا.فا- ع(هازیغ- hazix): کارامە، لێهاتوو، زیرەک، شارەزا.
**حار**- ص- ع(هارِ- har): گەرم.
**حارث**- ا.فا- ع(هاریس- haris): جووتیار، وەرزێر، جووتێر، جووتکار، جوت بەند.

**حـــارس**- ا.فــا- ع(هاریس- haris): پاسەوان، حەرەس، نیگابان.

**حارە**- ص. ع(هارە- hare): گەرم.

**حـــازم**- ا.فـــا- ع(هازیم- hazim): هوشیار، بەحەزم، دورئەندێش، دووربین.

**حازی**- ص.ع(هازی- hazî): فاڵگرەوە، دەســـتگرەوە، کـــەسی زۆر شـــارەزا لە کارێکدا.

**حـــــاس**- ا.فـــــا- ع(هاس- had): هەستیار، هەستکەر.

**حـاسب**- ا.فـا- ع(هاسیب- hasib): ژمێریار، حیسابزان.

**حـاسـد**- ا.فـا- ع(هاسیـد- hasid): حەسود، ئێرەیی بەر.

**حـاسـر**- ا.فـا- ع(هاسیـر- hasir): ســەرکــۆت، ســەر رووت، ژنی ســفــور، دوئێلکاری بێ خودەو زرێ.

**حاسە**- ا.فا-ع(هاسە- hase): هەست، هەر یەکـێـک لە پێنج هەســتــەی دیتن، بیستن، بۆنکردن، چەشتن، لێسوین.

**حـاشـا**- ق. ع(هاشـا- haşa): حـاشـا، هەرگیز، نەخێر، نا.

**حـاشـاک**- ق. ع(هاشـاک- haşak): دوور لە تۆ، حاشا لە تۆ.

**حـــاشـــالـک**- ق. ع(هاشـــالەک- haşalek): دوور لە تۆ.

**حـــاشـــاللە**- ع(هاشـــالیـللاه- haşa lillah): پەنا بە خوا.

**حـاشـاوکـلا**- ع(هاشـاڤـەکـەللا- haşa vekella): بە هیچ جـــۆرێ نە، هەرگیز.

**حـــــــاش لـلـە**- ع(هـاش لـیـلـلاه- haşe lillah): پەنا بەخوا.

**حـاشـیـە**- ا.ع(هاشـیـیـە- haşîye): پەراوێز، پەراوێزی جل، کـتـێب، دەست و پێوەندو کەسوکار.

**حـاشـیـەبندی**- ا.مص- ع.فـا(هاشـیـیـە بـەنـدی- haşîye bendî): پـەراوێـز دروست کـــردن، گـــوڵکاری چوار دەوری باخچە.

**حاشیەدار**- ص.مر- ع.فا(هاشیـیەدار- haşîye dar): پەراوێزدار.

**حـاشـیـەدوزی**- ا.مص- ع.فـا(هاشـیـیـە دوزی- haşîye dûzî): پەراوێز پێـــوە درونی جل و شتی لەو بابەتە.

**حاشیـەنشین**- ص.فـا(هاشیـیـە نیـشین- haşîye nişîn): کەنارەنشین، کەسێک کە لە قەراخی مەجلیسەوە دانیشێت.

**حاشیە نویس**- ص.فا(هاشیـیە نوڤیس- haşîye nuvîs): حـــاشـــیـــەنووس، پەراوێزنـووس، کـەسـێک کـە پەراوێز بۆ کتێبێک بنووسێت و ماناو دەستەواژەکانی روون بکاتەوە.

**حـاصـد**- ا.فـا- ع(هاسیـد- hasid): درووێنەوان، درەوکەر.

**حاصر**- ا.فا- ع(هاسیر- hasir): هەر شتێ ببێتە کۆسپ، ژمێریار.

**حـاصل**- ا.فـا- ع(هاسـیـل- hasil): بەروبووم، سـوود، ئەنجـام، بەدەست هاتوو، دەرامەت.

**حـاصل جـمع**- ا.مـر(هاسـیلی جـەمئ- hasili cem’): ئەنجـامی کـۆکـردنەوەی دوو ژمارە یان زیاتر.

**حـاصلخـیـز**- ص. مـر(هاسـیل خـیـز- hasil xîz): زەوی بـــە پـــیـــت، بـــە بەروبووم.

**حاصل ضرب**- ا.مر(هاسیلی زەرب- hasili zerb): ئەنجامی لێکدانی دوو ژمارە یان زیاتر.
**حاصل کلام**- ا.مر(هاسیلی کەلام- hasili kelam): خولاسەی کەلام، پوختەی قسە.
**حاصل مصدر**- ا.مر(هاسیلی مەسدەر- hasili mesder): وشەیەکە کە مانای چاووگ بدات وەک: بەدی، چاکی.
**حاصله**- ا.فا- ع(هاسیلە- hasile): ئەنجام، دەستکەوت، قازانج، بەروبووم.
**حاصن**- ا.فا- ع(هاسین- hasin): ژنی داوێن پاک، ژنی خواناس و مێردار.
**حاضر**- ا.فا- ع(هازیر- hazir): ئامادە، حازر، ئێستا، شارنشین.
**حاضرالذهن**- ص.مر(هازیروز زیهن- haziruzzihn): زەین روون.
**حاضرجواب**- ص.مر(هازیر جەڤاب- hazir cevab): حازر وەلام، شۆخ، سوعبەتچی، قۆشمە، دلێر.
**حاضرغایب**- (هازیر غایب- hazir xayîb): بەجەستە حازرو بەهۆش و هەست غایب، جیاکردنەوەی حازرو غایب.
**حاضره**- ا.فا- ع(هازیرە- hazire): شار، شاری گەورە.
**حاضری**- ا.ص- ع(هازیری- hazirî): حازری، ئەوەی هەیە، خۆراکی سادە کە کولانی نەوێ وەکو نان و پەنیر.
**حاضریراق**- ص.مر- ع.ت(هازیر یەراغ- hazir yerax): حازرو ئامادە، تەیار، لەسەرپێ.
**حاضنه**- ا.فا-ع(هازینە- hazine): دایەن، پەرستار، ئافرەتێ کە پەروەردەکردنی منداڵی لە ئەستۆیە.
**حاطب**- ا.فا- ع(هاتیب- hatib): دارکەر، چیلکەو دارکەر.
**حاطب اللیل**- ا.فا-مر(هاتیبول لەیل- hatibul leyîl): دارکەری شەو، هەڵەوەڕی هەرزەوێژ.
**حافد**- ا.ص- ع(هافید- hafid): نەوە، خزمەتکار، نەڤی.
**حافر**- ا.فا- ع(هافیر- hafir): چاڵ هەڵکەن، سمی وڵاخ، قاپقاپ.
**حافر البغل**- ا.مر- ع(هافیرول بەغل- hafirul bexl): سمی هێستر، جۆرە رووەکێکە.
**حافر المهر**- ا.مر- ع(هافیرول موهر- hafirul muhr): سمی جوانوو، جۆرە رووەکێکە.
**حافظ**- ا.فا- ع(هافیز- hafiz): پاسەوان، حافیز، ئەوەی قورئانی لەبەر بێ.
**حافظه**- ا.فا- ع(هافیزە- hafize): زەین، هۆش، زاکیرە، یاد.
**حافل**- ا.فا- ع(هافیل- hafil): پڕ، زۆر، شوێنی قەرەباڵغ، مەمکی پڕ شیر.
**حافی**- ص-ع(هافی- hafî): پێ پەتی، پێ خاوس.
**حاق**- ا.فا- ع(هاغ- hax): حەقیقەت، هەقیقەتی کار، ناوەڕاست، ناوەند.
**حاقد**- ا.فا- ع(هاغید- haxid): کینە لە دڵ، رقن، بەدخوا، بەدنیاز.
**حاقه**- ا.فا- ع(هاغە- haxe): قیامەت، ناوەند، بەلای بێ چەندوچوون.
**حاکم**- ا.فا-ع(هاکیم- hakim):

فــەرمــانده، فــەرمــانڕەوا، داوەر، قــازی، حاکم.
**حاکمیت**- مص. جع- ع(هاکمییەت- hakimîyet): حـــوکـــمــــڕانی، فەرمانڕەوایی.
**حاکمین**- ا.ع(هاکمین- hakimîn): داوەران.
**حــاکی**- ا.فــا- ع(هاکی- hakî): حیکاتەتخوان.
**حال**- ا.فا- ع(هال- hal): ئێــستــا، چۆنیەتی شتێک، حاڵ و ئەحواڵ.
**حال**- ا.فا- ع(هال- hal): ئاوێتەبوو.
**حــالا**- ق- ع(هالا- hala): نهــو، ئێستا، هەنوکە، ڤی گاڤێ، نها، ئیرەنگە.
**حــالات**- ا.ع(هالات- halat): وەزع و حاڵان، ڕووداوان، حاڵ و ئەحواڵان.
**حــالب**- ا.فــا- ع(هالیب- halib): مەڕدۆش، بێریڤان، میزەڕۆ.
**حــال بحــال شــدن**- مص.ل(هال بیــهــال شودەن- hal bihal şuden): گۆڕان، گــۆڕان لە حــاڵێکەوە بۆ حــاڵێکی دی، دۆخگۆڕکێ.
**حالبی**- ا.ع(هالیبی- halibî): جـۆرە ڕووەکێکە.
**حالت**- ا.ع(هالەت- halet): حـالەت، چۆنیـــەتی، وەزع و حـــاڵ، خـــۆشی، سەرمەستی، مەرگ.
**حالق**- ا.فا- ع(هالیغ- halix): نورە، دارو.
**حالق الشعر**- ا.مر- ع(هالیغولشەئر- halixuş şe'r): سەرتاش،مێوی کێوی.
**حــالک**- ص. ع(هالیک- halik): تاریک، زۆر تاریک، زۆر رەش، سامناک، ترسناک.
**حــال کــردن**- مص. ل(هال کــەردەن- hal kerden): حـــاڵ لێـــهـــاتن، هاتنەجۆش و خرۆش.
**حــال گــردان**- ص.فــا- ع(هال گــەردان- hal gerdan): بگۆڕی حــاڵ، خــوا، گۆڕینی حاڵی کەسێک.
**حــالی**- ا.فا-ع(هالی- halî): ژنێ کـە خۆی بە زێڕو زیوی رازانبێتەوە، ژنی خشڵ پۆش.
**حــالی**- ق(هالی- halî): ئێــســتــا، هەنووکە.
**حــالیــا**- ق- ع(هالیــا- halîya): هەر ئێستا، ئائێستا، نهوو، بەپەلە.
**حــالی شــدن**- مص.ل(هالی شــودەن- halî şuden): تێگەیـیــشـتن، حــاڵـی بوون، دەرک کردن، فامکرن.
**حــالی کــردن**- مص. م(هالی کــەردەن- halî kerden): تێ گــەیاندن، حــاڵـی کردن.
**حــامــد**- ا.فــا- ع(هامــیــد- hamid): شوکرانەبێژ، سەناگۆ، سوپاسگوزار.
**حــامض**- ا.فــا- ع(هامــیــز- hamiz): ترش، تامی ترش.
**حامل**- ا.فا- ع(هامیل- hamil): کۆڵ هەڵگر، ژنی دوو گیان.
**حامله**- ا.فــا- ع(هامــیله- hamile): ژنی سکپڕ، ژنی دوو گیان، ئاوس، ئاڤس.
**حــامی**- ا.فـــا- ع(هامی- hamî): پشـــتـــیـــوان، پـارێزەر، یـاوەر، لایەنگر، پاسەوان.
**حـــامی**- ص.ن- ع(هامی- hamî): نەوەێن حامی کوڕی نوح.

**حـــــــانات**- ا.ع(هانات- hanat): مەیخانان.

**حانوت**- ا.ع(هانوت- hanût): دوکان، موغازە.

**حـانه**- ا.ع(هانە- hane): مـەیخـانە، دوکانی مەیفرۆشی.

**حـاوی**- ا.فـا-ع(هاڤی- havî): جـێی شتان.

**حب**- ا.ع(هوب- hub): مــەحــەبەت، ئەشق، خۆشەویستی، دڵداری، ئەڤین.

**حب**- ا.ع(هوب- hub): کــوپەی ئاو.

**حب**- ا.ع(هەب- heb): دانەوێڵـــــە، حەبی سەریەشە.

**حـبـائک**- ا.ع(هەبائیک- heba'ik): مـەداری نێـوان ئەسـتـێـران، ڕێگەی نێـوان لەلان.

**حبائل**- ا. ع(هەبائیل- heba'il): داو، بەند، قەید.

**حـبـاب**- ا.ع(هوباب- hubab): بڵق، بڵقی ئاو.

**حـــبــــاب**- ا.ع(هوباب- hubab): دۆستایەتی، خۆشەویستی، دێو، شەیتان، مار.

**حـبــات**- ا.ع(هەبیــات- hebbat): دانەوێڵە.

**حـبـاحب**- ا.ع(هوباهیب- hubahib): گـوڵە ئەسـتـێـرە، مـێـرویەکـە بە شـەوان دەبریسکێتەوە.

**حـــبــــاری**- ا.ع(هوبارا- hubara): چێرگ، جۆرە باڵندەیەکە.

**حبال**- ع(هیبال- hibal): کندر، حەبل، ڕست، گوریس، پەت.

**حـبــال**- ص. ع(هەبیــال- hebbal): حەبلفرۆش، حەبلساز. پەتساز.

**حب الاس**- ا.مـــر- ع(هەبیـــول ئاس- hebbul as): دەنکی مۆرد.

**حب الاثل**- ا.مـــر- ع(هەببول ئەسل- hebbul esl): جـۆرە درەخـتـێکە لە دارگەز دەچێ.

**حب البـــان**- ا.مــــر-ع(هەببول بان- hebbul ban): دەنکی درەختی بان.

**حب البـطم**- ا.مـــــر-ع(هەببول بەتم- hebbul betm): قەزوان.

**حب البلسان**- ا.مر-ع(هەببول بەلسان- hebbul belsan): جۆرە درەختێکە.

**حب الخـروع**- ا.مـر-ع(هەببول خـرو ء- hebbul xurû'): گــــــــەرچەک، گەنەگەرچەک.

**حب الرشـاد**- ا.مـر- ع(هەببول ڕەشـاد- hebbul reşad): تۆوی خەردەل، بەری خەردەل، تۆوی خەرتەلە.

**حب الشــوم**- ا.مــر-ع(هەببول شـــوم- hebbul şûm): جۆرە درەختێکە.

**حب الـصـنوبـر**- ا.مـــــــر- ع(هـەببـول ســـەنەوبەر- hebbul senewber): بەری داری سنۆبەر.

**حب العـرعـر**- ا.مـر(هەببول عـەرعـەر- hebbul erer): مــیـــوەی درەخـــتـی عەرعەر.

**حب العصفر**- ا.مر- ع(هەببول ئوسفور- hebbul 'usfur): تۆوی کاجیرە.

**حب العلق**- ا.مـــر- ع(هەببول ئەلەغ- hebbul ele¨x): توترک.

**حب الغــار**- ا.مــر- ع(هەببول غـــار- hebbul xar): میوەی درەختی غار.

**حب الفـقـد**- ا.مـر- ع(هەببول فـەغـد-

hebbul fexd): جـــۆرە دەوەنێکە، بیبەری کێوی.
**حب المحلب**- ا.مر- ع(هەببول مەهلەب- hebbul mehleb): جۆرە درەختێکە.
**حب الملوک**- ا.مـر-ع(هەببول مـولوک- hebbul mulûk):
**حباله**- ا.ع(هیـبـالە- hibale): داو، قەید، بەند.
**حبحاب**- ص.ع(هەبهاب- hebhab): پیـاوی کـوڵە باڵای ناشـیـرین، بەدخـوو، گرگن.
**حبذا**- ع(هەببەزا- hebbeza): خۆزیا، بریا، کاشکێ.
**حبر**- ا. ع(هیـبـر- hibr): مـەرەکـەب، جەوهەر.
**حبر**- ا. ص- ع(هەبر- hebr): زانا، چاکـەکـار، پێـشـەوای ئاینی، سـەرۆکی رەبەنان لە لای جولەکە.
**حبر**- ا. ع(هیـبـر- hibr): شـادمـانی، نیعمەت.
**حبر**- ا.ص- ع(هەبیـر- hebir): جۆرە قوماشێکە.
**حبرج**- ا. ع(هەبرەج- hebrec): جۆرە مراوییەکە لە میسر زۆرە.
**حبس**- مص. ع(هەبس- hebs): گرتن، زندانی کردن.
**حبس ابد**- ا.مـــر- ع(هەبسی ئەبەد- hebsi ebed): حەپسی هەتا هەتایی.
**حبس با اعمالی شاقه**- ا.مـر (هەبس با ئـەئـمـــالی شـــاغـــە- hebs ba e'malî şaxe): جـــۆرە حـەپـسـێکە زندانی دەبێ لە مـــاوەی مەحکومییەکەیدا کاری دژوار ئەنجام بدا.
**حبس تأدیبی**- ا.مـر(هەبسی تەئدیبی- hebsi te'dîbî): حەبسی جینایات کە مـاوەکـەی لە چەند مـانگێکەوە تا سێ ساڵە.
**حبس تکدیری**- ا. مر(هەبسی تەکدیری- hebsi tekdirî): حەبسە لەسەر شتی بچوک ماوەکەی ٢ تا ١٠ رۆژە..
**حبس البول**- ا.مـر(هەبسـول بەول- hebsul bewl): میزگیران.
**حبس الطمث**- ا.مر- ع(هەبسول تەمس- hebsul tems): حـەیزنەبوونی ژن، عادەنەبوونی ژنان، حەیزگیران.
**حبسخانه**- ا.مـر(هەبسـخـانە- hebsxane): حەپسخانە، بەندیخانە، زیندان، گرتوخانە.
**حبسگاه**- ا.مر(هەبسگاه-hebsgah): چەپسخانە، زندان، بەندیخانە.
**حبسه**- ا. مص- ع(هوبسە- hubse): زمانگیران.
**حبسی**- ا. ص(هەبسی- hebsî): زیندانی، بەندی.
**حبسیه**- ا. ع(هەبسییە- hebsîye): قـەسیـدەیەک کـە شـاعـیـر لە زینداندا بۆ حاڵی خۆی گۆتبی.
**حبش**- ا.ع(هەبـەش- hebeş): تایفەیەکی رەش پێستی ئەفریقان.
**حبق**- ا. ع(هەبەغ- hebex): بنچک، دەوەن، شخەڵ، دڤی.
**حبق البقر**- ا. مر- ع(هەبغول بەغەر- hebxul bexer): پونگە گاویلکە.
**حبک**- ا. ع(هوبک- hubk):
**حبل**- ا- ع(هەبل- hebl): دەمـار، پەیمان، پەت، بەند، حەبل، لقی مێو.

**حبل**- ا.ع(هەبل- hebl): پەت، حەبل، گوریس، ئاوسی.

**حـبل**- ا.ص- ع(هیـبل- hibl): زانا، زیرەک، زرینگ، بەهۆش.

**حـبل الذراع**- ا.مـر- ع(هەبلوز زیراء- hebluz zira’): دەماری بازوو.

**حبل العـاتق**- ا.مـر- ع(هەبلول ئاتیغ- heblul atix): دەمـاری نێـوان شـان و مل.

**حـــبل الله**- ا.مـــر- ع(هەبلول للاهـ- heblul lah): کـتـێبی خوا، باوەڕبوون بە خوا.

**حـبل المتین**- ا.مـر-ع(هەبلول مـەتین- heblul metîn): پـەتـی قـــــــایم، شەریعەتی ئیسلام، قورعان.

**حبل المساکین**- ا.مر-ع(هەبلول مەساکین- heblul mesakîn): لاولاو، بـەنـدی دەروێشان.

**حـبل الورید**- ا.مـر- ع(هەبلول ڤـەرید- heblul verîd): دەمـــــــاری مـل، شادەمار.

**حبلی**- ا.ص- ع(هوبلا- hubla): ژنی سک پڕ، ئاوس، دوو گیان، باردار.

**حـــبن**- ا- ع(هــــەبــــن- hebn): کەرخنکێنە، جۆرە گیایەکە.

**حبن**- ا. ع(هەبن- hebn): دومـــــەڵ، قونێر.

**حـبن**- مـص-ع(هـەبـەن- heben): گەورەبوونی ورگ، نەخۆشی تینویەتی.

**حـــبـــوب**- ا.ع(هوبوب- hubûb) دانەوێڵە.

**حـبـوه**- مـص- ع(هەبڤـە- hebve): بەخشش، بەخشین.

**حبوه**- ا- ع(حـەبڤـە- hebve): جل و بەرگ، پەشتەماڵ، عەمامە، شاشک.

**حبوه**- ا- ع(هەبڤە- hebve): چەک و جل و بەرگ و مـوسـتـیلەو قـورئان کـە لە پاش مەرگی باب جگە لە میرات بە کوڕی گەورە دەدرێ.

**حـبـه**- ا- ع(هەببـە- hebbe): یەک دانە، حەبە، میسقال، تۆزقاڵ.

**حـبـه الخـضـراء**- ا.مـر- ع(هەببەتول خـەزرا- hebetul xezra): قـەزوان، قەسقەوان.

**حبه السوداء**- ا.مر- ع(هەببەتوس سەودا- hebetus sewda):

**حبه القلب**- ا.مر-ع(هەببەتول غـەلب- hebetul xelb): ناخی دڵ.

**حـــبـــه دل**- ا.مـــر(هەببـــەی دیل- hebbey dil): ناخی دڵ، کانگای دڵ.

**حـبـیب**- ا.ص- ع(هەبیب- hebîb): یار، دۆست، خۆشەویست.

**حبیبه**- ا.ص- ع(هەبیبە- hebîbe): مەحبوبە، خۆشەویست.

**حـبـیس**- ا.ص-ع(هەبیس- hebîs): حەپس، زندانی، بەندی.

**حبیسه**- ا- ع(هەبیسـە- hebîse): وەقف، شتێ کە بۆ خێر وەقف کرابێ.

**حـبـیکه**- ا- ع(هەبیکە- hebîke): مەداری نێوان ئەستێران، چین چینی قژ.

**حتف**- مص- ع(هەتف- hetf): مەرگ، مەرگی ئاسایی.

**حـتم**- مص- ع(هەتم- hetm): لازم، پێویست.

**حـتم**- ا.ص- ع(هەتم- hetm): سـادە، پەتی، پێویست.

**د. د. ت**- ا.فـر(D. D. T -): دەرمـانی مـێشـو مـێشـوولەو مـێـروکـوژ، ناوە کیمیاییەکەی دیکوفان-ـە.
**ددر**- ا.عـا(دەدەر- deder): کـوچەو بازاڕ، دەرێی ماڵ.
**ددە**- ا(دەدە- dede): بابە گەورە، لەلە، کەنیزەکێک کە منداڵ بەخێو بکا.
**در**- ا(دەر- der): ناوەوە.
**در**- ا(دەر- der): دەرکە، دەرگا.
**در**- ا(دەر- der): دۆڵ.
**در**- ا.ع(دوڕ- dur): مرواری درشت.
**در**- ا.ع(دەر- der): شیر، چاکی، خێرو بەرەکەتی زۆر، دەستکەوت.
**درا**- ا(دەرا- dera): زەنگۆڵەی گەورە.
**درابـــزون**- ا.ع(دەرا بـــەزون- dera bezûn): هەیوان، بەربێـلایی، محەجەرە.
**دراج**- ا.ع(دوراج- durac): پۆڕ.
**دراجـــە**- ا.ع(دەراجـــە- derace): پاسکیل.
**درادوزا**- ص.فـــا(دەرا دوزا- dera dûza): ببڕو بدوری چاک، کەسی بە ئەزموون و لێزان.
**دراری**- ا.ع(دەراری- derarî): ئەستێرەی پرشنگدار، درەوشەنی.
**دراز**- ص(دەراز- deraz): درێژ.
**دراز اهنگ**- ص.مـر(دەراز ئاهەنگ- deraz aheng): کـەسێک کـە رێی دووری لەبەر بێ، ئەوەی تول بەکـارێک بداو دوای بخات.
**دراز بـالا**- ص.مـر(دەراز بـالا- deraz bala): بالآ بەرز، درێژ.
**دراز خـوان**- ا.مـر(دەراز خـان- deraz xan): سفرەی درێژ.
**درازدست**- ص.مـر(دەراز دەست- deraz dest): دەستدرێژ، دەسەلآتدار، دەستدرێژی، تەعەدا.
**دراز قـد**- ص.مـر(دەراز غـەد- deraz xed): بالآبەرز، کەڵەگەت، بەژن بڵند.
**درازکش**- ا.مـر(دەراز کـەش- deraz keş): راکشان لەسەر سینگ.
**دراز کشیدن**- مص.ل(دەراز کەشیدەن- deraz keşîden): راکـشـان، درێژ بوون.
**دراز گـوش**- ا.مـر(دەراز گـوش- deraz gûş): گوێ درێژ، کەر.
**درازنا**- ا.مـر(دەرازنا- derazna): درێژی.
**دراژە**- ا.فـر(دراژە- draje): نوقـڵی بادەم، حەبی دەرمان.
**دراست**- مص.ع(دیراسەت- diraset): خوێندن، زانست، فێربوون.
**دراعـە**- ا.ع (دورائە- dura’e): جبە.
**درافتـادن**- مص.م(دەرئوفـتـادەن- der’uftaden): بـەشـەڕ هـاتـن، پێکادان، کێشمانەکێش کردن.
**درافشان**- ص.فـا٠دورئەفـشـان- dur efşan): قسە شیرین، بەزمان.
**دراک**- ص.ع(دەراک- derak): زرینگ، زووحاڵی، دەرککار، زووفام.
**درام**- ا.مـر(دیرام- diram): درامـا، شانۆنامەی خەمین و پێکەنیندار.
**دراماتیک**- ص.فـر(دیرامـاتیک- diramatîk): درامی.

**درامد**- ا.مر(دەرامەد- deramed): دەرامەت، قازانج و دەستکەوت، پێشەکی.

**درامدن**- مص.ل(دەرامەدەن- derameden): پەیدابوون، وەژوور کەوتن، وەدەرکەوتن، رووان، سەوز بوون.

**درامیختن**- مص.م- ل(دەرئامیختەن- der amîxten): ئاوێتەبوون، تێکەڵ بوون، تێکەڵاوی پەیداکردن، رەزابوون.

**دراندختن**- مص.م(دەرئەنداختەن- der endaxten): توڕدان، دەست پێکردن، دەحکەکردن و مشت ومڕ.

**دراندن**- مص.م(دەراندەن- deranden): دڕاندن.

**در اوردن**- مص.م(دەرئاڤەردەن- der averden): دەرهێنان، داخڵ کردن، درۆکردن.

**در اویختن**- مص.ل.م(دەرئاڤیختەن- der avîxten): هەڵواسین، توڕەکردن.

**دراهم**- ا.ع(دەراهیم- derahim): کوێ درهەم.

**درایت**- مص.ع(دیرایەت- dirayet): زانین، حاڵی بوون، سروشت.

**درایدن**- مص.ل(دەرایدەن- derayîden): قسەکردن، گوتن، قسەی نادرست گۆتن.

**درب**- ا.ع(دەرب- derb): دەرگای گەورە، دەروازە.

**دربا**- ا(دەربا- derba): دەربایست، پێویست.

**درباختن**- مص.م(دەرباختەن- der baxten): دۆڕاندن، لە دەستدان، بەخشین، قەزردان.

**دربار**- ا.مر(دەربار- derbar): بارەگا، کۆشکی پادشایی، دەربار.

**درباس**- ا.ع(دیرباس- dirbas): شێری دڕندە، سەگی دڕ.

**دربان**- ا.ص(دەربان- derban): دەرگاوان، پەردەدار.

**دربایست**- ا.مص(دەربایست- der bayîst): پێویستی، شایستەیی.

**دربایستن**- مص.ل(دەربایستەن- der bayîsten): پێویست بوون، شایستەبوون.

**دربچه**- ا(دەربچە- derbçe): دەرکەی بچووک.

**دربدر**- ص(دەربیدەر- derbider): دەربەدەر، ئاوارە، خانە بەکۆڵ، سەرگەردان.

**دربر**- ا.مر(دەربەر- derber): لە پاڵ، لە کەنار، لەباوەش.

**دربردن**- مص.م(دەربوردەن- derburden): رفاندن، بردن.

**دربزین**- ا.ع(دەربەزین- der bezîn): هەیوان، محەجەرە، بەربێلایی.

**دربست**- ص(دەربەست- der best): خانووی سەربەخۆ، قاپی باغڵەمە، گشت لە گشت.

**دربستن**- مص.م(دەربەستەن- der besten): بەستن، داخستن، بەندکردن.

**دربند**- ا.مر(دەربەند- der bend): کۆڵانی بنبەست کە دەرگای هەبێ، باریکە رێی ناو کێوان، رچەرێ، دۆڵ، قەڵا، گەلی.

**دربند**- ص(دەربەند- derbend): بەخسیر، گیرۆدە، گرفتار، بەندی.

**دربندان**- ا.مـــر(دەربەندان- derbendan): دەرگابەندان، حاڵەتی داخستنی دەرگای ماڵان یان موغازەو دوکانان.

**دربه**- مص. ع(دوربه- durbe): کارامە لە کارو سەنعەتان، مەعلان، جەربەزەو ئازا لە شەڕو هەر کارێکی دی.

**درپرده**- ص(دەرپەردە- derperde): لەپشت پەردەوە، شاراوەو پەنهان، پەنهانی گوتن.

**درپی**- ا(دەرپەی- derpey): پینە.

**درپی**- ق(دەرپەی- derpey): لەدوا، تاقیب کردن.

**درپیچیدن**- مص.م(دەرپیچیدەن- derpîçîden): قەدکردن، پێچانەوە، لوولکردن، تێکگیران لەگەڵ کەسیکدا.

**درپیش کردن**- مص.م(دەرپیش کەردەن- derpîş kerden): وەپێش خستن، دانەپێش.

**درپیوستن**- مص. ل(دەرپەیوەستەن- der peywesten): پەیوەندی کردن.

**دره التاج**- ا.مـر-ع(دورەتوتتاج- duretuttac): مرواری درشتی سەر تاجی پاشایان.

**درج**- مص. ع(دەرج- derc): نووسین، تۆمارکردن.

**درج**- ا.ع(دەرەج- derec): پێپلیکانە، پلیکانە، پاچینە، نەردەوان، پەیژە، قالدرمە.

**درجا**- ق(دەرجا- derca): لە جێ وەستان، مانەوە لەیەک پلەو پێشڤەنەچوون.

**درجات**- ا.ع(دەرەجات- derecat): پایە، پلە، نمرە.

**درجه**- ا.ع(دەرەجە- derece): پلە، پایە، روتبە، نمرە.

**درجه‌بندی**- ا.مص(دەرەجەبەندی- derece bendî): دابەشکردنی شتێک بەسەر چەند دەرەجە یان چینەوە.

**درجه‌دار**- ا.ص(دەرەجەدار- derecedar): خودان پلە، ئەوشتەی کرابێ بە نمرە، پلەیەکی سوپاییە لەسەر دەستەوە تا پێش ئەفسەری.راستە.

**درچه**- ا(دەرچە- derçe): دەرکەی بچووک.

**درحال**- ق(دەرحال- derhal): دەمودەست، هەر ئێستا.

**درخت**- ا(دیرەخت- dirext): درەخت، دار، هەر رووەکێکی گەورەو ئەستور کە رەگ و قەدو لق و پۆی هەبێ.

**درختستان**- ا.مـر(دەرختستان- dirextistan): دارستان.

**درخت سنبه**- ا.مـر(درەخت سونبە- dirext sunbe): دارکونکەرە.

**درختکاری**- ا.مص(درەختکاری-dirext-karî): نەمام ناشتن، دارناشتن.

**درخت لاله**- ا.مـر(درەختی لالە- direxti lale): جۆرە درەختێکی جوانە گوڵی لالەیی زەردو نارنجی دەگرێت، دارەکەی بۆ دروستکردنی مۆبێلەو شتی دارین بەکار دێ.

**درخت مریم**- ا.مـر(درەختی مەریەم- direxti meryem): دار خورما، ئەو دار خورمایەیە کە وشک بوو بوو و لەبەر خاتری حەزرەتی مریەم سەر لە نوێ ژیایەوەو بەری گرت.

**درخـــش**- ا(دورەخـــش- durexş): ڕووناكی، هەورە تریشقە، بریسكە.
**درخـــشـــان**- ص.فـــا(دورەخــشـــان- dur exşan): ڕۆشن، درەخشان.
**درخـشـیـدن**- مص. ل(دورەخـشـیـدەن- durexşîden): شـــــەوق دانـەوە، درەخشانەوە.
**درخف**- ا(دورخـوف- dur xuf): ڕەشـە زەردەواڵە، زەنگەسۆرە.
**درخـــواست**- ا.مـص(دەرخــــاست- der xast): ویستن، پاڕانەوە.
**درخـواستن**- مص. م(دەرخـاسـتــەن- der xasten): خـــواستن، پاڕانـەوە، داواكردن.
**درخــواه**- ا.مص(دەرخــاه- derxah): داوا، پاڕانەوە.
**درخـور**- ص.فـا(دەرخـور- derxûr): شایستە، لەبار، لایەق.
**درد**- ا(دەرد- derd): ئازار، نەخۆشی.
**درد**- ا(دورد- durd): تلـّپـە، تلـّتـە، تلـّف، خلـّتە.
**دردا**- (دەردا- derda): حــەیف، ئاه، ئەفسوس.
**درداء**- ص.ع(دەرداء- derda’): ژنـــی بێ ددان، ژنێك كە ددانەكانی كەوتبن.
**درداب**- ا(دەرداب- derdab): شەمامە.
**دردار**- ص.مـــــر(دەردار- derdar): دەركـەدار، ئەو شـتـەی دەرگـا یان قـەباغی هەبێ، دەرگاوان.
**دردار**- ا(دەردار- derdar): سپیدار.
**دردار**- ا.ع(دەردار- derdar): دەنـگـی دەهۆڵ.
**درداشـــــام**- ص.فـــــا(دورد ئاشـــــام- durd aşam): تلـّپەنۆش، كەسێك كە تلـّپەی شەراو بخواتەوە، كەسێك كە پێك تا دوا چۆڕ هەڵدا.
**درداشـنـا**- ص.مـــــــر(دەردئـاشـنـا- derd aşna): كـەسـێك كـە خـووی بە نەخـۆشـینەوە گـرتبێ و پەی بەنەخـۆشـینی خەڵكانی دیكە ببات.
**درداگـــــین**- ص(دەرد ئـــــاگـــــین- derd agîn): دەرداوی، بە ئازارو ژان.
**درد الــود**- ص. مــف(دەرد ئـــالـــود- derd alûd): دەرداوی، دەردەدار.
**درد الــود**- ص. مــف(دورد الـــود- durd alûd): لیّل، خلـّتاوی.
**دردانە**- ا.مــــر(دوردانە- durdane): مرواریییەكانە.
**درد اور**- ص. فـــــا(دەرد ئاڤــــەر- derd aver): ئازارهێن، مایەی ئازار.
**درد برچـین**- ص.فــــــا(دەردبـەرچین- derd berçîn): دەردلابەر، دڵســـۆزو خەمخۆر، بەلاگەردان.
**دردبــیـــس**- ا.ص- ع(دەردەبـــیـــس- debîs de): نـاڕەحـەتـی و بەلا، كــاری قورس، بیر، عەمەڵەندە.
**دردچین**- ص.فـا(دەردچین- derdçîn): دەرمانی دەرد.
**دردخوار**- ص.فا(دەردخار- derdxar): هەژارو بێنەوا، دەردەدار.
**دردخوار**- ص.فا(دوردخار- durdxar): تلـّپـەخۆر، كەسـێك كـە تلـّپـەی شـەراب بخوات.
**دردزدە**- ص.مـــــــــــــف(دەردزەدە- derd zede): نەخـــۆش، دەغـــەزار،

دەردەدار.
**دردســـتـــان**- ص. فـــا (دەردســیــتــان- derdsitan): دەردسێن، نەخۆشی لابەر.
**دردسر**- ا.مر(دەردی سەر-derdi ser): سەریەشە، ئاریشەو گرفت.
**دردکش**- ص.فـــــا (دوردکــــــەش- durd keş): شەرابخۆر، شەرابساز.
**دردم**- ق(دەردەم- derdem): یەکسەر، هەر ئێستا.
**دردمند**- ص(دەردمەند-derd mend): بیمار، نەخۆش.
**دردمـــیـــدن**- مص. ل(دەردەمـــیـــدەن- derde mîden): هەڵکردن، هاتن، ئاوسان.
**دردنـــاک**- ص(دەردنـــاک- derdnak): نەخۆش، بە ئازار، دەردەدار.
**دردنـــوش**- ص.فـــــــا (دوردنـــوش- durd nûş): خڵتەنۆش، شەرابخۆر.
**دردور**- ا(دوردور- durdûr): گـێـژاو، گێژەنگ.
**درده**- ا(دوردە- durde): خڵتە، تڵتە.
**درر**- ا.ع(دورەر- durer): مرواریان.
**درربار**- ص.فا(دورەربار- durerbar): گەوهەربار.
**درربــــودن**- مـــص.م(دەرر بـــــودەن- derr bûden): رفاندن.
**در رســـیـــدن**- مص.ل(دەر رەســـیـــدەن- der resîden): گەییشتن، لە ناکاودا هاتن.
**در رفت**- ا.مص(دەر رەفت-der reft): وەدەرکەوتن، دەرفرتاندن، هەڵاتن.
**در رفتن**- مص. ل(دەر رەفـــتـــــەن- der reften): هەڵاتن، پچڕان، وەژوور کەوتن.
**درز**- ا(دەرز- derz): درز، شـــــەقی باریک.
**درزمـــان**- ا(دەرزمـــان- derz man): داوی دەرزی بۆ درومان، لە دەرگەدان.
**درزن**- ا(دەرزەن- derzen): دەرزی درومان.
**درزه**- ا(دەرزە- derze): درز، شەق.
**درزه**- ا(دەرزە- derze): خەرمانە دڕک و داڵ، کۆڵەدڕک و داڵ.
**درزی**- ا.ص(دەرزی- derzî): جـــــل دروو، بەرگدروو، خەیات.
**درزیگر**- ا.ص(دەرزیگەر-derzî ger): خەیات.
**درس**- ا.ع(دەرس- ders): وانە.
**درســـاختن**- مص.م(دەرســـاخـــتـــەن- dersaxten): پـێـکـەوە هـەڵـکـردن، سازان، گونجان.
**درســـار**- ا.مـــر(دەرســـار- dersar): پەردەی دەرگا.
**درســــپــــردن**- مص.م(دەرســــپــــوردەن- der sipurden): سپاردن.
**درسپوختن**- مص.م(دەرسیـپـوخـتـەن- der sipuxten): تێ ئاخنین.
**دروســــت**- ص(دروســــت- drûst): دروست، باش، بەجێ، بێ عەیب.
**درســــتــــاران**- ا(دەرەســــتــــاران- derestaran): شـــاگـــردانە، کـــرێی پێشوەختە.
**درستک**- ا(دوروستەک- durustek): زێڕی داوی خالیسە.
**درســــتکار**- ص.فـــا (دروســـتکار- drustkar): دروســـــتکردار، ئەمین،

راست و دروست، بێ فڕوفێڵ.
**درست کردار**- ص.مـر(دروست کـردار- drust krdar): دروستکار.
**درش**- ا(دەرش- derş): تـەویـلـەی ئەسپان.
**درشت**- ص(دوروشت- duruşt): زبر، گەورە، ناهەموار، توندەتەبیعەت.
**درشتخو**- ص.مـر(دوروشت خـو- duruşt xû): بـەدخـوو، تـونـدە تەبیعەتی.
**درشت گو**- ص.فـا(دوروشت گـو- duruşt gû): قـسـە ناخـۆش، زمـان پیس.
**درشودن**- مـص.ل(دەرشـودەن- derşuden): مژوڵ بوون بە کارێکەوە.
**درشکه**- ا(دوروشـکـە- duruşke): عەرەبانەی تریشقە، گالیسکە.
**درشکه‌چی**- (دوروشـکـەچـی- duruşke çî): عـەرەبـانـەچـی، گالیسکەوان.
**درع**- ا.ع(دیـرع- dir’): زرێ، بـەرگـی شەڕ، قەڵخان.
**درغاله**- ا(دەرغـالە- derxale): دۆڵ، نێوان دوو کێو.
**درغم**- ا(دەرغـەم- derxem): ناوی ئاهەنگێکی کۆنی مۆسیقای ئێرانییە.
**درغمی**- ص.ن(دەرغەمی-derxemî): ناوی جۆرە شەرابێکە، کە گوایە لە گوندی دەرغـەمی سـەر بە سـەمـەرقـەند دروست کراوە.
**درفش**- ا(دیرەفش- direfş): درەوشەی پینەدۆزان.
**درفش**- ا(دورەفش- durefş): عـەلەم، بەیداخ.
**درفشان**- ص.فـا(دورەفـشـان- durefşan): درەوشـاوە، رونـاک، شەکاوە.
**درفشی**- ص.ن(دورەفشی- durefşî): درکەیە بۆ کەسی ناسراوو ناودار، کەسێک بە چاکە یان خراپە ناوی دەرکردبێ.
**درفشیدن**- مص.ل(دورەفـشـیـدەن- durefşîden): درەوشانەوە، شەکانەوە.
**درفجک**- ا(دەرفەنجەک-derfencek): دێوەزمە، کابوس، مۆتەکە، پیرهەڤۆک.
**درق**- ص.ع(دەرغ- derx): رەق.
**درق**- ا.ع(دەرەغ- derex): سوپەر.
**درقاء**- ا.ع(دەرغـاء- derxa’): هەور، عەور.
**درقه**- ا.ع(دەرەغە- derexe): سوپەر.
**درک**- مص.ع(دەرک- derk): گەییشتن بە مەبەستێک، پەی بردن، حاڵی بوون.
**درک**- ا.ع(دەرەک- derek): سـەنەد، بنکی شـتـێکی وەکـو بیـر یان دەریا، بنی دۆزەخ.
**درکار**- ص(دەرکـار- derkar): پێویست، بەکاربراو.
**درکردن**- مـص.م(دەرکـەردەن- derkerden): دەرکردن.
**درکشیدن**- مص.م(دەرکـەشـیـدەن- derkeşîden): نـۆشـین، بـێ دەنـگ بوون، کشانەوە، کەنارکەوتن.
**درکوهی**- ا.مـر(دوری کـوهی- duri kûhî): جـۆرە بەردێکە لە بلـور دەچێت.
**درگاله**- ا(دەرگـالە- dergale): چلورە کە بە گوێسەبانانەوە دێتە خوارێ.

**درگــاه**- ا.مـــر(دەرگــاهـ- dergah): دەرکە، دەرگا، ئاستانە، بارەگا.

**درگاهی**- ص.ن(دەرگاهی- dergahî): دەرمـالّی، دەرگـایی، ئەو ئەسـپەی کـە لە کۆندا لەبەر بارەگـای پاشـادا بە ئامـادەیی رادەگیرا.

**درگـــذراندن**- مص.م(دەرگـــوزەراندەن- der guzeranden): تێــپــەڕاندن، لەرادەبەدەر کردن.

**درگـــــذشت**- ا.مص(دەرگـــوزەشت- der guzeşt): مردن، وەفات.

**درگــذشتن**- مص.ل(دەرگــوزەشــتــەن- der guzeşten): تێپـەڕین، چاوپۆشین لە خەتای کەسێک، لێبوردن.

**درگر**- ا.ص(دورگەر- durger): رەندە، دارتاش.

**درگـرفتن**- مص.ل(دەرگــیــریفــتــەن- dergiriften): ئاگرگرتن، هەڵگیرسان، سووتان، کارتێکردن.

**درگسلانیدن**- مص.م(دەرگەسەلانیدەن- der geselanîden): پـچـــــڕاندن، پارچەپارچەکردن.

**درگه**- ا.مر(دەرگەهـ- dergeh): دەرگا، دەرکە.

**درگــیـــر**- ا.ص(دەرگــیـــر- dergîr): گرفتـار، گیرۆدە، هەڵگیرسانی شەڕو شۆڕ، تووش بوون، پێکادان.

**درگـیـرانیـدن**- مص.م(دەرگـیـرانیـدەن- der gîranîden): هەڵگـیـرسـاندنی ئاگر، ئاگر هەڵکردن.

**درلک**- ا(دیرلیک- dirlik): کراسی بێ قۆڵ. کراسی قۆڵ کورت.

**درم**- ا(دیرەم- direm): درهەم.

**درما**- ا(دەرما- derma): کەروێشک، خەرگوش.

**درمان**- ا(دەرمان- derman): دەرمان، دەوا، چارە، عیلاج.

**درمــــانـدن**- مص.ل(دەرمـــــانـدەن- dermanden): مــــــانـدووبـوون، داماوبوون، بێچارەبوون، هەژاربوون.

**درمـــانـگاه**- ا.مـــر(دەرمـــانـگاهـ- dermangah): نەخۆشخانەی بچووک، تیمارستان.

**درم خـــريد**- ص.مف(دیرەم خـــەرید- direm xerîd): بەندە، کەنیزە، غـولاّم یان کـەنیـزەکـێک کـە بەپارە و پوول کڕدرابێ.

**درمـــســـرا**- ا.مـــر(دیرەم ســـەرا- direm sera): کـارگە یان شـوێنێ کـە سکەی تیا لێ بدرێ.

**درم سنـج**- ص.فـــا(دیرەم ســـەنج- direm senc): سەڕاف، کەسێک کە پارەی چاک و خراو لێکدی جیـا بکاتەوە، پوڵناس.

**درمـــسـنگ**- ا.مـــر(دیرەم ســـەنگ- direm seng): شـتـێـک لە سـەنگی یەک درەمدابێ.

**درمغ**- ا.ع(دەرمەغ- dermex): ئاردی سپی.

**درم گـــزين**- ص.فـــا(دیرەم گـــوزین- direm guzîn): ســـــــــەڕاف، پارەگۆڕەرەوە.

**درمل**- ا.ص(دورمـــــول- durmul): دانەوێڵەی نەگەییوو، فەریک.

**درمنده**- ص(دەرمەندە- dermende): داماو، بێچارە، بێ توانا، هەژار.

**درمنه**- ا(دەرمەنە- dermene): جۆرە گیایەکی خۆرسکە.

**درن**- ا.ع(دەرەن- deren): چـڵـک، کێم، زوخاو.

**درنا**- ا(دورنا- durna): قـــازی قوڵینگ، قورینگ.

**درنده**- ا.فـا(دەرەندە- derende): دڕندە.

**درنشاختن**- مص.م(دەرنیـشـاختـەن- dernişaxten): دانیـشـانـدن، جێکردنەوە.

**درنشاندن**- مص.م(دەرنیـشـاندەن- der nişanden): دانیشاندن.

**درەنگ**-ا(دیرەنگ- direng): زرینگ (دەنگی پێکادانی دووشـتی کـانزایی)، دەنگی زەنگ، زرینگە.

**درنک**- ا(دیرەنگ- direng): درەنگ.

**درنگریستن**- مص.م(دەرنگریسـتـەن- dernigrîsten): نـیـگـاکـردن، تەمەشاکردن، دیقەت دان.

**درنگیدن**- مص.فـا(دیرەنگیـدەن- direngidîden): درەنـگ کـردن، دواکەوتن.

**درنوردیدن**- مص.م(دەرنەڤـەردیدەن- der neverdîden): بـڕیـنـی ڕێـگـە، لێکپێچان.

**درنوشتن**- مص.م(دەرنەڤـەشـتـەن- der neveşten): ڕێگەبڕین.

**درو**- ا.مص(دیرەو- direw): درەو.

**دروا**- ا.ص(دەرڤا- derva): زەرورەت، پێویستی، ئیحتیاج.

**دروا**- ص(دەرڤا- derva): هەڵواسراو، سەرگەردان، سەرنگون، بەرەواژ، ئاوەژوو.

**درواخ**- ص(دورڤـاخ- durvax): مەحکەم، قایم، تەندروست، ساغـڵەم، بێ عەیب، چابوونەوە لە نەخۆشی، هەستانەوە لە نەخۆشی.

**دروازه**- ا(دەرڤـازە- dervaze): دروازە، دەروازەی شـار، دەروازەی قـەڵا، دەرگای گەورە.

**دروازەبان**- ا.ص(دەرڤـازەبـان- dervazeban): دەروازەوان.

**درواژ**- ص(دەرڤـاژ- dervaj): سـەرگـەردان، بەرەواژ، سـەرنـگون، دەمەونخون، مشەخت.

**دروان**- ا.ص(دەرڤـان- dervan): دەرکەوان، قاپیچی.

**دروانه**- ا(دەرڤـانـە- dervane): کـونێکە لە سـەربان دەکـرێ و بەنەردەوان هاتووچۆی پێدا دەکرێ.

**درواه**- ص(دەرڤـاه- dervah): سەرگەردان، وێڵ.

**دروایست**- ا.مص(دەرڤـایـست- dervayîst): پێویستی.

**دروب**- ا.ع(دوروب- durûb): ڕێـگـە، دەروازە.

**دروبطارس**- ا(دەروبیـتـارس- derû bitars): جۆرە گیایەکە.

**دروپ**- ا.فـر(دروپ- drûp): مـیـوە، میوەیەک کە لە یەک ناوک پتری نەبێ.

**درود**- ا(دورود- durûd): دوعـا، سڵاو، پاڕانەوە، درود.

**درودگـر**- ا.ص(دورودگـەر- durûdger): دارتاش.

**درودن**- مـص.م(دورودەن- durûden): درەوکردن.

**دروندە**- ا.فا(دیرڤەندە- dirvende): درەوکەر، دروێنەوان.
**درودە**- ا.مف(درودە- drûde): درەوکراو.
**دروز**- ا.ع(دوروز- durûz): درزان.
**دروز**- ا.ع(دوروز- durûz): تایفەیەکی مەزەبییە کە زیاتر لە چیاکانی لوبنان و سوریا دەژین.
**دروز را**- ا.ف(دروز را- drûz ra): جۆرە گیایەکە.
**دروس**-ا.ع(دوروس-durûs): وانەکان.
**دروش**- ا(دیرەوش- direwş): درەوشە.
**دروع**- ا.ع(دروء- drû’): زرێ، جلکی شەڕ.
**دروغ**-ا(دوروغ-durûx):درۆ، ناڕاست.
**دروغ باف**- ص.فا(دوروغ باف- durûx baf): درۆزن، فیشاڵباز.
**دروغ پرداز**- ص.فا(دوروغ پەرداز- durûx perdaz): درۆزن.
**دروغزن**- ص.فا(دوروغ زەن- durûx zen): درۆزن.
**دروغسار**- ص.مر(دوروغسار- durûxsar): درۆزن.
**دروغگو**- ص.فا(دوروغگو- durûxgû): درۆزن، درۆکەر.
**دروقینون**- ا(دەروغینون- derûxînûn): جۆرە گیایەکە.
**دروک**- ا(دوروک-durûk):تەراشەدار، وردەچیلکە.
**دروگر**- ص.فا(دیرەوگەر-direw ger): دروێنەوان، درەوکەر.
**درون**- ا(دەرون- derûn): ناو، ناخ، دڵ و دەرون و ناخ.
**درون**- ا(دەرون- derûn): جۆرە کولێرەیەکە کە زەردەشتییەکان بۆ هەندێ بۆنەو ئاهەنگی ئاینی دەیبرژێن.
**درون پرور**- ص.فا(دەرون پەرڤەر- derûn perver): دەرون پەروەر، کەسێ کە ناخی خۆی پاک بکاتەوە، جوامێر، مرۆڤپەروەر.
**درونج**- ا(دەرونەج- derûnec): جۆرە گیایەکە.
**دروند**- ا(دەرڤەند- dervend): قولاپ، چنگاڵ.
**دروند**- ص(دورڤەند- durvend): کافر، بێدین، یاخی، بەدکار.
**درون سو**- ا.مر(دەرون سو- derûn sû): دیوی ناوەوە.
**درون گرایی**- ا.مص(دەرون گەرایی- derûn gerayî): ناخپەروەری.
**درون نگری**- ا.مص(دەرون نیگەری- derûn nigerî): دەرونڕوانی.
**درونە**- ا(دەرونە- derûne): ناوەوە، سک.
**درویدن**- مص.م(دیرەڤیدەن- direvîden): دروێنەکردن.
**درویزە**- ا.مص(دەرڤیزە- dervîze): دەرۆزە، دەرۆزەکردن، سواڵ کردن.
**درویش**- ا.ص(دەرڤیش- dervîş): قەلەندەر، بێنەوا، گۆشەنشین، خەڵوەتگیر، سۆفی، گەدا.
**درویشانە**- ق.ص(دەرڤیشانە- dervîşane): فەقیرانە، دەروێشانە.
**درە**- ا(دەرە- dere): دەرە، دۆڵ.
**درە**- ا.ع(دورە- dure): مرواری.

**دره**- ا.ع (دیره- dire): قامچی، شەلاق، خوێن، شیر.

**درهام**- ا.ع(دیرهام- dirham): درهەم، جۆرە دراوێکە، پەنجا فلس.

**درهشته**- ا(دەرهیشتە- derhişte): کەرەم، بەخشش، عەتا.

**درهم**- ا.ع(دیرهەم- dirhem): درهەم، جۆرە دراوێکی کانزاییە.

**درهم**- ص(دەرهەم- derhem): تێکەڵ، ئاوێتە.

**دری**- ص.ن(دەری-derî): دەری، دۆڵی بەینی کێوان، کەودەری، کەوێکە کە لە چیا یان لە دۆڵی نێوان چیادا بژی.

**دری**- ص.ن(دەری- derî): دەرباری، زمانی فارسی دوای پەهلەوی. زمانی دەری پاش ئیسلام بوو بە زمانی رەسمی و ئەدەبی خەڵکی ئێران.

**دری**- ص.ع(دوڕی- durî): روناک و پرشنگدارو درەوشاوە وەکو دوڕ.

**دریا**- ا(دەریا- derya): دەریا.

**دریابار**- ا.مر(دەریابار- deryabar): دەریا، کەناری دەریا، شارێک لە کەناری دەریا بێ، بارانی بەخوڕزم.

**دریابان**- ا.ص(دەریابان-deryaban): ئەمیراڵ، دەریا سالار.

**دریابیگ**- ا.ص(دەریابەیگ- derya beyg): گەورەی دەریا، سەرۆکی دەریا، دەریادار.

**دریاچه**- ا(دەریاچە- deryaçe): دەریاچە، دەریای بچوک کە هەر چوار دەوری خاک بێ.

**دریادار**- ا.ص(دەریادار- deryadar): خاوەن پلەو پایە لە هێزی دەریاییدا.

**دریادل**- ص.مر(دەریادیل- derya dil): درکەیە، بە پیاوی زۆر بەخشندەو لێبوردەو دلێر دەگوترێ.

**دریا سالار**- ا.ص(دەریا سالار- derya salar): دەریادار.

**دریا شکوه**- ص.مر(دەریا شوکوه- derya şukûh): بەشکۆ وەکو دەریا.

**دریافت**- ا. مف(دەریافت- deryaft): وەرگرتن، وەرگرتنی پارە یا شتێکی دی لە کەسێک، تێ گەییشتن و پەی بردن بە بابەتێک یان کارێک.

**دریافتن**- مص.ل.م(دەریافتەن- deryaften): پەی بردن بە کارێک، تێگەییشتن، فریاکەوتن.

**دریابنده**- ا.ف(دەریابەندە- deryabende): زیرەک، هۆشمەند، هوشیار.

**دریاق**- ا.ع(دیریاغ- diryax): تلیاک.

**دریاکش**- ص.ف(دەریاکەش- deryakeş): درکەیە، بە کەسێک دەگوترێ کە شەرابی زۆر بخواتەوەو مەست نەبێ.

**دریاکنار**- ص.مر(دەریاکەنار- derya kenar): کەناری دەریا.

**دریانوال**- ص.مر(دەریانەڤال- derya neval): جوامێر، بەخشندە، دڵاوا، لێبوردە.

**دریانورد**- ص.فا(دەریانەڤەرد- derya neverd): دەریاگەڕ، دەیاوان.

**دریانوش**- ص.فا(دەریانوش- derya nûş): شەرابخۆر، کەسێک کە شەرابی زۆر بخواتەوەو مەست نەبێ.

**دریای نور**- ا.مر(دەریای نور-

deryay nûr): پارچە ئەڵماسێکی بەناوبانگە، لاکێشەییە.

**دریجان**- ا(دەریجان- derîcan): بڕوانە: دریگان.

**دەریچە**- ا(دەریچە- derîçe): دەرکەی بچووک، دەلاقە، کلاوڕۆژنە.

**دریدن**- مص.م.ل(دەریدەن- derîden): دڕاندن، پارچە پارچەکردن.

**دریغ**- ا(دەریغ- derîx): ئەفسوس، مەخابن، داخ، پەشیمانی، قسور، درێغ.

**دریغا**- (دریغا- dirîxa): ئەی بەداخەوە، حەیفێ، مەخابن، ئەفسوس.

**دریک**- ا(دەریک- derîk): جۆرە سکەیەکی زێڕی ٤٠ر٨ گرامی سەردەمی هەخامەنشییەکانە.

**دریگان**- ا(دەریگان- derîgan): سێ بەش، سێیەکی کەلوەکانە لە جەم هندییەکان.

**دریواس**- ا(دەریڤاس- derîvas): چوارچێوەی دەرگا.

**دری وری**- ا.مر(دەری ڤەری- derî verî): قسەی هەلەق و مەلەق، هەرزەوێژی.

**دریوزە**- ا.مص(دەریوزە- deryuze): دەرۆزە، سواڵ، گەدایی، پارسەکی.

**دریوش**- ا.ص(دەریوش- deryûş): دەروێش، قەلەندەر، هەژار، سۆفی، سواڵکەر.

**دز**- ا(دیز- diz): قەلا، حەسار.

**دز**- ا. فر(دوز- duz): بڕێک، بڕێک دەرمان کە بە یەک جار بخورێ.

**دزد**- ا.ص(دوزد- duzd): دز.

**دزدافشار**- ص.مر(دوزد ئەفشار- duzd efşar): شەریکە دز.

**دزدانە**- ص.ق(دوزدانە- duzdane): دزانە، بەدزییەوە، دزئاسا.

**دزدبازار**- ا.مر(دوزد بازار- duzd bazar): دز بازاڕ، شوێنێ کە پڕ بێ لە دزی و گیرفانبڕی و فێڵ و دەستبڕی.

**دزدکی**- ق(دوزدەکی- duzdekî): بەدزییەوە.

**دزدگاه**- ص.فا(دوزدگاه- duzdgah): شوێنی دزان.

**دزدگیر**- ص.فا(دوزدگیر- duzdgîr): دزگر.

**دزدیدن**- مص.م(دوزدیدەن- duzdîden): دزین.

**دزغالە**- ا.مر(دیزغالە- dizxale): سەنگەر، قەلا، حەسار، پەنا.

**دزک**- ا(دیزەک- dizek): قەلای چکۆلە.

**دزک**- ا(دەزەک- dezek): دەستەسڕ.

**دزندیس**- ق(دیزەندیس- dizendîs): بەرانبەرو یەکسان، ئاشکرا، دیار، یەکسەر.

**دزهرج**- ا(دیزهورج- dizhurc): بیت المقدس.

**دژ**- ا(دیژ- dij): قەلا، حەسار.

**دژ**- (دوژ- duj): دژ، بەد، ناشیرین.

**دژآباد**- ص.مر(دوژئاباد- duj abad): بەدخوو، تووڕەو تڕۆ.

**دژ اگاه**- ص.مر(دوژ ئاگاه- duj agah): توندە تەبیعەت، تووڕە، نەزان و بێ تەربێت.

**دژ الود**- ص.مر(دوژ ئالود-duj alûd): توڕه، بەدخوو.

**دژالون**- ص(دوژ ئالون- duj alûn): دڵڕەش، بەدنیاز، بەدکردەوە، بەدخو.

**دژاهنگ**- ص.فا(دیژ ئاهەنگ- dij aheng): تیرهاویشتن بەرەو قەڵا.

**دژبان**- ا.ص(دیژبان- dijban): قەڵادار، نیگابانی قەڵاو حەسار.

**دژبانی**- ا.مر(دیژبانی- dijbanî): بەشێکە لە دەزگای سوپا بۆ چاودێری کردارو ڕەفتاری سەربازان، ئینزیباتخانە.

**دژبراز**- ص.مر(دوژبەراز-duj beraz): ناشیرین، توڕه، تەماعکار.

**دژبرو**- ص.مر(دوژبەرو- dujberû): رووگرژ، مۆن، بەدخوو، توڕه.

**دژپسند**- ص.فا(دوژ پەسەند- duj pesend): درژپەسن، خواناس، عابید.

**دژپیه**- ا.مر(دەژپیه- dej pîh): لوو، غودە.

**دژخیم**- ا.ص(دوژخیم- dujxîm): بەدخوو، ناشیرین، دڵڕەش، میرغەزەب.

**دژدار**- ا.ص(دیژدار- dijdar): پاسەوانی قەڵا.

**دژغاله**- ا.مر(دیژغاله- dijxale): سەنگەر، مەتەریز، قەڵا، حەسار، پەنا.

**دژک**- ا(دوژەک- dujek): ئاوڵە، تلۆق، گرێ، لووی بچووک.

**دژک**- ا(دیژەک- dijek): قەڵای بچووک.

**دژکاک**- ا(دیژکاک- dijkak): داڵەکەرخۆرە، سەرگەڕ، سیسارکە کەچەڵە.

**دژکام**- ص.مر(دوژکام- dujkam): خەمناک، توڕه، زاهید، خواناس.

**دژگوار**- ص.مر(دوژگوڤار- dujguvar): بەدهەرس، خواردنێک کە بە ئاسانی هەرس نەبێ.

**دژم**- ص(دوژەم- dujem): دڵتەنگ، بێزار، خەمبار، پەشێواو.

**دژمان**- ص(دوژمان- dujman): خەمبار، دڵتەنگ.

**دژمناک**- ص(دوژەمناک- dujemnak): بێزار، خەمناک، بێتاقەت.

**دژمنش**- ص.مر(دوژمەنیش- dujmeniş): بەدنیهاد، دڵڕەش، بێزار.

**دژن**- ص(دوژەن- dujen): تفت و تیژ، توڕەوترۆ.

**دژنام**- ا.مر(دوژنام- dujnam): جوێن، دژوێن، جنێو، سخێف.

**دژند**- ص(دوژەند- dujend): تفت و تیژ، توڕەو ترۆ، توندە تەبیعەت.

**دژواخ**- ا(دوژڤاخ- dujvax): حەیف، مەخابن، خەمبار، دڵتەنگ.

**دژوار**- ص(دوژڤار- dujvar): دژوار، زەحمەت، سەخت، ئاستەنگ.

**دژوان**- ا(دوژڤان- dujvan): حەیف، مەخابن، بە داخەوە، ئەفسووس.

**دژه**- ا(دوژە- duje): توڕه.

**دس**- ا(دیس- dis): وەک، هاوتا، هاوشێوە.

**دس**- مص.ع(دەس- des): ڤەشێرتن، شتێک لە بن عاردی شاردنەوە، دەسیسەکردن لە کەسێک.

**دساتیر**- ا.ع(دەساتیر- desatîr): دەستوور، دەستوران.

**دساتین**- ا.ع(دەساتین- desatîn): ژێی عـودو کەمـان و ئامـێـرە مۆسـیـقاییـەکـانی دیکە.

**دسـایس**- ا.ع(دەسـایس- desayîs): دەسیسە، پیلان.

**دست**- ا(دەست- dest): دەس.

**دست اب**- ا.مر(دەست ئاب-dest ab): ئاوێ کە دەست و رووی پێ بشۆردرێ.

**دسـتـادست**- ق.ص(دەسـتـادەست- desta dest): سەوداو معامەلەی نەقد.

**دستـار**- ا(دەسـتـار- destar): مـێـزەر، عەمامە، شاشک، سەروپێچ.

**دستـاران**- ا(دەسـتـاران- destaran): کرێی پێشوەختە، شاگردانەو بەخشیشێک کە بە شاگرد خەیات دەدرێ.

**دسـتـاربند**- ا.ص(دەسـتـاربەند- destarbend): عـەمامـە بەسەر، مێزەر بەسەر، مەلا، شاشک بەسەر.

**دستـارچه**- ا(دەسـتـارچە- destarçe): دەسرۆکـەی دەست، دەرسۆک، دەسـتـەسرِی چووک.

**دسـتـارخـوان**- ا.مـر(دەسـتـارخـان- destarxan): سفرە، سفرەی گەورە.

**دستـاس**- ا.مـر(دەستـئـاس- destas): دەستار.

**دسـتـاسنگ**- ا.مـر(دەسـتـاسـەنگ- destaseng): قۆچەقانی، قەڵماسنگ، بەردەقانی.

**دست افـزار**- ا.مـر(دەست ئەفـزار- dest efzar): ئالەتی دەست، ئالەتێک کە بەدەست بیگرن و کاری پێ بکەن.

**دست افـشـار**- ص.مف(دەست ئەفـشـار- dest efşar): هـەر شـتـێ بەدەست بگـوشـرێ، مـیـوەیەک بە دەست بوشـرێ و ئاوەکەی بگرن.

**دست افشـان**- ص.مف (دەست ئەفشـان- dest efşan): تۆوێک کە بە دەست تۆو بدرێ.

**دست افـشـان**- ص.فا(دەست ئەفـشـان- dest efşan): سـورِوسـەمـاو دەست بادان.

**دست افـشـانـدن**- مص.ل(دەست ئەفـشـانـدەن- dest efşanden): دەسـتـبـەرداربوونی شـتـێک، سـەمـاکـردن، تـەکـانـدانی دەست بەدەم سـەمـاو هەڵپەرکێوە.

**دستاق**- ا(دوستاغ- dustax): زیندانی بە کۆت و زنجیر، حەپس و بەند.

**دست امـوز**- ص.مف(دەست ئامـوز- dest amûz): دەستەمۆ.

**دستـان**- ا(دەسـتـان- destan): دەست، دەستان.

**دسـتـان**- ا(دەسـتـان- destan): فـێڵ، حـیـلە، سـروود، ئاواز، حـیـکایـەت و ئەفسانە.

**دسـتـان**- ا.ع(دەسـتـان- destan): ژێی عـودو کەمان و ئامێرە مۆسیقیـەکـانی دی.

**دست انداختن**- مص.م(دەست ئەنداختەن- dest endaxten): دەسـتـدرێژکـردن، دەسـتـخـەرۆکـردن، گـاڵتـەپێکردن، پێ رابواردن.

**دست انداز**- ا.مـر(دەست ئەنداز- dest endaz): جێی دەست دانان، وەکو دەسکی کـورسی و قـەنەفـە، کۆسـپی سـەر جادە.

**دست اندرکار**- ص.مر(دەست ئەندەرکار- dest ender kar): دەست بەکار، کەسێک کە دەستی لە کارێک هەبێ.
**دستان سرا**- ص.فا(دەستان سەرا- destan sera): نەغمەخوان.
**دستاویز**- ا.مر(دەستاڤیز-destavîz): ئەوزار، بیانوو، بیانگ، ئەوزارو ئالەتی دەست.
**دست باز**- ص. مر(دەستباز- destbaz): دەستکراوە، بەرچاوتێر، بەخشندە، دڵاوا.
**دست باف**- ا.ص(دەست باف- dest baf): دەست چن، شتێک بە دەست چنرابێ، بەدەست تەنراو.
**دستبانه**- ا.مر(دەستبانە-dest bane): دەستکێش، دەستەوانە.
**دست براوردن**- مص.ل(دەست بەرئاڤەردەن- dest ber averden): دەستبەرزکردن، دەست بەرز کردنەوە بۆ دوعاو پاڕانەوە یان گرتنی شتێک.
**دستبرد**- ا.مص(دەست بورد- dest burd): دزی، دەست پێشکەری، تەڕدەستی.
**دست برداشتن**- مص. ل(دەست بەرداشتەن- dest ber daşten): دەست بەرزکردن، دەست هەڵگرتن، چاوپۆشی کردن، وازهێنان.
**دست بردار**- ص.فا(دەست بەردار- dest berdar): وازهێنەر، دەست هەڵگر.
**دستبردن**- مص.م(دەست بوردەن- dest burden): گۆڕین.
**دست برنجن**- ا.مر(دەست بەرەنجەن- dest berencen): بازنگ، دەستبەند، بازن، موچەوانە.
**دست بسرکردن**- مص. م(دەست بەسەر کەردەن- dest beser kerden): دەست پێوەنان.
**دستبند**- ا.مر(دەست بەند- dest bend): بازن، کەلەپچە، جۆرە شاییەکە کە دەست دەنێو دەستی یەکتر دەنێن و دەڕەقسن.
**دست بوس**- ص.فا(دەست بوس- dest bûs): دەستووموچ.
**دست پاچه**- ص.مر(دەست پاچە- dest paçe): شپرزەو پەلەپەل، پەلەپروزێ.
**دست پاک**- ص.مر(دەست پاک- dest pak): دروستکارو ئەمین، هەژارو دەستکورت.
**دست پخت**- ص. مف(دەست پوخت- dest puxt): دەستاو.
**دست پرور**- ص.مف(دەست پەرڤەر- dest perver): پەروردەی دەستی کەسێک، ئەوەی پەروەردەی دەستی کەسێک بێ.
**دست پیچ**- ص. مف(دەست پیچ- dest pîç): ئەو شتەی بەدەست پێچرابێ و بەسترا بێ، ئەوزاری دەست.
**دست پیمان**- ا.مر(دەست پەیمان- dest peyman): ئەو پارەو کالآیەی کە بەر لە زەماوەند لەلایەن زاواوە بۆ ماڵی بوکێ بنێردرێ.
**دست تنگ**- ص.مر(دەست تەنگ- dest teng): دەستکورت، هەژاری، نەبوونی.
**دستجرد**- ا(دەست جیرد- dest cird):

گوند، زەوی و موڵکی کشتوکاڵی.
**دست چپی**- ص. ن(دەستی چەپی- desti çepî): چەپڕەو.
**دست چرب**- ا.مر(دەست چەرب- dest çerb): دەست بەخێر.
**دست چمک**- ا.مر(دەست چەمەک- dest çemek): تەڕ دەستی، چاپوکی، بەدەسەڵات، سەرکەوتن.
**دست چوب**- ا.مر(دەست چوب- çûb dest): دار دەست، دارعاسا.
**دست چین**- ص. مف(دەست چین- dest çîn): دەستچن، میوەیەک یان شتێک کە بە دەست کرابێتەوەو چنرابێ.
**دستخط**- ا.مر(دەست خەت- dest xet): دەست خەت.
**دستخوان**- ا.مر(دەست خان- dest xan): سفرە، خوانچە.
**دستخوش**- ص.مر(دەست خوش- dest xûş): ژێردەستە، زەبوون.
**دست خوش**- ا(دەست خوش- dest xûş): ئافەرین، دەستخۆشانە، ئەو بەخشیشەی براوەی قومار دەیدات بە کەسێک.
**دست خون**- ا.مر(دەستی خون- desti xûn): دوا دەستی قومار بۆ کەسێک هەموو شتێکی دۆڕاندبێ.
**دست دادن**- مص.ل(دەست دادەن- dest daden): تەوقەکردن، چەڤک، پەیمان بەستن، دەوڵەمەند بوون.
**دست داشتن**- مص. ل.دەست داشتەن- dest daşten): دەست ڕۆییشتن، دەست هەبوون.
**دست دراز**- ص.مر(دەست دراز- dest draz): بەدەست و دەسەڵات، دەستدرێژ.
**دستر**- ا(دەستەر- dester): هەڕەی دەستی، هەڕەی بچووک، داسولکە.
**دسترس**- ص.مر(دەست رەس- dest res): شتێ کە دەست بیگاتێ.
**دسترسی**- ا.مص(دەست رەسی- dest resî): قودرەت، ئیرادە، توانا، توانای بەدەست هێنانی شتێک.
**دسترنج**- ا.مر(دەست رەنج- dest renc): کرێ، هەق کرێی کارو رەنج، بەرەنجامی رەنجدان و زەحمەتکێشان.
**دستره**- ا.مر(دەستەرە- destere): هەڕەی دەستی، داسولکە.
**دست ریس**- ص.مف(دەست ریس- dest rîs): ڕێسراو بەدەست، دەستڕێس.
**دست زدن**- مص.ل(دەست زەدەن- dest zeden): چەپڵەلێدان.
**دست ساز**- ص.مف(دەست ساز- dest saz): دەستکرد، بەدەست دروستکراو.
**دست شستن**- مص.ل(دەست شوستەن- dest şusten): دەست شۆردن، دەست شۆردن لە شتێ.
**دستشویی**- ا.مر(دەست شویی- dest şûyî): دەستشۆر.
**دستغاله**- ا(دەست غالە- dest xale): داسولکە.
**دستفال**- ا.مر(دەست فال- dest fal): سفتاح، هەوەڵ فرۆش، دەشت.
**دستفروش**- ص.فا(دەست فروش- dest frûş): دەسفرۆش، دەسگێڕ،

چەرچی.
**دستک**- ا(دەستەک- destek): دەست ئاسا، دەفتەرچەی حەساو.
**دستکار**- ا.ص(دەست کار- destkar): کــاری دەست، دەســتکرد، هاوکــارو هاودەست.
**دســتکاری**- ا.مص(دەســتکاری- destkarî): گۆڕین، دەستکاری، دەست لێدان.
**دستک زدن**- مص.ل(دەستەک زەدەن- destek zeden): چەپڵەلێدان.
**دستک زن**- ص.فا(دەستەک زەن- destek zen): موتریب، سەماکار.
**دستکش**- ا.مر(دەست کەش- dest keş): دەستکێش، پەنجەوانە.
**دستکش**- ص.م(دەست کەش- destkeş): دەست هێنان بە شتێکدا، گەداو سواڵکەر، هەقدەست، کارامە.
**دست کشیدن**- مص.ل.م(دەست کەشیدەن- dest keşîden): دەست هەڵگرتن، دەست پێداهێنان.
**دست کله**- ا(دەست کەلە-dest kele): هاو وێنە، هاوتا، پەتێک کە دەستی ئەسپ یان هێستری پێ دەبەستن.
**دستگاله**- ا(دەست گالە- dest gale): داسولکە.
**دستگاه**- ا.مر(دەستگاه- dest gah): سەروەت و سامان و سەرمایەی زۆر، کارگەو کارخانە، تواناو دەسەڵات، شان و شەوکەت و سەروەت، ئازای بەدەن.
**دستگرد**- ا(دەستگیرد- dest gird): شارەدێ، مەزرا، کۆشک و سەرای چەند نهۆمی.

**دست گردان**- ا.مص(دەست گەردان- dest gerdan): دەستاو دەستکردن.
**دست گزین**- ص.مف(دەست گوزین- dest guzîn): هەڵبژاردن، دەست بژێر، هەڵبژاردە.
**دست گشادن**- مص.م(دەست گوشادەن- dest guşaden): دەست کردنەوە، ئامادەبوون بۆ ئەنجامدانی کارێ، دەست بڵاو.
**دست گیر**- ص.فا(دەستگیر- dest gîr): دەستگر، کەسێک یارمەتی کەسێکی دی بداو دەستگرۆیی بکات، کەسێک دەستگیر بکرێ، یەخسیر، گیرۆدە، دەسک.
**دستگیره**- ا.مر(دەست گیرە- dest gîre): دەستگر، دەسک.
**دستلاف**- ا(دەستلاف- dest laf): هەوەڵ فرۆش، سفتاح، بێعانە، دەشت.
**دستمال**- ا.مر(دەست مال- dest mal): دەرسۆک، دەستەسڕ، دەسماڵ.
**دستمالی**- ا.مص(دەست مالی- dest malî): دەست پێداهێنان.
**دست مایه**- ا.مر(دەست مایە- dest maye): دەسمایە، سەرمایە.
**دستمرد**- ا.مر(دەست مەرد- dest merd): هاوکار، یاریدەدەر.
**دستمزد**- ا.مر(دەست موزد- dest muzd): دەسمز، کرێ، هەقدەست.
**دستنبو**- ا.مر(دەستەنبو- destenebû): شەمامە.
**دست نشانده**- ص.مف(دەست نیشاندە-

dest nişande): دەست نێژ، کەسێک کە بە ویستی کەسێکی دی لە سەر کارێک دانرابێ و گوێڕایەڵی ئەو بێ.
**دست نماز**- ا.مـــــر(دەست نماز- dest nmaz): دەست نوێژ.
**دست نوشت**- ا.ص(دەست نوشت- dest nûşt): دەستنووس، دەست خەت، نامە.
**دستوار**- ا.ص(دەستڤار- destvar): دەست ئاســا، دار دەست، دارعـەســا، کەلەپچە.
**دستوار**- ا.ص(دەستڤار- destvar): هاوکار، یاریدەدەر.
**دستوان**- ا.مر(دەست ڤان-dest van): کـەلەپچـە، بازن، بازوبەند، دەسـتـەوانە، پەنجەوانە، دەستکێش.
**دستور**- ا(دەستور- destûr): یاساو ڕێسا، ڕێچکەو ڕێباز، فەرمان، دەستور.
**دستور**- ا.ص(دەستور- destûr): خـاوەن کـورسی، وەزیرە، راوێژکـار، کـاری دەستی.
**دسته**- ا(دەستە- deste): دەست ئاسا، دەسـتـە، تاقم، گـروپ، دەسک: دەسکی خەنجەر، دەسکی تەور، چەپک، تیپ.
**دستەبندی**- ا.مص(دەستـەبەندی- deste bendî): تاقـمـبـەندی، تاقم تاقمێنە، دەستەبەندی، دەستەسازکردن دژی کەسێک یان کۆمەڵێک، کۆمەڵسازی.
**دستەدار**- ص.مـر(دەستـەدار- deste dar): دەسکدار، سـەردەسـتـەو فەرماندەی دەستەیەک لە سوپا.
**دستیاب**- ص.فـا(دەست یاب- dest yab): دەسـتـکەوت، بە دەست هاتوو، بەدەست هێنراو، دەستکەفت.
**دستیار**- ا.ص(دەستیار- destyar): یاریدەدەر، هاوکار.
**دستیاره**- ا.مـر(دەست یارە- dest yare): کەلەپچە، بازن.
**دست یازیدن**- مص.ل(دەست یازیدەن- dest yazîden): دەست درێژکردن.
**دست یافتن**- مص.م(دەست یافـتـەن- dest yaften): سـەرکـەوتن، دەسـەڵات پەیداکردن.
**دستینه**- ا(دەستـینە- destîne): کەلەپچە، بازن، دەستکێش، ئیمزا.
**دسر**- ا.فر(دیسیر- disir): میـوە یان شیرینی دوای نان خواردن.
**دسکره**- ا(دەسکەرە- deskere): دێ، شارۆچکە، دێر، یانە.
**دسم**- ا.ع(دەسەم- desem): چەوری، پیو، چەوری گۆشت.
**دسم**- ص.ع(دەسیم- desim): چەور، پڕ ڕۆن.
**دسوک**- ا(دەسوک- desûk): ئاردە مـشـار، چیلکەی باریک، تەراشـەدارو تەختە.
**دسومت**- مص.ع(دوسـومـەت- dusûmet): چەوری، چەوربوون.
**دسیس**- ص.ع(دەسیس- desîs): ریاکار، کەسێک کە بە نهێنی نێردرابێتە شوێنێ بۆ وەدەست هێنانی خەبەر، شتێک کە لە ژێر گلدا شاردرابێتەوە.
**دسیسه**- ا.ع(دەسیسە- desîse): دەسیسە، پیلان و فێڵ.
**دسی گرم**- ا.فـر(دەسی گـرام- desî gram): ١ لەسەر ١٠ی گرام.

**دسی لیتر**- ا.فر(دەسی لیتر- desî lîtir): دەیەکی لیتر.

**دسیم**- ا.فر(دیسیم- disîm): دەیەکی فرانک.

**دسی متر**- ا.فر(دیسی میتر- disî mitr): دەیەکی مەتر.

**دش- (دوش- duş):** پێشگرەو لە بەرایی وشەوە دێ و مانای دژو خراپ دەدا وەک: دشمن= دوژمن.

**دش**- ا(دەش- deş): خۆنواندن، هاوتا، هاوشێوە.

**دشارژ**- ا.فر(دیشارژ- dişarj): هاتنە خوارەوەی بارگە.

**دشپل**- ا(دوشپیل- duşpil): لو، غودە.

**دشت**- ا(دەشت- deşt): دەشت، سارا، بیابان، زەوی پان و هەموار.

**دشت**- ا(دەشت- deşt): سفتاح، داشت، هەوەڵفرۆش.

**دشتان**- ص(دەشتان- deştan): بێنوێژ، ژنی حەیزدار.

**دشتبان**- ا.ص(دەشت بان- deşt ban): نیگابانی دەشت، پاسەوانی مەزرایان پاوەن، دەشتەوان.

**دشتک**- ا(دەشتەک- deştek): پز، پیزە، تۆڵ، جەنین.

**دشتی**- ص.ن(دەشتی- deştî): سەحرایی، دەشتەکی، دەشتی، ناوی ئاهەنگێکی مۆسیقی ئێرانییە.

**دشتی**- ا(دوشتی- duştî): زالو، زەروو.

**دشتیاد**- ا(دوشتیاد- duştyad): غەیبەت، پاشملەوێژی.

**دشخوار**- ص(دوش خار- duşxar): دژوار، سەخت، زەحمەت، ئاستەنگ.

**دشک**- ا(دەشک- deşk): داوی درومان.

**دشمن**- ا.ص(دوشمەن- duşmen): دوژمن، نەیار، دژمن.

**دشمنایگی**- ا.مص(دوشمەنایەگی- duşmenayegî): دژمنایەتی.

**دشمن پرور**- ص.فا(دوشمەن پەرڤەر- duşmen perver): دژمن پەروەر.

**دشمن رو**- ص.مر(دوشمەن رو- duşmen rû): دژمن ئاسا، کەسێک کە خەڵکی حەز لە چارەی نەکەن.

**دشمن شکر**- ص.فا(دوشمەن شیکەر- duşmen şiker): دژمن شکێن.

**دشمن کام**- ص.مر(دوشمەن کام- duşmen kam): بەدبەخت، کەسێک کە وەزع و حاڵی بە کەیفی دژمن بێ.

**دشمن کش**- ص.فا(دوشمەن کوش- duşmen kuş): دژمنکوژ.

**دشنام**- ا.مر(دوشنام- duşnam): جوێن، جنێو، دژوێن، سخێف.

**دشنگ**- ا(دەشەنگ- deşeng): هەڵواسراو، هێشوی خورما.

**دشنگی**- ا(دەشەنگی- deşengî): رۆژگار، دنیا.

**دشنه**- ا(دیشنە- dişne): خەنجەر، کێردی تیژو نوک باریک.

**دش نهاد**- ص.مر(دوش نیهاد- duş nihad): بەدخوو، بەد سروشت.

**دشوار**- ص(دوشڤار- duşvar): دژوار،

سەخت، زەحمەت.

**دشوارپسند**- ص.فا(دوشڤار پەسەند- duşvar pesend): درژپەسەند، کەسێک بەزەحمەت شتێ پەسند بکات.

**دشوار رو**- ص.مر(دوشڤار رەو- duşvar rew): رێگەیەک کە تێپەڕبوون پێیدا زەحمەت بێ.

**دشواریاب**- ص.مر(دوشڤاریاب- duşvar bar): دژوار رەس، دوورەدەس.

**دعاء**- ا.ع(دوئاء- dua’): پاڕانەوە لە خوا.

**دعائیم**- ا.ع(دەئائیم- deaîm): کۆڵەکە، پایە.

**دعاب**- ص.ع(دەئاب- de’ab): گاڵتەچی، سوعبەتچی، حەنەکچی.

**دعابه**- مص. ع(دەئابە-de’abe ): سوعبەت کردن، گاڵتەکردن.

**دعات**- ا.ع(دوئات- du’at): بانگەوازکاران، دوعاکاران، کەسێ کە خەڵکی بۆ سەر ئایینی خۆی بانگ بکا.

**دعامه**- ا.ع(دیئامە- diame): کۆڵەکە، پایە، سەروەرو پێشەوای قەوم.

**دعاوی**- ع(دەعاڤی- deavî): مرافەعە، هۆ.

**دعب**- مص.ع(دەئب- de’b): گاڵتەکردن، شۆخی کردن.

**دعبل**- ا.ع(دیئبیل- di’bil): هێلکەی قورباقە.

**دعت**- ا.ع(دەئەت- de’et): تەنایی و ئاسایش و خۆشگوزەرانی.

**دعوات**- ع(دەئەڤات- de’evat): بانگهێشتن.

**دعوت**- مص. ع(دەئڤەت- de’vet): دوعا، پاڕانەوە، بانگهێشتن.

**دعوی**- مص.ع(دەئڤا- de’va): شەڕ، ناخۆشی.

**دعی**- ص.ع(دەئی- de’î): زڕ کوڕ.

**دغ**- ص. (دەغ- dex): زەوی رەقەن کە هیچی لێ نەڕوێ، سەری کەچەڵ و بێ قژ، دەغسەر.

**دغا**- ص(دەغا- dexa): دەغەڵ، زێڕو زیوی قەڵب، فڕوفێڵ.

**دغال**- ع(دیغاڵ- dixal): حیلەگەران، دەغەڵبازان، قەڵب.

**دغدغان**- ا(دەغ دەغان- dexdexan): جۆرە درەختێکە.

**دغدغک**- ا(دەغ دەغەک- dex dexek): جۆرە دەوەنێکە.

**دغدغه**- مص. ع(دەغدەغە- dexdexe): ختوکەدان، ختیلکەدان، ترس و نیگەرانی و مشەوەشی.

**دغدو**- ا(دوغدو- duxdû): کچ، ناوی دایکی زەردەشتە.

**دغسر**- ص. مر(دەغ سەر- dex ser): سەر رووتاوە، کەچەڵ.

**دغل**- ص. (دەغەل- dexel): نادروست، قەڵب، حیلەباز، شوێنی چڕە دارستان.

**دغلکار**- ص.مر(دەغەلکار- dexelkar): فێڵباز، حیلەکار، دەغەڵباز.

**دغول**- ص(دەغول- dexûl): فێڵباز، حیلەکار.

**دف**- ا(دەف- def): دەف.

**دفائن**- ا.ع(دەفائین- defa’in): گەنجینە، ڤەشێرتیان.

**دفـــاتر**- ا.ع(دەفــــاتیــــر- defatir): دەفتەران.
**دفـــــاع**- مص. ع(دیفـــــاء- difa’): بەرەڤانی، بەرگری.
**دفـاف**- ص.ع(دەفــفـــاف- deffaf): وەستای دەف، دەفساز، دەفژەن.
**دفتر**- ا(دەفتەر- defter): دەفتەر.
**دفـتـرچە**- ا(دەفـتـەرچە- defterçe): دەفتەری بچووک.
**دفـــتـــرخــانە**- ا.مــر(دەفـــتـــەرخـــانە- defter xane): ئیــدارەی کــارگــێــڕی میری.
**دفـــــتــــــردار**- ا.ص(دەفـــــتـــــــەردار- defter dar): نووســــــەری گــــــەورەی ئیدارە.
**دفتر روزنامە**- ا.مر(دەفـتـەری روزنـامە- defteri rûzname): دەفــــتـــــــەری حــیــســـاب، دەفــتــەرێکە کــە بازرگــان و معامەلەچی کڕین و فرۆتنی رۆژانەی خۆی تێدا تۆمار دەکات.
**دفـــتـــر کل**- ا.مـــر(دەفــتـــەری کـــول- defteri kul): دەفــتــەرێک کـە قــەرزو داوای تیــجــارەتخــانەیەکی تێــدا تۆمــار دەکرێ.
**دفـتـرنمایندە**- ا.مـر(دەفــتــەری نمایندە- defteri nmayînde): ئەندیکاتور.
**دفـتریار**- ا(دەفـتـەریار- defter yar): یاریدەدەری بەڕێوەبەری گشتی.
**دفـتـە**- ا(دەفـتـە- defte): کـەڵکیت، کەرکیت، شانەی تەون.
**دفزک**- ص(دەفزەک- defzek): گەورە، زل، زەلام، ئەستور، قەڵەو.
**دفـــــع**- مــــــص. ع(دەفــــــع- def’): دوورخستنەوە.
**دفــعــە**- ا.ع(دەفــئــە- def’e): یەک کەڕەت، یەک جار.
**دفـــــق**- مـــــص. ع(دەفــــغ- defx): هەڵقوڵینی ئاو، رژانی ئاو.
**دفک**- ا(دەفـەک- defek): نیـشـانەی تیر، هەدەف.
**دفلی**- ا.ع(دیفــــلا- difla): جـــــۆرە گیایەکە.
**دفن**- مص. ع(دەفـن- defn): ناشـتن، بەخاک سپاردنی مردوو.
**دفـنـاس**- ص.ع(دیـفـنـاس- difnas): کەودەن، گەوج، بەخیل، هیچ و پوچ.
**دفنوک**- ا(دەفنوک- defnûk): ژێرزین، نەرمین.
**دفــوف**- ا.ع(دوفــوف- dufûf): دەف، کۆی دەف، دایەرە.
**دفـە**- ا(دەفـفـە- deffe): کـەرکـیت، کەڵکیت.
**دفـە**- ا.ع(دەفـفـە- deffe): سـوکـانی کەشتی.
**دفـیلە**- ا.فر(دیفـیلە- difîle): نمایشی ســەربازی لەبەردەم پاشـا یان یەکــێک لە فەرماندەو میرە گەورەکانی سوپا.
**دفین**- ص. ع(دەفین- defîn): نێــژراو، لە گۆڕنراو، ئەسپەردەی خاک.
**دفینە**- ا.ع(دەفینە- defîne): پەنهان، گــەنج، پارە یان شـتـێکی دیکە کـە لە بن خاکدا وەشێردرابێ.
**دق**- ص.ع(دیـغ- dix): ورد، بـاریـک، کەم، دیق، سیل.
**دق**- مــــص.ع(دەغ- dex): شـــکـــان، وردکردن، کوتان، لێدان.

**دق**- ا.ع(دەغـغ- dex): جـــــــۆرە قوماشێکی ناسک و گرانبەها بووە.
**دقـــاق**- ا.ص-ع(دوغـــاغ- duxax): ورد، باریک، وردەی شتێک.
**دقـاق**- ص.ع(دەغـاغ- dexax): ئارد فرۆش.
**دقت**- مص.ع(دیغـــــەت- dixxet): وردبینی، بەدیقەت، دیقەتدان.
**دقل**- ا.ع(دەغــەل- dexel): خـراترین جۆری خورما، ستـونی نێوان کەشتی کە چارۆکەکانی پێوە دەبەستن. کۆڵەکە.
**دقــیق**- ا.ص(دەغـــیغ- dexîx): ورد، باریک، کەم، نەرم، ئارد، کـاری نهـێنی و دژوار.
**دقــیقــە**- ا.ص(دەغـیـغـە- dexîxe): ١ لەسەر ٦٠ سەعات.
**دک**- ا.ص(دەک- dek): زەوی وشک و سەخت، رەقەن، کەچەڵ، سەرتاش.
**دک**- ا.ص(دەک- dek): دەرۆزە، گـەدا، بناغەی دیوار، بەش.
**دک**- مــــــص.ع(دەکـــــک- dekk): رووخـاندنی دیوار یان بینا و تەختـکردنی لەگـەڵ ئەرزا، رێکخـستنی بەرزی و نزمی زەوی.
**دک**- ا.ص.ع(دەکـــک- dekk): زەوی هەموار.
**دکاک**- ا.ع(دیکاک- dikak): سـەکـۆ، دوکانچە.
**دکـاکین**- ا.ع(دەکـاکین- dekakîn): دوکان و موغازان.
**دکاگرم**- ا.فر(دیکاگرم- dikagrm): دەگرام، دێکاگرام.
**دکالیـتر**- ا.فـر(دیکالیـتر- dikalîtr): دەلیتر، دێکالیتر.
**دکامتمر**- ا.فر(دیکامیتر-dikamitr): دەمەتر، دێکامەتر.
**دکــــــان**- ا.ع(دوککـان- dukkan): دوکان.
**دکـــــــاندار**- ا.ص(دوکـــــــــانـدار- dukandar): دوکاندار.
**دکـاوە**- ص.فـر(دیکاڤـە- dikave): دۆڕاوی قومار.
**دکتر**- ا.فر(دوکتۆر- duktur): دکتۆر، تەبیب، پزیشک، حەکیم، لوقمان.
**دکـتـرا**- ا.فـر(دوکـتـورا- duktora): پلەی دکتۆری، دکتۆرانامە.
**دکترس**- ا.فر(دوکتوریس- duktûris): ئافرەتێ کە لە پزیشکیدا دکتۆرای هەبێ.
**دکترین**- ا.فر(دوکتورین- dukturîn): رێباز، باوەڕ، بۆچوون، بیر، تیۆری.
**دکـــســـتــروز**- ا.فــر(دیکســـتـــرۆز- dikstroz): گلۆکۆز.
**دک شـــــدن**- مـص.ل(دەک شـــــودەن- dek şuden): رۆییشتنی بە خشکەیی و ون بوون.
**دک کـــــردن**- مص. م(دەک کـــــەردەن- dek kerden): وەدەرنانی کەسێک بە بیانوویەک.
**دکل**- ا(دەکـەل- dekel): کـۆڵەکـە، دیرەگ، ستوون، ئەستوون.
**دکـلان**- ا(دوکـلان- duklan): تەشی، نەتەرە.
**دکلمـە**- ا.فـر(دیکلەمـە- dikleme): بـابەتـێـک بـە دەنگـی بـەرزو بـە ئـاو وتـاو لەبەر بخوێنرێتەوە.
**دکمـە**- ا(دوکـمـە- dukme): دوگـمـە،

قۆپچه.
**دکوپاژ**- ا.فر(دیکوپاژ- dikopaj): مۆنتاژی فیلم.
**دک و پوز**- ا.م(دەک و پوز- dekû pûz): دەم و قەپۆز.
**دک و دیم**- ا.م(دەک و دیم- dek û dîm): سەروسورەت، سەروسەکوت.
**دکور**- ا.فر(دیکۆر- dikor): دیکۆر.
**دکوراتور**- ا.فر(دیکوراتور- dikoratûr): دیکۆرساز، دیکۆریست.
**دکوراژه**- ص.فر(دیکوراژه-dikoraje): نا ئومێد.
**دکوراسیون**- ا.فر(دیکوراسیون- dikorasyûn): رازاندنەوەی دیکۆرات، کاری دیکۆرسازی.
**دکومانتر**- ص.فر(دیکومێنتەر- dikûmênter): دیکۆمێنتی، بەڵگەنامەیی، فیلمی بەڵگەنامەیی.
**دکه**- ا.ع(دەککە- dekke): سەکۆ، دوکانچە.
**دگ دگ**- ا(دەگ دەگ- deg deg): پێکادانی ددان لەسەرما، دانەرچێ، دانەچۆقە.
**دگر**- ق.ص(دەیگەر- diger): ئیدی، ئەوی تر.
**دگردیس**- ص.م(دیگردیس- digrdîs): میتامۆرفۆز، مەسخ.
**دگرسان**- ص.م(دیگەرسان- digersan): جۆرێکی دی.
**دگرگون**- ص.م(دیگەرگون- digergûn): جۆراوجۆر.
**دگماتیسم**- ا.فر(دۆگماتیزم- dogmatîm): باوەڕی بنچبڕ، فەلسەفەو تێورییەکی ئایینە کە پەیڕەوانی باوەڕیان وایە مەسەلە میتافیزیکییەکان دەکرێ بە میتۆدی زانستی روون بکرێتەوەو بچییە بنج و بناوانی هەقیقەتەکانی.
**دگماتیک**- ص. فر(دوگماتیک- dogmatik): ئایینی.
**دگنک**- ا(دەگەنەک- degenek): داردەستێکی زێڕینە کە لە کۆندا (بەتایبەتی لە سەردەمی سەفەوی و قاجارییەکاندا) مامورانی تەشریفاتی دەربار بە دەستیانەوە دەگرت.
**دل**- ا(دیل- dil): دڵ.
**دل**- مص.ع(دەلل- dell): نازکردن، نازکردنی ژن بە سەرمێردا، سەلاری و سەنگینی، چاک رەوشت.
**دلار**- ا. انگل(دۆلار- dolar): دۆلار.
**دلارا**- ص.فا(دیلارا- dilara): دلبەری جوان، ماشوقە، شتێک کە مایەی خۆشی دڵ بێ.
**دلارام**- ص.فا(دیلارام- dilaram): دلبەر، ئارامبەخشی دڵ.
**دلارام**- ص.فا(دیلارام- dilaram): دلبەر، ئارامبەخشی دڵ.
**دلازار**- ص.فا(دیلازار- dilazar): شتێ کە مایەی شکانی دڵ بێ، ئازار دەری دڵ، ماشوقەی دڵشکێن.
**دل ازردن**- ص.م(دیل ئازەردەن- dil azerden): دڵ یەشاندن، دڵ ئازاردان، رەنجاندنی کەسێک.
**دل اسا**- ص.فا(دیل ئاسا- dil asa): ئاسودە دڵ.

**دل اشـــوب**- ص.فـــا (دیـل ئاشـــوب- dil aşûb): بێــتــاقــەت، نیگەران، دڵ بەخەم و پەژارە.
**دل افـــروز**- ص.فـــا (دیـل ئەفـــروز- dil efrûz): ڕۆشنکەرەوەی دڵ، شـتێ یان کەسێک کە دڵ خۆش بکات.
**دل افـــرده**- ص.مـر(دل ئەفـــسوردە- dil efsurde): دڵ بەخـــەم، خـــەمین، دڵتەنگ، غەمگین.
**دل افـگـار**- ص.مـــــر(دیـل ئـەفـگـار- dil efgar): دڵبرین، دڵ بەخەم.
**دلاک**- ص.ع(دەللاک- dellak): ناتر، دەلاکی گەرماو، سەرتاش، بەربەر.
**دل اگـــاه**- ص.مـــــر(دیل ئاگـــاه- dil agah): زانا، هوشـیـــار، ئاقڵ و دووربین.
**دلال**- مص. ع(دلال- delal): نازکردن، نازکـردنی ژن بە سـەر مـێـردا، ویقـار، سەلاری و سەنگینی.
**دلال**- ا.ص- ع(دەلـــــلال- dellal): دەلاڵ، نێواچی بەینی کڕیارو فرۆشیار.
**دلالت**- مص. ع(دەلالـەت- delalet): بەڵگەو دەلیل، سەلماندن، ڕێنوێنی کـردن، ڕێنوێنی کرن بەرێگەی ڕاستیدا.
**دلالــه**- ص.ع(دەلـــلالـــە- dellale): قـەوێدە، ژنێ کە ژن بۆ پیاوان پەیدا بکا، ژنێ کە قەحپە بۆ پیاوان پەیدا بکا.
**دلام**- ا(دیلام- dilam): نێزەی کورت، فرۆفێڵ، حیلە.
**دلام**- ا.ص.ع(دەلام- delam): ڕەش.
**دل اندروا**- ص.مـــر(دیـل ئـاندرڤـــا- dil andrva): دڵتـــەنگ، نیـگـەران، پەرێشان، پەریشان، شپرزە.

**دل انگیـــز**- ص.فـــا (دیـل ئەنگیـــز- dil engîz): دڵخۆشکەر، دڵکەرەوە.
**دلاوەر**- ص(دیلاڤەر- dilaver): بەدڵ، دلاوەر، بوێر، ئازا، جەنگاوەر.
**دلاویز**- ص(دیلاڤـیـــز- dilavîz): دڵگیر، دڵڕفێن، پەسند.
**دلایل**- ا.ع(دەلایل- delayîl): بەڵگە.
**دلب**- ا.ع(دولب- dulb): داری چنار.
**دل باختن**- مص. ل(دیل باخـتـــەن- dil baxten): ئاشقبوون، شەیدا بوون.
**دلبــاخــتــه**- ص.فـا (دیل باخـتــە- dil baxte): شەیدا، عاشق.
**دلباز**- ص.مر(دیلباز- dilbaz): دڵواز، دڵکراوە، شـوێنێکی خـۆش و بەسـەفـاو دڵگیر، بەزمان.
**دلبـــر**- ص.فـــا (دیل بەر- dilber): گـراوی، مـەحـبـوبە، دلبـەر، خۆشـەویست، کەسێک بە جوانی خۆی خەڵکانێ شەیدای خۆی بکات.
**دل برداشتن**- مص.ل(دیل بەرداشـتــەن- dil berdaşten): چاوپۆشی کـردن، دڵ تۆران لە کەسێک یان شتێک، وازهێنان.
**دل بـــردن**- مـــص.م(دیـــل بـــوردەن- dil burden): دڵ بردن.
**دل برکندن**- مص. ل(دیل بەرکـــەندەن- dil berkenden): دڵ هـەڵـکـەنـدن، زویربوون لە کەسێک یان شتێک.
**دل بستن**- مص.ل(دیـل بەســـتـــەن- dil besten): عـاشق بوون، دۆستایەتی پەیدا کردن.
**دلبند**- ص.مـر(دیـل بەند- dil bend): خۆشـەویسـتی دڵ، کەسێک کە لە ناخی دڵەوە خۆش بویسـترێ، گـراوی، مـاشـقـە،

بەندی دڵ.

**دلبوث**- ا.ع(دەل بوس- del bûs): جۆرە گیایەکە.

**دلپەزیر**- ص.مف(دیل پەزیر- dil pezîr): پەسندی دڵ، دڵپەزێر، دڵبەند، لەبەر دڵان.

**دلپسند**- ص.مف(دیل پەسەند- dil pesend): دڵپەسەند، دڵخواز، پەسند.

**دل پیچه**- ا.مر(دیل پیچە- dil pîçe): پێچ بە سکا هاتن، سکچوون.

**دلتا**- ا.فر(دیلتا- dilta): دەلتا، وەکو دەلتای نیل، پارچە خاکیکی سێ گۆشەی دوڕگە ئاسایە لە رێژگەی رووباران بەهۆی بن نانەوەی قوڕە لیتەو ئاو ماڵکە دروست دەبێ و رووبارەکە دەکا بە دوو لقەوە.

**دلتنگ**- ص.مر(دیلتەنگ- dilteng): خەمین، خەمگین، دڵتەنگ.

**دلجو**- ص.مر(دیل جو- dilcû): پەسندی دڵ، دڵخواز، میهرەبان، نەوازشکەر، دڵدەرەوە، میهرەبان.

**دلچسب**- ص.مر(دیلچەسپ- dilçesp): دڵپەزیر، شتێ بنووسێتە دڵەوە، دڵپەسند.

**دلخراش**- ص.فا(دیل خەراش- dil xeraş): شتێ کە دڵ ئازار بدات، شتێ کە مرۆڤ برەنجێنێ و خەمباری بکات.

**دلخسته**- ص.مر(دیل خەستە- dil xeste): دڵ بریـن، دڵشکاو، خەمبار، دڵ بە ژان.

**دل خواسته**- ص.مف(دیل خاستە- dil xaste): دڵخواز، بە گوێرەی حەزو ئارەزووی دڵ.

**دلخواه**- ص.مف(دیل خاهـ- dil xah): دڵخواز، خواست و حەزی دڵ، بەدڵ.

**دلخور**- ص.مر(دل خور- dil xûr): رەنجاو، مەلول، دڵشکاو، خەمبار.

**دلخوش**- ص.مر(دیل خوش-dil xûş): شاد، دڵخۆش، خۆشحاڵ، رازی.

**دلخون**- ص.مر(دیل خون- dil xûn): خەمبار، دڵبرین، دڵشکاو.

**دل دادن**- مص.ل(دیل دادەن- dil daden): دڵدان بە شتێک، عاشق بوون.

**دلداده**- ص.فا(دیلدادە- dildade): شەیدا، دڵدار، ئەڤیندار.

**دلدار**- ا.ص(دیل دار- dildar): دلبەر، ماشقە، دڵدەرەوە.

**دلدار**- ص.مر(دیلدار- dildar): دلێر، دلاوەر، ئازا، بەدڵ، بە جەرگ.

**دل درد**- ا.مر(دل دەرد- dilderd): سک یەشە، ژانەزگ.

**دلدل**- ا.ع(دولدول- duldul): ژیشک، سیـچەر، ناوی هێسترەکەی ئیمامی عەلییە.

**دل دل کردن**- مص.ل(دیل دیل کەردەن- dil dil kerden): دوو دڵی کردن، راڕایکردن.

**دل دل کنان**- ق.ص(دیل دیل کونان- dil dil kunan): بە نیگەرانی و دوو دڵییەوە.

**دلدوز**- ص.فا(دیل دوز- dil dûz): شتێ کە کار لە دڵ بکا، وەکو تیری مژەی دلبەر لە دڵی دڵدار.

**دلربا**- ص.فا(دیل روبا- dil ruba):

دڵڕفێن، زۆر جوان.
**دل ریسه**- ا.مر(دیل رێسه- dil rîse): زەحفکردنی دڵ، بێتاقەتبوون لە برسا، زافکردنی دڵ لە برسا.
**دلریش**- ص.مر(دیل ریش- dil rîş): دڵبرین، دڵبەژان، دڵڕەنجاو، دڵتەنگ و لێو بەبار.
**دل زنده**- ص.مر(دیل زینده- dil zinde): دڵ وریا، شادمان، دڵخۆش، چالاک.
**دل ستان**- ص.فا(دیل سیتان- dil sitan): دڵ ئەستێن، دڵڕفێن، دڵبەر، ماشوقە.
**دلسرد**- ص.مر(دیل سەرد- dil serd): نائومێد، بێتاقەت، خەمبار.
**دلسوخته**- ص.مر(دیل سوختە- dil sûxte): دڵسوتاو، دڵ بە ئازار، دڵبرین، ستەمدیدە، مسیبەت بار، خەمناک.
**دلسوز**- ص.فا(دیل سوز- dil sûz): دڵسۆز، خەمخۆر، بەزەیی و میهرەبانی.
**دلسوزه**- ا.مص(دیل سوزه-dil sûze): دڵسۆزی، میهرەبانی، خەمخۆری، دڵ سوتان لە سۆزو بەزەییەوە یان لە حەسودی و بەغیلیدا.
**دل سیاه**- ص.مر(دیل سیاه- dil sîyah): دڵڕەش، بەدخواز، بەدخوو، دڵڕەق.
**دلشاد**- ص.مر(دیل شاد- dil şad): دڵشاد، شادمان، خۆشحاڵ، بەکەیف، بەدەماخ.
**دل شب**- ا.مر(دیلی شەب-dili şeb): ناوەندی شەو، جەرگەی شەو.

**دلشده**- ص.مر(دیل شوده-dil şude): ئاشق، ئاشقێنی، گەوج، نەزان، شێتی.
**دل شکستن**- مص.م(دیل شیکەستەن- dil şikesten): دڵ شکاندن، رەنجان، بێزارکردن.
**دل شکن**- ص.فا(دیل شیکەن- dil şiken): دڵشکێن.
**دلشکسته**- ص.مف(دیل شیکەستە- dil şikeste): دڵشکاو، رەنجاو، لێوبەبار.
**دلفروز**- ص.فا(دیل فوروز- dil furûz): رۆشنکەرەوەی دڵ، دڵخۆشکەر، مایەی خۆشی دڵ.
**دل فگار**- ص.م(دیل فەگار- dil fegar): خەمبار، نارەحەت، پەشێو.
**دلفین**- ا. یو(دولفین- dulfîn): جۆرە ماسییەکی گەورەیە، دۆلفین.
**دلق**- ا.ع(دەلەغ- delex): پشیلەی کێوی، دەڵەک.
**دلق**- ا(دەلیغ- delix): خەرقە، پەلاس، جلی دەروێشی، پەستەک.
**دلقک**- ا(دەلغەک- delxek): لیبۆک، قەشمەر.
**دلک**- مص. ع(دەلک- delk): شێلان.
**دلکش**- ص. فا(دیل کەش- dil keş): دڵڕفێن.
**دلکو**- ا. انگل(دیلکۆ- dilko): دیلکۆ.
**دلکور**- ص.مر(دیل کور- dilkûr): کەودەن، گەلحۆ، بێ زەوق، دڵڕەش.
**دلگزار**- ص.فا(دیل گوزار- dil guzar): تاقەتبەر، بێزارکەر، خەمهێن.

**دلگران**- ص.مر(دیلگەران- dil geran): دڵتەنگ، رەنجاو، بێزار، داماو، مەلول.
**دلگرم**- ص.مر(دیل گەرم- dil germ): ئاسودە، شاد، ئومێدەوار.
**دل گسل**- ص.فا(دیل گوسەل- dil gusel): دڵ پچڕێن.
**دلگشا**- ص. فا(دیلگوشا- dil guşa): دڵکەرەوە، دڵخۆشکەر، جوان، خۆش.
**دلگیر**- ص.فا(دیل گیر- dil gîr): غەمناک، مەلول، دڵتەنگ، دڵگیراو.
**دلم**- ا(دولوم- dulum): ئاوڵە، زیپکە.
**دلم**- مص.ع(دەلەم- delem): رەشبوونەوە.
**دلماء**- ص.ع(دەلماء- delma’): تاریکە شەو، شەوەزەنگ، رەش و نەرم و خز.
**دلمرده**- ص.مر(دیل مورده- dil murde): دڵ مردوو، دڵتەنگ، دڵتەنگ، بێ زەوق، مەلول، بێزار.
**دلمک**- ا(دول مەک- dul mek): مڵە، روتەیل.
**دلمل**- ا.ص(دولمول- dul mul): نەگەییو، فەریک.
**دلمه**- ا(دولمە- dulme): دۆڵمە، یاپراخ.
**دلمه**- ا.ص(دەلەمە- deleme): دەڵەمە.
**دلنشین**- ص.فا(دیلنەشین- dil neşîn): دڵگیر، شتێ کە دڵ بیگرێ، پەسندی دڵ.
**دلنگ**- ا.ص(دیلەنگ- dileng): هەڵواسراو، هێشوی خورما.
**دلنگان**- ص(دیلەنگان- dilengan): هەڵواسراو، ئاوێزان.
**دلنگران**- ص.مر(دیل نیگەران- dil nigeran): نیگەران، شڵەژاو، دڵ ناڕەحەت.
**دلنواز**- ص.فا(دیل نەڤاز- dil nevaz): دڵنەواز، دڵپەزێر، دڵدەرەوە، مایەی ئارامی دڵ.
**دل نهادن**- مص. ل(دیل نیهادەن- dil nihaden): دڵدان بە شتێک.
**دلو**- ا.ع(دەلڤ- delv): سەتڵ، دەولک، بورجی دەلو (سەتڵ).
**دلواپس**- ص.مر(دیل ڤاپەس- dil vapes): نیگەران، ناڕەحەت، چاوەنۆڕ، مەلول و دڵتەنگ.
**دلوار**- ص(دیل ڤار- dil var): دلێر، دلاوەر، بوێر، رەشید، ئازا.
**دلوک**- مص. ع(دولوک- dulûk): بەرەو ئاواچوونی خۆر.
**دلوک**- ا.ع(دولوک- dulûk): خۆرئاوابوون.
**دله**- ا(دەلە- dele): جانەوەرێکی گۆشتخۆرە لە سمۆرە دەچێ و بە ئەندازەی پشیلەیەکە، پشیلەکێوی، دەڵەک.
**دله**- ص(دەلە- dele): هەرزە، بەرەڵڵا، چاو لەوەڕێن، حیزەڵەدز، حیزەدزی.
**دلهام**- ا.ع(دیلهام- dil ham): شێر، مێری دلێرو گورج و گۆڵ.
**دلهره**- ا.مص(دیلهورە- dil hure): دڵەخورپێ، دڵ داخورپان، نیگەرانی، دڵەڕاوکێ.
**دلهم**- ا.ص.ع(دەلهەم- delhem):

زەردەشتیدا.

**رش**- ا(رەش- reş): رەخش، ئەسپەکەی رۆستەمی زاڵ.

**رش**- مـــــص. ع(رەشـــــش- reşş): ئاوپرژێن، ئاوڕشێن، بارینی وردە باران.

**رش**- ا.ع(رەش- reş): وردە بـــــاران، بارانی کەم.

**رشاء**- ا.ع(ریشاء- rişa): کندر، پەت، رست، گوریس

**رشــاد**- مص. ع(رەشــاد- reşad): لە گومڕایی دەرچوون، بەڕێی راستا رۆییشتن، سەرکەوتن.

**رشاد**- ا.ع(رەشاد- reşad): تەرەتیزە، کەرەوز.

**رشــــــادت**- ا. مـص(رەشـــــــادەت- reşadet): رەشـیدی، دلێـری، دلاوەری، ئازایەتی.

**رشاش**- ا.ع(رەشاش- reşaş): ئاو یان فرمێسک یا خوێن کە بتکێ یان بپرژێ.

**رشـــاقت**- مص. ع(رەشـــاغــــەت- reşaxet): خـۆش قـەدو بالا، بەژنو بالا بەرزو باریک.

**رشت**- ا(رەشت- reşt): رزیـو، دارزاو، گەردو غوبار، تەپ و تۆز، خاک و خۆڵ.

**رشـتاک**- ا.(رەشـتـاک- reştak): لقی تازە، نەمام، خەڵف.

**رشتن**- مص.م(ریشــتــەن- rişten): رستن، رستنی خوریو لۆکەو ئەو شتانە بە تەشی.

**رشته**- ا.مف(ریشـتە- rişte): رێسراو.

**رشـتـه**- ا(ریشـتـە- rişte): داو، دەزوو، پەت.

**رشـتـه**- ا(ریشـتـە- rişte): هەڕشـتـە.

**رشــتــه**- ا(ریشـــتــە- rişte): جــۆرە نەخۆشییەکە.

**رشـتـەبرشـتـه**- ا.مـر(ریشـتـە بریشـتـە- rişte birişte): شەعریە.

**رشـتـه فـرنگی**- ا.مـر(ریشـتـە فـەرەنگی- rişte ferengî): هەڕشـتـەی فـەڕەنگی، ماکەرۆنی.

**رشح**- مـص.ع(رەشـــه- reşh): تکان، تکانی ئاو، چۆڕانی عارەق لە بەدەن.

**رشح**- ا.ع(رەشـــه- reşh): ئارەقـــە.

**رشـحـه**- ا.ع(رەشـهـە- reşhe): تکە، دڵۆپە، ئاوێک لەشتێ بتکێ.

**رشــــد**- مـص. ع(روشــــــد- ruşd): گـەشـەکـردن، چوونە سـەر رێگەی راست، دۆزینەوەی رێگەی راستو دروست.

**رشــــد**- مص. ع(رەشــــەد- reşed): پایەداری لەسەر رێگەی راست.

**رشــف**- مــــص. ع(رەشـــف- reşf): فڕکردن، فڕلێدان.

**رشف**- ا.ع(رەشــەف- reşf): ئەو تۆزە ئاوەی لە بنی حـــەوز یان شـــوێنی دی دەمێنێ.

**رشـــق**- مـــص. ع(رەشـــغ- reşx): تیــــرهاویشـتن، شـــەڕەتفـــەنگو... تەماشاکردنی توندوتیژی.

**رشق**- ا.ع(ریشغ- rişx): دەنگی قـەڵەم لە کاتی نووسیندا، خشەی قەڵەم.

**رشک**- ا(رەشک- reşk): حـەسـودی، بەغیلی.

**رشـک**- ا(ریـشــک- rişk): رشـک، هێلکەی ئەسپێ.

**رشكن**- ص(رەشكین- reşkin): حەسود، بەغیل.

**رشكناك**- ص(رەشكناک- reşknak): حەسود، بەغیل.

**رشكناك**- ص(ریشكناک- rişknak): رشكن.

**رشكین**- ص(رەشكین- reşkîn): حەسود، بەغیل، غیرەكەر.

**رشم**- مص. ع(رەشم- reşm): نووسین، نەخشكردن، مۆركردن.

**رشم**- ا.ع(رەشەم- reşem): جێی باران لەسەر زەوی.

**رشمه**- ا(ریشمه- rişme): رەشمه، هەوسار، رەسن، پەتی باریک، رست.

**رشمیز**- ا(رەشمیز- reşmîz): مۆریانه، مۆرانه، مۆریكه.

**رشن**- ا(رەشن- reşn): دادوەر، دادپەروەر، فریشتەی دادپەروەری لە ئاینی زەردەشتیدا، ناوی رۆژی هەژدەیەمی هەر مانگێكی هەتاوییه.

**رشن**- ا(رەشن- reşn): گرد، تەپە، هەڵەت.

**رشن**- مص. ع(رەشن- reşn): چوونه میوانی بێ بانگ كردن.

**رشن**- ا.ع(رەشەن- reşen): دەمی جۆبار، یان رووبار.

**رشوه**- ا.ع(رەشڤه- reşve): بەرتیل.

**رشوەخوار**- ص.فا(رەشڤەخار- reşve xar): بەرتیل خۆر.

**رشید**- ص.ع(رەشید- reşîd): كەسێک كە رێی راستی دۆزیبێتەوە. دلێر، رەشید، ئازاد.

**رشیق**- ص.ع(رەشیخ- reşîx): بەژن و باڵا رێک و باریک، خۆش ئەنام.

**رشینه**- ا(رەشینه- reşîne): سەمغی درەخت و دار.

**رصاد**- ص.ع(رەساد- ressad): پاسەوان، شەوگەڕ، حەس حەس.

**رصاص**- ا.ع(رەساس- resas): قورقۆشم.

**رصانت**- مص. ع(رەسانەت- resanet): رەسانەت، بتەوی، رەسەنایەتی، مەحكەم بوون، مكومی.

**رصد**- مص. ع(رەسەد- resed): روانین و چاودێری، لە حەشارگەنشتن‌و چاودێری.

**رصد**- ا.ع(رەسەد- resed): روانگە، رێگە، بۆسە، كەمین، چاودێر، نیگابان، پاسەوان.

**رصف**- مص. ع(رەسف- resf): راخستنی تەختەبەرد بە تەنیشت یەكەوە، رەسیفكردن، شۆستەكردن، هەڵچنینی چینە بەرد لە خانووبەرەدا.

**رصف**- ا.ع(رەسەف- resef): راخستنی بەرد، بەربەستی ئاو.

**رصید**- ص.ع(رەسید- resîd): چاوبڕینە شتێک، تانجی ئامادە بۆ پەلاماردانی نێچیر.

**رصین**- ص.ع(رەسین- resîn): پیاوی میهرەبان، مكوم، قایم، جێگیر.

**رضاء**- ا.مص.ع(ریزاء- riza’): دڵخۆشی، خۆشی و شادی.

**رضاع**- مص. ع(ریزاء- riza’): شیرخواردنی منالّ لە مەمكی دایک، شیردانی دایک بە منداڵ.

**رضاعت**- مص.ع(ریزائەت- riza’et): شیرەخۆری

**رضایت**- مص. ع(ریزایەت- rizayet): دڵخۆشبوون، خۆشیو شادی، قایل بوون، قادیێ بوون.

**رضح**-ا.ع(رەزھ- rezh): بەخششی کەم، پاژێکی کەم لە شتێک.

**رضخ**- ا.ع(رەزخ- rezx): بەخششی کەم، هەواڵێک بژنەونو باوەڕ نەکەن.

**رضع**- مص.ع(رەزء- ’rez): مژینی شیر لە مەمکی دایک.

**رضفه**- ا.ع(رەزفە- rezfe): کەشکەژنۆ، کاسەزرانی، کەشگەک.

**رضوان**- مص.ع(ریزڤان- rizvan): دڵخۆش بوون، قایل بوون، بە هەشت، دەرگاوان و پاسەوانی بەهەشت، بەهەشتەوان.

**رضی**- ص.ع(رەزیی- rezî): پیاوی شادو دڵخۆش.

**رضیع**- ص.ع(رەزیء- ’rezî): منالی شیرەخۆرە، برای شیری، لەگام.

**رطب**- ص.ع(رەتب- retb): تەڕو تازە، تەڕدەم.

**رطب**- ا.ع(روتەب- ruteb): خورمای تازە، خورمای تازەگەییوو. روتاب.

**رطل**- ا.ع(رەتل- retl): پێوانەیەکە بەرانبەر بە ٨٤ میسقال.

**رطل**- ص.ع(رەتل- retl): لاوی باریک ئەندام، پیاوی پیری سستو لاواز، پیاوی گەوج.

**رطوبت**- مص. ع(روتوبەت- rutûbet): شیداربوون، تەڕبوون، تەڕی، نمداری.

**رطوبت سنج**- ا.مر(روتوبەت سەنج- rutûbet seng): رتوبەت پێو.

**رطیب**- ص.ع(رەتیب- retîb): تەڕ، تەڕو تازە، نیان.

**رع**- ا(رەء- ’re): هەتاو، رۆژ، خۆر، تاڤ، خواوەندی هەتاو لەلای میسرییانی کۆن کە هەندێ لە فیرعەونەکان خۆیان بە نەوەی ئەو دەزانی، لە شێوەی شێر یا شاهێندا کە هەتاوی بەسەرەوەیە دروستیان دەکرد.

**رعاء**- ا.ع(روئاء- ’ru’a): خەڵکی رەش و رووت.

**رعات**- ا.ع(روئات-re’at): شوانان، شوانکاران.

**رعاد**- ص.ع(رەئاد- re’ad): پیاوی زۆربڵێ، زۆر وێژ، جۆرە ماسییەکە، هەورە تریشقە.

**رعاع**- ص. ع(رەئاء- ’re’a): رەش و رووت، عەوامی خەڵکی.

**رعاف**- مص.ع(روئاف- ru’af): پژانی کەپوو، بەربوونی خوێنی لوت.

**رعایا**- ا.ع(رەئایا- re’aya): رەعیەت.

**رعایت**- مص. ع(ریئایەت- ri’ayet): لەوەڕاندنی مەڕومالات، بە کاروباری خەڵکیدا گەییشتن، پاراستنی خەڵک، لایەنگری، چاودێری کردنی حورمەتو مافی خەڵکی.

**رعب**- مص. ع(روئب- ru’b): ترسان، تۆقین، زنۆقچوون.

**رعد**- ا.ع(رەئد- re’d): هەورە تریشقە.

**رعداسا**- ص.مر(رەئدئاسا-re’d asa): هەورە تریشقە ئاسا، وەکو هەورە گۆڵە.

**رعــــد انداز**- ص.فــــا (رەئد ئەنداز- re'd endaz): تۆپچی.
**رعده**- ا.ع(رەئدە- re'de): شڵەژانو لەرزین لە ترسا.
**رعشه**- ا.ع(رەئشە- re'şe): پەلە، لەز، لەرزە، لەرزۆکی لە ئەنجامی پیری یان نەخۆشیدا.
**رعناء**- ص.ع(رەئنا- re'na): ژنی خۆپەرستو حۆلو نەزانو خاو. لە فارسیدا بە مانای باڵابەرزو جوانو خشکۆک دێ.
**رعونت**- مص. ع(روئونەت- ru'ûnet): گەوج بوون، نەزانی، هەرزەوێژی.
**رعی**- مص. ع(رەئی- re'yî): لەوەڕاندن، پاراستن، سەرپەرشتی کردن.
**رعیب**- ص.ع(رەئیب- re'îb): ترسناک، ترسێنەر، ترساو.
**رعیت**- ا.ع(رەئییەت- re'îyet): رەعیەت.
**رغ**- ا(روغ- rux): قرقێنە، قرپ.
**رغائب**- ا.ع(رەغائیب- rexa'ib): شتی باشو پەسند، بەخششو دیاری.
**رغادەت**- مص.ع(رەغادەت- rexadet): خۆشگوزەرانی.
**رغام**- ا.ع(رەغام- rexam): لم، چەو و لم، خۆڵ، ئاخ.
**رغبت**- مص.ع(رەغبەت- rex bet): ویستن، ئارەزووکردن، ویست و ئارەزوو.
**رغد**- مص. ع(رەغەد- rexed): خۆشگوزەرانی.
**رغد**- ص.ع(رەغەد- rexed): ژیانی خۆشو تێروتەسەل.
**رغم**- مص. ع(رەغم- rexm): بەزاندن، زەلیلکردن، کاری پێچەوانە، رەفتارکردن بەپێچەوانەی حەزی بەرانبەر، لە خۆڵ وەردان.
**رغیب**- ص.ع(رەغیب- rexîb): زگ زل، ورگ زل، ورگن، زگن.
**رغیبه**- ص.ع(رەغیبە- rexîbe): عەتای زۆر، کاری باشو پەسند، هەر شتێکی پەسندو دڵگیر.
**رغید**- ص.ع(رەغید- rexîd): ژیانی خۆش.
**رغیف**- ا.ع(رەغیف- rexîf): کولێرە، نان، گونکی هەویر.
**رف**- ا(رەف- ref): رەفە، رەفک، رەفکە.
**رف**- ا.ع(رەفف- reff): رەڤۆ، رەوگە، ران، مێگەل، دەستە، پۆلی مەلان.
**رفاء**- ا.ع(ریفاء- rifa'): سازگاری، پەیوەندی، رێکەوتن.
**رفاء**- ص.ع(رەففاء- reffa'): چنینەوەکار.
**رفات**- ا.ع(روفات- rufat): ئێسک و پروسک، وردوخاش.
**رفاده**- ا.ع(ریفادە- rifade): مەڵحەم، سارغی.
**رفارف**- ا.ع(رەفاریف- refarif): فەرشو بەڕە، رایەخ، راخەر، جلوبەرگی رەنگاو رەنگ و جوان.
**رفاق**- ا.ع(ریفاغ- rifax): هاوڕێیان، هاوەڵان، دۆستان.
**رفاقت**- مص. ع(رەفاغەت-refaxet): هەڤاڵێنی، دۆستایەتی.
**رفان**- ص(رەفان- refan): شەفیع، کەسێ کە شەفاعەت بۆ کەسێکی دی

بکات، شەفاعەتکار.

**رفـــاه**- مـص.ع(رەفـــاه-refah): خۆشگوزەراندن، دەوڵەمەندی و دەستڕۆیی.

**رفاهت**- مص.ع(رەفاهەت- refahet): خۆشی و ئاسوودەیی، خۆشگوزەراندن.

**رفـاهیـیت**- مص. ع(رەفـاهیـیـەت- rufahîyet): خۆشگوزەراندن.

**رفـتـار**- ا.مص(رەفـتـار- reftar): رەوتار، کـردار، رۆیشتن، هەڵس‌وکـەوت، لفت.

**رفـتگر**- ا.ص(روفـتگەر- ruftger): کوچەماڵ، کەناس.

**رەفتن**- مص. ل(رەفـتـەن- reften): رۆیشتن، چوون.

**رونده**- ا.فـا(رەڤـەندە- revende): راگوزەر، رۆیشتوو، رێبوار.

**رفتن**- مص.م(روفـتـەن- ruften): ماڵین.

**رفـتو روب**- ا.مـص(روفـتو روب- ruftû rûb): مـاڵین، گـسکدان، ناوی بەشـێکە لە شـارەوانی بۆ پاککردنەوەی شەقامو کۆڵانان.

**رفـد**- مص. ع(رەفـد- refd): کـۆمـەک کردن، یاریدەدان، بەخشیش پێدان.

**رفـــرانـدوم**- ا.فـــر(ریفـــرانـدوم- rifrandûm): ریفـــراندۆم، راپـرسی دەربارەی ئەنجامدانی کارێک.

**رفــرم**- ا.فــر(ریفــۆرم- riform): چاکسازی، ریفۆرم.

**رفــری**- ا. انـگل(ریفـیـری- rifîrî): حـەکـەم، داوەر، وەکـو داوەری گـەمـەی فوتبۆڵو باسکە..

**رفـض**- مـص. ع(رەفـــــز- refz): رەتکردنەوە، رەفزکردن، دوورخستنەوە.

**رفــع**- مــص. ع(رەفــع- ref’): بەرزکردنەوە، لابردن.

**رفــعت**- مص. ع(ریفـعـەت- rif’et): بەرزبـوونـەوە لـە رووی پلـەو پـایـەوە، پـایـە بەرزبوونەوە.

**رفق**- مص. ع(ریـفـغ- rifx): نـەرمـی و میهرەبانی، مەداراکردن.

**رفـقـاء**- ا.ع(روفـەغـاء- rufexa’): هاوڕێیان، هەوالان، هەڤالان

**رفقه**- ا.ع(ریفغە- rifxe): هاوڕێیەتی، هەڤاڵێنی.

**رفـل**- مـص. ع(رەفـل- refl): بـەنـاز رۆیشتن.

**رفلکس**- ا.فـر(ریفلیکس- rifliks): کاردانەوە، پەرچەکردار، تیشکدانەوە.

**رفو**- مص. ع(رەفو- refû): دورینەوەی دڕاوی یان کونی جلوبەرگ بە جـۆرێ کە بە ئاسانی دیار نەبێ، چنینەوە.

**رفوزه**- ا.فر(ریفوزە- rifûze): راسب، دەرنەچوو لە تاقیکردنەوەدا

**رفوشه**- ا(رەفوشە- refûşe): گاڵتـە، سوعبەت، حەنەک، شۆخی، گوناح، یاخی بوون.

**رفــوکــاری**- ا.مص(روفــوکــاری- rufûkarî): دورینەوە، چنینەوە.

**رفـوگـر**- ا.ص(روفـوگـەر- rufûger): چنینەوەکار.

**رفــه**- ا(رەفــە- refe): رەفــە.

**رفیـده**- ا(رەفیـدە- refîde): دەرخۆنە، پنە.

**رفــیــع**- ص.ع(رەفیء- refî’): پایەبەرز.

**رفیـعـه**- ص.ع(ڕەفیـئـە- refi’e): پایەبەرز (بۆ مێ)، عـەرزو حـاڵێک کـە بدرێ بە دادوەر.
**رفیق**- ص.ع(ڕەفیغ- refîx): هاوڕێ، دۆست، هەڤاڵ.
**رفیـه**- ص. ع(ڕەفـیـهـ- refîh): خۆشگوزەران، تەمەڵ.
**رق**- مص. ع(ریغ- rix): بوونە کـۆیلە، کۆیلایەتی.
**رق**- ص.ا.ع(ریـغ- rix): نـاسـک، پێستی ناسک کە شتی لەسەر بنووسرێ، پێستی ئاسک، پەلکی درەخت.
**رقابت**- مص. ع(ڕەغابەت-rexabet): هەڤـڕکی، رکبـەڕکێ، چاوبڕینە شـتـێک، چاودێری کردن، چاوەڕوانی کردن.
**رقـاد**- مص. ع(روغـاد- ruxad): خەوتن، نووستن.
**رقـاص**- ص.ع(ڕەغـغـاس- rexxas): سـەمـاکـەر، ڕەقسـکار، ئەکـتـەر، پاندۆڵی سەعات.
**رقاصه**- ص.ع(ڕەغغاسە- rexxase): سماگر، ڕەقسکار (بۆ ئافرەت).
**رقـاع**- ا.ع(ریغـاء- rixa’): نامـە، نووسـراوی کـورت، پینەی جلوبەرگ، ناوی خەتێکە لەو شەش خـەتەی کە (ابن مقلە) دای هێناون.
**رقـاق**- ص.ع(روغـاغ- ruxax): ناسک، تەنک، نانی تەنک، نانی تیری.
**رقـبـاء**- ا.ع(روغـەباء- ruxeba’): ڕەقیبان، خەنیمان، هەڤڕکان.
**رقبه**- ا.ع (ڕەغەبە- rexebe): گەردن، مل، بەندەوغولام، کۆیلە
**رقـبـه**- ا.ع(ریغـبـە- rixbe): ترس، نیگابانی، هەڤڕکی.
**رقـبی**- ا.ع(روغـبـا- ruxba): جـۆرە بەخـشـینێکی مـەرجـدارە، بۆ وێنە: تۆ خـانوویەک دەدەی بە یەکێ بەو مـەرجـەی کامتـان لە پێشدا مردن خانووەکە بۆ ئەوی تر بێ، بۆیەش (رقـبی)ی پێ دەڵێن هەر یەکـێـک لەو دووە چاوی لە مـردنی ئەوی ترە.
**رقت**- مص. ع(ریغـغـەت- rixxet): نەرمیونیانی، بەزەیی، میهرەبانی، شەرم.
**رقت انگیـز**- ص.فا(ریغـغەت ئەنگیـز- rixxet engîz): هەر شتێ مایەی سۆز و بەزەیی بێ.
**رقـراق**- ص.ع(ڕەغـراغ- rexrax): درەوشاوە، دەرخشان.
**رقـشـاء**- ص.ع(ڕەغـشـاء- rexşa’): ڕەشو سپی، بازگ.
**رقص**- مص. ع(ڕەغس- rexs): شـایی کردن، هەڵپەڕکێ، سەما.
**رقص کنان**- ق. ص(ڕەغس کـونـان- rexs kunan): بەدەم سەماوە، هەڵبەزودابەز لە خۆشیدا.
**رقـصـیـدن**- مص. ج(ڕەغـسـیـدەن- rexsîden) ڕەقـسـین، هەڵـپـەڕین، سەماکردن.
**رقطاء**- ص.ع(ڕەغـتـاء- rexta’): ڕەشو سـپی، ڕەشی خـاڵ سـپی، فـیـتـنەو ئاژاوە. لە بواری جـوانکاری شـیـعـردا بە شـیـعرێ دەگـوترێ کـە لە هەر وشـەیەکـیـدا پیتێک خاڵداربێو پیتێک بێ خاڵ بێ.
**رقـعـه**- ا.ع(روغـئـە- rux’e): نامـە، نووسـراو، پارچە کـاغـەزێک کـە لەسـەری بنووسرێ، پینەی کەلوپەل.

**رقم**- ا.ع(ڕەغـــەم- rexem): نووسین، خەت، ژمارە.

**رقم زدن**- ا.ع(ڕەغـــەم زەدەن- rexem zeden): نووسین، نیگار کێشان.

**رقـــمـــزن**- ص.فـــا (ڕەغـــەم زەن- rexem zen): نووســەر، نیـگارکـێش، شێوەکار.

**رقـــود**- مص. ع(ڕوغـــود- ruxûd): خەوتن، نووستن.

**رقوم**- ا.ع(ڕوغوم- ruxûm): ژمـاران، نووسین.

**رقـــیب**- ص.ع(ڕەغـــیب- rexîb): ڕەقـــیب، چاودێر، پاســەوان، هەڤـــڕک، ڕەقیب، خەنیم.

**رقیع**- ص.ع(ڕەغیع- ’rexî): کەودەن، حۆل، گەڵحۆ، گەمژە، بێ شەرم.

**رقیق**- ص.ع(ڕەغیغ- rexîx): باریک، نەرمو ناسک، بەندە.

**رقیقه**- ص.ع(ڕەغیغە- rexîxe): نەرم و نـاسک، کـــەنیـــز، قـــەرەواش، ژنی بە پارەکڕدراو، کەنیزەک.

**رقـــیم**- ص.ع(ڕەغـــیم- rexîm): نووسراو، نووسین، نامە.

**رقیمه**- ا.ص.ع(ڕەغیمە- rexîme): نووسراو، نامە، ژنی داوێن پاکی خواناس.

**رقیه**- ا.ع(ڕوغیە- ruxye): ئەفسون، دوعا، چاوەزار.

**رک**- ص(ڕوک- ruk): بـــێ پـــەردە، ڕێکو ڕاست، بەڕاشکاوی.

**رک**- ا(ڕەک- rek): قسەکردن بەڕقەوە، خوتەو بۆڵە لە ڕووی ڕقەوە.

**رک**- ا.ع(ڕەکک- rekk): نەرمـەبارانی ورد.

**رکـــائب**- ا.ع(ڕەکـــائیب- reka’ib): وشترسواری.

**رکـــائز**- ا.ع(ڕەکـــائیـــز- reka’iz): بنەڕەتەکان، بنەماکان، گەنجی شاراوە.

**رکـــــاب**- ا.ع(ڕیکـاب- rikab): ئاوزەنگی، زەنگو، ڕکێف، زنگی.

**رکـــــاب**- ا.ع(ڕیکـاب- rikab): وشترسواری.

**رکـــاب**- ا.ع(ڕوککاب- rukkab): سواران.

**رکـــاب**- ص.ع(ڕەککاب- rekkab): سوارچاک، وشترسوار.

**رکابدار**- ا.ص(ڕیکابدار- rikabdar): جڵـەودار، غـولامێ کـە ئاوزەنگی ئەسپ بگرێ تا ئاغـاکـەی سـواری ئەسـپـەکـە بێ، کـەسـێک کـە بەپێ یان بە سـواری بەگـەڵ ئاغـای بکەوێو پێداویسـتـیـیـەکـانی بۆ هەڵگرێ.

**رکـاز**- ا.ع(ڕیکاز- rikaz): زێڕوزیوی لەناو کانزادا پەنهان، گەنجی ژێر زەمین.

**رکاشه**- ا(ڕوکاشە- rukaşe): سیخوڕ، سیخچولە.

**رکـــــاک**- ص.ع(ڕیکـاک- rikak): سست، ناسفت، ناڕەوان، ناڕێک.

**رکاکت**- مص.ع(ڕەکاکەت- rekaket): سست بوون، بێ ئەقڵی، کەم ئەقڵ بوون.

**رکانت**- مص.ع(ڕەکانەت- rekanet): جێگیـربوون، پایەداربوون، قـایم بوون، بە ویقاربوون، ویقارو سەنگینیو بتەوی.

**رکب**- ا.جم.ع(ڕەکب- rekb): قـافـڵـەی سواران.

**رکب**- ا.ع(ڕوکـەب- rukeb): زرانی، ئەژنۆ.

**ركــبــان**- ا.ع(روكــبــان- rukban): سواران.

**ركبــه**- ا.ع(روكـبــه- rukbe): ئەژنۆ، زرانی.

**ركت**- مـص.ع(ریـكـكـەت- rikket): لاوازبوون، سـسـت بوون، خـاوبوون، كـەم ئەقڵ بوون.

**ركـــــز**- مـص.ع(رەكــــــز- rekz): پایەداركـردن، قـایمكردن، مـەحكەمكردن، نێــزە یان شــتـی وەكــو نێــزە بە زەمـــیـندا داكوتان.

**ركس**- ا.ع(ریـكـس- riks): گـــــلاو، پیس، ئاپۆرای خەڵك، حەشامات.

**ركض**- مص. ع(رەكز- rekz): غاردان، راكردن، تاودان.

**ركـــضت**- ا.ع(رەكـــزەت- rekzet): بزاڤ، جووڵە، جولاندنی پێ.

**ركــعت**- ا.ع(رەكــئــــەت- rek'et): كڕنوش، ركاتی نوێژ.

**ركـــلام**- ا.فــــر(ریكلام- riklam): ریكلام، ئاگاداری، پڕوپاگەندە.

**ركن**- ا.ع(روكن- rukn): كـــۆڵەكـــە، پایە، ســتــوون، گـەورەو سـەرۆكی قـەوم، كاری مەزن.

**ركـنـی**- ص.ن(روكنـی- ruknî): دراوی زێڕی خالیسـە-ی سەردەمی ركن الدولە-ی دیلمی.

**ركو**- ا(رەكو- rekû): جاو، پەڕۆكـۆنە.

**ركـــوب**- مص.ع(روكـــوب- rukûb): سواربوون.

**ركـــــوب**- ا.ع(روكـــــوب- rukûb): سواران.

**ركـــــود**- مص.ع(روكــــود- rukûd): وەسـتـان، لە جێی خۆ وەسـتـان، وەسـتـانی ئاو یان با.

**ركـــــورد**- ا.فــــر(ریكۆرد- rikord): ریكۆرد، رەقەمی قیاسی، بالاترین ئەنجام كە لە لقێكی پێشبڕكێی وەرزشدا بەدەست دێ.

**ركـــــوع**- مص.ع(روكـــــوء- rukû'): ســــەرداندنەواندن، كــڕنۆش، دانەوینەوە لە نوێژدا.

**ركــوك**- ا(رەكــوك- rekûk): جــاو.

**ركـون**- مص.ع(روكـون- rukûn): ئارام گرتن.

**ركوه**- ا.ع (رەكفە- rekve): جەوەندەی ئاو.

**ركیب**- ص.ع(رەكیب- rekîb): سوار.

**ركـیب**- ا(ریكیب- rikîb): ئاوزەنگی، ركێف.

**ركیدن**- مص.ل (رەكیدەن- rekîden): خوتەو بۆڵەكردن لە بن لێوانەوە، كەسێك لە داخانا لەبەر خۆیەوە ببۆڵێنێ.

**ركـیـزه**- ا.ع(رەكـیـزە- rekîze): زێڕو زیوی پەنهـانی بن عـاردی یان ناو كـانزا، گەنجی شاراوە.

**ركـــیـك**- ص.ع(رەكـــیـك- rekîk): ســست، لاواز، هەتیـوچە، ناكـەس بەچە، تۆڕی، تڕۆ، ناشیرین، كەم.

**ركین**- ص.ع(رەكین- rekîn): مـكـوم و جێگیر، بەرقەرار، بە ویقار، پایەدار.

**رگ**- ا(رەگ- reg): دەمـــــــــــــار.

**رگـبـار**- ا.مـر(رەگـبـار- regbar): تاوە بارانی توندو بەخوڕزم، دەستڕێژی چەك.

**رگبـرگ**- ا.مـر(رەگـبـەرگ- regberg): دەماری ناو گەڵاو پەلكی درەختان.

**رگبـرگ شدن**- مص.ل(رەگبـەرگ شودەن-

regberg şuden): لەجێ چوون، لە لەلەگەچوون، لەجێ دەرچوون، وەرگەڕان.
**رگبند**- ا.مـر(رەگبـەند- regbend): قایشێک، یان لەزگە، یان سارغییەک لەسەر دەمار ببەسترێ تا خوێنی لێ نەڕوات.
**رگبی**- ا- انگل( روگبی- rugbî): جۆرە گەمەیەکی تۆپێنە.
**رگ جان**- ا.مر(رەگی جان-regi can): شادەمار.
**رگ زدن**- مص. م(رەگ زەدەن- regzeden): خوێن گرتن لە دەمار.
**رگزن**- ا.ص(رەگ زەن- regzen): حەجامات کێشی، خوێن بەردان، وەستای خوێن بەردان.
**رگ شناس**- ا.ص(رەگ شیناس- reg şinas): دەمارناس، پسپۆر لە دەمارناسیدا.
**رەگ شناسی**- ا.مص(رەگ شیناسی- reg şinasî): دەمارناسی، بەڵەدی لە دەمارناسیدا.
**رگل**- ا.فر(ریگل- rigl): دەستوور، بنەما، دیسپلین، ڕێباز، ڕێوڕەسم، عادەی مانگانەی ژنان.
**رگلاتور**- ا.فر(ریگلاتور- riglatûr): دینەمۆ.
**رگلاژ**- ا.فر(ریگلاژ- riglaj): ڕێکخستن، ڕێکخستنی جوڵەوکاری بەشە جۆراوجۆرەکانی ئوتومبیل.
**رگلت**- ا.فر(ریگلیت- riglit): پارچە ئاسنی مەودا جیاواز کە لە چاپخانان بۆ ڕێکخستنی مەودای نێوان دێڕان بەکاردەبرێ.
**رگلمان**- ا.فر(ریگلمان- rigilman): ئەمر، فرمان، دەستوور، ڕێکخستن.
**رگ نهادن**- مص.ل(رەگ نیهادەن- regnihaden): ملدان، تەسلیم بوون، مل کەچ کردن.
**رگو**- ا(رەگو-regû): جاو، کۆنەپەڕۆ.
**رگه**- ا(رەگە- rege): دەمارئاسا، دەمار، رەگو رەچەڵەک، نەژاد، وەک: حەیوانی دوو رەگ.
**رل**- ا.فر(رول- rul): تۆمار، دەفتەر، لولە، کار، کاری ئەکتەر لە شانۆنامەو فیلمدا، سوکانی ئوتومبیل.
**رله**- ا.فر(ریلە- rile): ئەسپی تازە نەفەس، کە لە هەر ماڵێکدا بۆ ڕێبوار ئامادەی بکەن، مەنزڵ، قۆناغ، هەواڵی نوێ.
**رم**- ا.مص(رەم- rem): رەوینەوەو هەڵاتن لە ترسا، ناچارکردن.
**رم کردن**- مص. ل(رەم کەردەن- remkerden): ترساندنو رەواندنەوە، زیاتر بۆ گیانلەبەران دەگوترێ.
**رم**- ا.جم(رەم- rem): رەمە، گەلە، دەستە، تاقم، گروپ.
**رم**- ا(ریم- rim): چڵکی برین، کێم و زووخ.
**رم**- ا(روم- rum): دەوراودەوری دەم لە ناوەوە، ناوی دەم.
**رم**- افر(روم- rum): توکەبەر، مووی بەرگەدە.
**رم**- ا.فر(روم- rum): عەرەقێ، کە لە دڵۆپاندنی قامیشی شەکر یان شیلەی شەکر بەدەست بێ، روم، عەرەق.
**رم**- اع(ریم- rimm): مۆخ، ئاومالکە،

خاک، خاکی تەڕ.

**رم**- مص. ع(رەمم- remm): چاکـردن، چاکـەکـردن، چاکـردنەوەی بیناو تەلاری خراپ بوو.

**رم**- مـص. ع( رەمم- remm): رزیـن، رزینی ئێسک.

**رمـاتیـسم**- ا.فـر(رومـاتیـسم- rumatism): رۆماتیزم، باداری.

**رماح**- ا.ع(ریماه- rimah): رم، نیـزە، نێزەورِمان.

**رمـاح**- ص.ع(رەمماه- remmah): رمساز، نێزەساز، نێزەگەر.

**رمـاد**- ا.ع(رەمـاد- remad): خۆڵەمێش، خۆڵەکەوە، ژیلەمۆ.

**رمـادی**- ص.ف- ع(رەمـادیـی- ramadî): کەوەیی، خۆڵەمێشین.

**رمارم**- ق(رەمارەم- remarem): پۆل پۆل، دەستـە دەستـە، لێکدا لێکدا، پەیتا پەیتا.

**رمـازه**- ص.ع(رەممازە- remmaze): ژنـی داوێـن تـەڕ، ســۆزانـی، روســپـی، لەشکری بێ ســەروبن کــە لە کــاتی هەرەکەتدا وەک بلێی شەپۆل بدات.

**رمـاس**- ا(رەمـاس- remas): جـۆرە سەمغێکە.

**رمـاک**- ا.ع(ریماک- rimak): مـایـن، (بۆ کۆیە).

**رمـال**- ا.ع(ریمال- rimal): لم، قـوم.

**رمـال**- ص.ع(رەممال- remmal): لم و چەوفرۆش، فاڵگرەوە، فاڵچی.

**رمام**- ص.ع(رومام- rumam): کۆنو رزیو.

**رمان**- ص.فا(رەمـان- reman): سڵ، سڵۆک، هەراسانو ترساو، رەڤۆک.

**رمــان**- ا.ع(روممـان- rumman): هەنار، درەختی هەنار.

**رمان**- ا.فر(رۆمان- roman): رۆمان.

**رمـانتـیـسم**- ا.فـر(رۆمـانتـیـسم- romantism): رۆمـانتـیـزم، رێچکەو رێبازی نووسینی نووسەرانی رۆمانتیک، قـوتابخـانەیەکی ئەدەبی بوو کـە لە سـەدەی ١٩ز لە فـەرەنسا هاتە ئاراوەو بەرانبـەر بە قوتابخانەی کلاسیک وەستایەوە.

**رمـانتـیـک**- ص.فـر(رۆمـانتـیـک- romantîk): رۆمانتیک.

**رمــانـدن**- مـص.م(رەمــانـدەن- remanden): ترسـانـدن، رەواندنەوە، راونان.

**رمــاننـده**- ا.فــا(رەمــانەنـدە- remanende): رەوێنەر، ترسێنەر.

**رمــانیــده**- ا. مف(رەمــانیــدە- remanîde): رەوێـنـراو، راونـراو، ترسێنراو.

**رمـانی**- ص.ن(روممانی- rummanî): هەناری، هەر شـتێ لە شـێـوەو رەنگدا لە دەنکە هەنار بچێ.

**رمایت**- مص. ع(ریمایەت- rimayet): تورِدان، فرِێدان، تیرهاویشتن، تەقەکردن.

**رمبان**- ص. فا(رومبـان- rumban): رمان، روخان، روخێنەر، رمێنەر لە حاڵی رمانو دارِوخاندا.

**رمــبــانـدن**- مـص.م(رومــبــانـدەن- rumbanden): رماندن، رووخاندن.

**رمــبــیــدن**- مـص.ل(رومــبــیــدەن- rumbîden): رووخان، رمان.

**رمــبــیــده**- ص. مف(رومــبــیــدە-

rumbîde): دارِوخاو، دارِماو، روخاو، رماو.

**رمــث**- مــص. ع(رەمـــس- rems): چاککردنی شتێک، دەست پێداهێنان.

**رمح**- ا.ع(رومح- rumh): نێــزە، رم.

**رمد**- ا.ع(رەمەد- remed): چاو یەشە، گل کردنی چاو.

**رمـــز**- مـص. ع(رەمـــز- remz): ئاماژەکردن، ئاماژەکردن بە لێو یان چاو یان برۆ، گەیاندنی بابەتێک بە ئیشارەی چاوو برۆ.

**رمــز**- ا.ع(رەمــز- remz): هێــمــا، ئامــاژە، رازی شــاراوە، نیــشــانەیەکی تایبــەتی کــە شــتــێک یا بابەتێکی لێــوە دەرک بکرێ، کلیلی تێگەیاندنی کــارێک یان بابەتێکی نامەفهوم.

**رمـــژک**- ا(رەمــــژەک- remjek): سەرەولێژی، سەرەو لێژی خزو خلیــسک، گوناحو خزین.

**رمس**- مص.ع(رەمس- rems): ناشتن، بەخاگ سپــاردن، شاردنەوە، تەقەتکردن لە زەویدا.

**رمس**- ا.ع(رەمس- rems): قەبر، گۆڕ، چپە، گڵی گۆڕ.

**رمش**- ا.مص(رەمــیش- remiş): ترس و هەڵاتن، سلۆکی، رەڤۆکی.

**رمش**- ا.ع(رەمــــــەش- remeş): سوربوون و ئاوکردنی چاو، گلکردنی چاو.

**رمـشـاء**- ص.ع(رەمـشــاء- remşa’): ژنی خــۆش خــوو، ژنی خــۆش تەبیــعــەت، دەشتی پڕگیا، مێرگ.

**رمص**- ا.ع(رەمەس- remes): ریپۆقی چاو.

**رمــضـــاء**- ا.ع(رەمــزاء- remza’): هەرِەتی گەرما، کوشنگەی گەرما.

**رمـضـان**- ا.ع(رەمـەزان- remezan): مـانگی رەمـەزان، مـانگی بەرِۆژوو بـوونی موسڵمانان.

**رمق**- ا.ع(رەمـــــەغ- remex): دوا هەناسە، خواردنی زۆرکەم، توانا.

**رمق**- ا.ع(رەمەغ- remex): رانەمـەڕ، رەمە، مێگەل.

**رمـک**- ا.جم(رەمـــــەک- remek): رەوگە، رانەمـەڕ، گـاگـەل، سـوپاو لەشکرو حەشامات.

**رمک**- ا.ع(رەمەک- remek): ئەسپو ماینی تایبەت بۆ زاوزێ.

**رمـــکـــان**- ا(رومــکـــان- rumkan): توکەبەر.

**رمکه**- ا. ع(رەمـــەکـــە- remeke): ئەسپو ماینی تایبەت بۆ زاوزێ.

**رمکی**- ص(رەمـەکی- remekî): سڵ، رەڤـۆک، حـەیوانێک کـە زوو برِەوێتـەوەو هەڵبێ، رەوەکیەتی.

**رمگا**- ا(رەمگا- remga): مـــاین، ماهین.

**رمل**- ا.ع(رەمل- reml): لم، قـــوم، چەو، فاڵ.

**رمل**- ا.ع(رەمــەل- remel): نـەرمــە باران، بارانی کەم، بارانی نم نم.

**رمله**- ا.ع(رەمله- remle): قـومـەڵان، لمەڵان، قومڵاخ.

**رموک**- ص.ع(رەموک- remûk): ئارام گرتن، ئاکنجی بوون.

**رموز**- ا.ع(روموز- rumûz): هێمایان، رەمزان، رازو نهێنیان.

**رمـوک**- مص. ع(رومـوک- rumûk): ئارام کردن، ئاکنجی بوون له شوێنێک.

**رمـه**- ا(رەمـه- reme): گـاگـەل، ران، گەلە.

**رمـــەشـــدن**- مص(رەمـــەشـــودەن- remeşuden): گردبوونەوە، خڕبوونەوە له شوێنێک.

**رمـــه**- ا.ع(ڕیمـــه- rimme): پەت، پەتک، ئێسکی رزیو، ئێسک و پروسک، مۆریانە.

**رمەبان**- ا.ص(رەمـەبان- remeban): شوان، شوانکارە.

**رمەدار**- ص.فا(رەمەدار- remedar): خودان مێگەل، گەلەدار

**رمـەیار**- ا.ص(رەمـەیار- remeyar): شوان.

**رمی**- مص. ع(رەمی- remî): تورِدان، فرِێدان، تەقەکردن، تیرەندازی.

**رمـیـار**- ا.ص(رەمـیـار- remyar): شوان.

**رمیدن**- مص.ل(رەمیدەن- remîden): ترسانو هەلاتن، رەوینەوە.

**رمنده**- ا.فـا(رەمـەندە- remende): هەلاتوو، رەویوە،

**رمـیـده**- ا.مف(رەمـیـدە- remîde): ترسێنراو، رەوێنراو.

**رمیز**- ص.ع(رەمیز- remîz): رەسەن، ژیر، ئاقڵ، گەورە پیاوی ئاقڵی سەنگین.

**رمـیم**- ص.ع(رەمـیم- remîm): رزیو، کۆن، ئێسکی رزیو.

**رنب**- ا(رونب- runb): توکەبەر.

**رنـتـگـن**- ا(رونـتـگـین- runtgin): تیشکی x.

**رنج**- ا(رەنج- renc): رەنج، ئـــازار، زەحمەتو رەنجدان، مەینەت.

**رنج آزمـــا**- ص.فـــا(رەنج ئـازمـــا- renc azma): رەنجبەر، رەنجکێش.

**رنج آزمـوده**- ص.مـر(رەنج ئـازمـوده- renc azmûde): رەنجـــدیـدە، مەینەتکێش.

**رنج آور**- ص.فـــا(رەنج ئـاڤـــەر- renc aver): مایەی رەنج، رەنجهێن.

**رنجـال**- ا(رەنجـال- rencal): خـۆراک، خواردەمەنی.

**رنجـــاندن**- مـص. م(رەنجـــاندەن- rencanden): رەنجاندن، ئازاردان.

**رنجـــاننده**- ا.فـــا(رەنجـــانەندە- rencanende): ئـازاردەر، مـــایـەی رەنجان.

**رنجـــانیـــده**- ا.مف(رەنجـــانیـــده- rencanîde): رەنجێندراو، ئازاردراو.

**رەنج باریک**- ا.مـــر(رەنجی باریک- renci barik): دەردەباریکە، سـیلو دیق.

**رنجبر**- ص.فا(رەنجـبـەر- rencber): رەنجبەر، زەحمەتکێش، کرێکار.

**رنج بردار**- ص.فـــا(رەنجـــبـــوردار- rencburdar): رەنجـبـەر، کـەسێ کـە زەحمەت بکێشێو رەنج بدات.

**رنج بـــردن**- مـــص. ل(رەنج بـــوردەن- renc burden): خـەفـەت خـواردن، زەحمەتکێشان، رەنجدان.

**رنج بـــرده**- ص. مـــف(رەنج بـــوردە- renc burde): مـــەینـەتدیـدە، زەحمەتکێش.

**رنج دیــــدن**- مـــص. ل(رەنج دیـــدەن- renc dîden): رەنج دیتن، بە مەینەت‌و زەحمەت گرفتار بوون.
**رنجـــــدیـده**- ص. مف(رەنج دیـدە- renc dîde): رەنج دیتوو.
**رنجش**- ا.مص(رەنجـیش- renciş): زەحمەتکێشان، رەنجدان.
**رنج کشیدن**- مص. ل(رەنج کەشیدەن- renckeşîden): رەنج کێشان، زەحمەتکێشان.
**رنج کش**- ص. فا(رەنج کەش- renckeş): رەنجبەر، رەنجدەر، زەحمەتکێش.
**رنجمند**- ص(رەنجمەند- rencmend): خودان رەنج، رەنجوەر، مەلول، نەخۆش، رەنجکێش.
**رنجـور**- ص(رەنجـور- rencûr): زەحمەتکێش، نەخۆش، داماو، غەمگین، دڵتەنگ.
**رنجـوردار**- ص.مر(رەنجـوردار- rencurdar): کەسێک کە لە ماڵەوە نەخۆشی هەبێ، خاوەن نەخۆش نەخۆش دار.
**رنجـورگـونه**- ص.مر(رەنجـورگـونە- rencûr gûne): نەخۆش ئاسا.
**رنجـه**- ص(رەنجـە- rencc): رەنجاو، دڵشکاو، دڵ ئێشاو، دڵتەنگ.
**رنجه داشتن**- مص. م(رەنجە داشتەن- rence daşten): ئازاردان، ئەزیەتدان، زەحمەتدان.
**رنجـه‌شدن**- مص.ل(رەنجـە شـودەن- renceşuden): رەنجان، دڵشکان.
**رنجـه‌کـردن**- مص. م(رەنجـە کـەردەن- rencekerden): رەنجاندن، ئازاردان.
**رنجـیـدن**- مص.ل(رەنجـیـدەن- rencîden): دڵتەنگ بوون، ئەزیەت خواردن، داماوبوون، رەنجین.
**رنـد**- ص(ریـنـد- rind): زیـرەک، زرینگ، بێباک، خەمسارد، فێڵباز، هوشیارو تیژبین.
**رنـــد**- ا(رەنـــد- rend): وردەدارو ئاردەداری پاش برین‌و رەندەکردنی دار.
**رەند**- ا.ع(رەند- rend): داری مـۆرد.
**رنداسا**- ص.مر(ریندئاسا- rindasa): وەکو رەندو مەردان.
**رندانـه**- ق.ص(رەندانـە- rendane): مەردانە، زیرەکانە.
**رندسوز**- ص.فا(ریندسوز- rind sûz): دوژمنایەتی رەندان.
**رنـدش**- ا.مـص(رەنـدیـش- rendiş): رنین.
**رەنـده**- ا(رەنـدە- rende): رەنـدە.
**رنـدیـدن**- مـص.م(رەنـدیـدەن- rendîden): رنـین، لـە رەنـدەدان، تاشـینی دار، یان شـتی دی، تا سـافو هەموار ببێ.
**رندش**- ا.مـص(رەنـدیـش- rendiş): رەندەکاری.
**رندیـده**- ا.مف(رەندیـدە- rendîde): رەندەکراو، تاشراو.
**رنسانس**- ا.فر(رینیسانس- rinisans): بوژانەوە، تازەکـردنەوە، سـەردەمی تازەکـردنەوەی ئەدەبیـات‌و سنعـەت و زانستەکانی ئەوروپا کە لە ئاخرو ئۆخری سـەدەی ١٥و سـەرەتاکـانی سـەدەی ١٦دا هاتە ئاراوەو، بنەمـاکـەی بریتی بوو، لە

بوژاندنەوەی ئەدەبیاتو سنعەتو زانستێن کۆنو لاسایی کردنەوەی بەرهەمێن رابردوو و، لە ئەنجـــامـــدا رەونەقـــێکی زۆر لە سنعــــەتو ئەدەبیـــاتدا پەیدا بوو و هونەرمەندان زۆر شاکاری عەنتیکەیان هێنایە ئاراوەو، داهێنا.

**رنــگ**- ا(رەنــگ- reng): رەنــگ.

**رنگ**- ا(رەنگ- reng): سوود، رەواج، هەرمــێن، رەونەق، بازارگــەرمی، فــێڵ و دەهۆ.

**رنگ**- ا(رەنگ- reng): خـــەرقـــەی دەروێشـان، جلوبەرگی شڕو رەنگاو رەنگی دەروێشان، جبەی دەروێشان.

**رنگ**- ا.ص(رەنگ- reng): وشـتـری بەهێزو رەسەن کە بۆ زاوزێ رابگیرێ.

**رنگ**- ا(رەنگ- reng): بزنە کـێـوی.

**رنــگ**- ا(رینـگ- ring): ئـاهـەنـگـی شادی هێنی مۆسیقا، ئاهەنگی تایبـەتی هەڵپەڕکێ.

**رنـگارنـگ**- ص.مـــــر(رەنـگارەنـگ- rengareng): رەنـــگـــاو رەنـــگ، جۆراوجۆر.

**رەنک آمــیــز**- ص.فـا(رەنگ ئامـیـز- reng amîz): شێوەکار، نیگارکێش.

**رنگ آمــیــز**- ص.فـا(رەنگ ئامــیــز- reng amîz): حـیـلـەباز، حـیـلـەکـەر، خاپینۆک، نێرەنگ باز.

**رنگ باختن**- مص. ل(رەنگ باخـتــەن- reng baxten): رەنگ پەڕین، رەنگ پەڕین لە ترسا، یان لە نەخۆشیدا.

**رەنگ پریدە**- ص.مـــر(رەنگ پەڕیدە- reng perîde): رەنگ پەڕیو.

**رنگدانە**- ا.مر(رەنگدانە-rengdane): هەوێنی رەنگی بەدەن.

**رنگرز**- ا.ص(رەنگ رەز- reng rez): خمگەر، خمچی، وەرزی پاییزو خەزان.

**رنگ رنـگ**- ص.مـــــر(رەنگ رەنـگ- reng reng): رەنـــگـــاو رەنـــگ، جۆراوجۆر.

**رنـگ رو**- ا.مـــــــــر(رەنـگـی روو- rengi rû): رەنگی روو.

**رنگریـز**- ا.ص (رەنـگریـز- rengrîz): رەنگچی، رەنگکار، خمگەر، نیگارکێش.

**رنــگ زردی**- ا.مــص(رەنـــگ زەردی- rengzerdî): شەرمەزاری، نەخۆشی.

**رنگکار**- ا.ص(رەنگکار- rengkar): نیگارکێش، بۆیەچی، بۆیەکار.

**رنگ کـار**- ص(رەنگکار- rengkar): حیلەکار، فریودەر، نێرەنگ باز.

**رنگناک**- ص(رەنگناک- reng nak): رەنگین.

**رەنـگو بـو**- ا.مــــــــر(رەنـگو بـو- rengû bû): رەنـــگو بـــۆ، رەونـــەقو رەواج، جوانیو شکۆ، فەڕو عەزەمەت.

**رنـگو رو**- ا.مـــــــــر(رەنـگو روو- rengû rû): رەنگو روو.

**رنگو روغن**- ا.مـــر(رەنگو روغـــەن- rengû rûxen): بۆیەی رۆنی.

**رنگو وارنگ**- ص.مر(رەنگو ڤارەنگ- rengû vareng): رەنگاو رەنگ.

**رنــگــی**- ص.ن(رەنــگــی- rengî): رەنگین، خمگەر، بۆیەچی.

**رنــگــین**- ص.ن(رەنـگـین- rengîn): رەنگاو رەنگ، جۆراوجۆر.

**رەنگینان**- ا(رەنگینان- rengînan): جۆرە رووەکێکە.

**رنگینک**- ا(رەنگینەک- rengînek): حەلوای خورما.

**رەنگین کـمـان**- ا.مـر(رەنگین کـەمـان- rengîn keman): پەلـکـە زێـڕینـە، کـۆڵکە زێڕینە، زەڕینەو سیمینە، رەنگین کەوان، پەلکە رەنگینە، کەسک و سۆر.

**رنود**- ا(رونود- runûd): مـــــەردان، رەندان.

**رنـــین**- مـــص. ع(رەنـــین- renîn): ناڵەوزاری، گریانی خەماوی، دەنگ.

**رنیوم**- ا.فر(رەنیوم- renîwm): جۆرە کانزایەکە.

**رو**- ا (روو- rû): روو، رووخـــســـار، چارە، لەبەر ئەمە.

**روا**- ص(رەڤا- reva): رەوا، شایستە، حەڵاڵ، ئاوی رەوان، رەوان.

**رواء**- ص.ع(ریڤـاء- 'riva): گـوریس، کندر، کـەژو، ئەو پەتەی کـە باری لەسـەر وڵاخ پێ دەبەستن.

**رواء**- ص.ا- ع(ریڤـاء- 'riva): پاراو، تێراو، ئاودار، ئاوی سازگار.

**رواء**- ا.ع(روڤـــاء- 'ruva): دیمەن، سیما، ئابڕو، چارە، رەزا شیرین.

**رواء**- ا.ع(رەڤـاء- 'reva): ئاوی زۆر، ئاوی سازگار، پاراوکەر، تینوێتی شکێن.

**روابط**- ا.ع(رەڤـــابیت- revabit): پەیوەندییان.

**روابی**- ا.ع(رەڤابی- revabî): گردان، گرد، بەرزایی، تەپە.

**روات**- ا.ع(روڤات- ruvat): وتیاران.

**رواتب**- ا.ع(رەڤـــاتیب- revatib): رمـــێن، مـــووچە، بەردەوام، جـــێگیـــر، بەرقەرار، مانگانە.

**رواج**- مص. ل. ع(رەڤـــاج- revac): هەرەمـــــێـن، برەو، بـاو، رەونـەق، رەوان (رۆیینی ئاو).

**رواح**- ا.ع(رەڤـــاه- revah): هەوەڵی شـــەو، شـــەوەکی، هاتووچۆی شـــەوانە، شەوانە هاتووچۆ.

**رواحل**- ا.ع(رەڤـــاهیـل- revahil): بارگیر، وڵاخی باربەر.

**رواد**- ا(رەڤـــاد- revad): مـــێـــرگ، لەوەڕگە، پاوەن، سەوزەزار.

**رواد**- ا.ع(روڤـــڤـــاد- rûvvad): پێشەنگان، پێشڕەوان، سەر قافڵە.

**روادار**- ص.فـا (رەڤـادار- revadar): رەوادار، پێ رەوادیتن، بە حـــەڵاڵ زانینی شتێ بۆ کەسێک، رەوا.

**روادف**- ا.ع(رەڤـــادیف- revadif): پاشکۆ، کـەفـەڵان، سـمت و کـەفـەڵ، پاشەڵان، خەڵکی پاشکەوتوو.

**روادید**- ا.مـــر(رەڤـادید- revadîd): ڤیزا، ئیمزاو رەزامەندی، رازی بوون.

**روارو**- ا.مص(رەڤـارەو- revarew): هاتووچۆی زۆر، هاتووچۆ.

**روازن**- ا.ع(رەڤـــــازن- revazin): رۆزەنە، کڵاو رۆژنە، دەلاقە.

**رواس**- ا(ریڤـــاس- rivas): رێواس.

**رواسم**- ا.ع(رەڤـاسـیـم- revasim): نیشانە، مۆر. شەقڵ.

**رواسی**- ا.ع(رەڤـــــاسی- revasî): جێگیران، شاخی بەرز و مکوم.

**رواشن**- ا.ع(رەڤـــاشین- revaşin): دەلاقـــە، کـــڵاورۆژنە، پەنجـــەرەیەک کـــە رۆشنایی لێوە بێتە ژووری.

**رواصیر**- ا(رەڤاسیر- revasîr): مرەبا،

ترشیات.
**روافض**- ص.ا.ع(رەڤافیز- revafiz): رافزیان، شیعەیان، گروپێک کە لە شەڕدا فەرماندەی خۆیان بە جێ بێڵن.
**رواق**- ا.ع(ریڤـــاغ- rivax): دالان، سابات، ڕاڕەوی سەرگیراو، ئاسمان
**رواقی**- ص.ن(ریڤـــاغی- rivaxî): پێڕەوی قــوتابخـانەی ڕەواقـیـیـەکـان. ڕەواقییەکان تاقمە فەیلەسووفێکی کۆنن سـەر بە یەکـێک لە دالانەکـانی شـاری ئەسـینا بوون کـە زەنوونی فـەیلەسـوفی یۆنانی لە دەوروبەری (ساڵی ٣٠٠ی پێش ز)دا، شاگردەکانی خۆی لەوێندەر ڕێنومایی دەکرد.
**روال**- ا.ع (روڤـــــال- rûval): ئاوی دەمی وڵاخ، لیکاوی زاری وڵاخان.
**روال**- ا.ع(رەڤـال- reval): شـێـواز، نەزمو تەرتیب.
**روآمــــدن**- مـص.ل(روئـامـــــەدەن- rû ameden): بەرزبوونەوە، بەپلەوپایە گەییشتن، گەشەکردن.
**روان**- ا(رەڤان- revan): گـیـان، روح، رەوان.
**روان**- ص.فـا(رەڤـان- revan): ئاوی رەوان، کـەسـێک کـە بڕوات، چوستو چالاک، خـــێـــرا، زوو، رەوان بـوون، دەرسـەکـەی رەوانە، ئەزبەرکـردن، دەرخ کردن، لەبەرکردن.
**روان اســا**- ص.فـا(رەڤـان ئاسـا- revan asa): ئارامی دەری روح.
**روان آمــرز**- ص.فـا(رەڤـان ئامــورز- revan amurz): غەفور، عەفوکار.
**روان آمرزیده**- ص.مف(رەڤان ئامورزیدە- revan amurzîde): خوا لێخۆشبوو، مەرحوم، شادڕەوان.
**روانامە**- ا.مر(رەڤانامە-revaname): مـوافـەقـەتنامـە، سـەرۆکی حکومـەت یان دەوڵەت لەسەر کاری کونسوڵ.
**روان بخش**- ص.فـا(رەڤـان بەخش- revan bexş): روح بەخش، جبرائیل.
**روان بد**- ا.مـــر(رەڤـــان بـود- revan bûd): خودان روح،
**روان پزشک**- ا.ص(رەڤـان پزیشک- revan pizişk): دکتۆری دەرونی.
**روان پزشکی**- ا.مص(رەڤان پیزیشکی- revan pizişkî): پـزیـشـکـگـەری دەروونی.
**روانخـــواه**- ص.فـا(رەڤـان خـاه- revan xah): دەرۆزەکـەر، سـواڵکەر، گەدا.
**رواندختن**- مص.ل(روو ئەنداختـەن- rû endaxten): تکاو رجاو پاڕانەوەو داواکردن.
**رواندز**- ا.مر(رووئەنداز- rûendaz): شتێ کە لە خەوتندا بە خۆیدا بدەی.
**روان داشتن**- مص.م(رەڤـان داشـتـەن- revan daşten): ناردن، جـێـبـەجێ کـردنی حـوکم، لەبەرکـردن، رەوانکردن، ئەزبەرکردن.
**روان دەرمـانی**- ا.مص(رەڤـان دەرمـانی- revan dermanî): مـالیـجـەی نەخۆشییێن دەروونی.
**روانـدن**- مـص. م(رەڤـــان دەن- revan den): بەرێ خـسـتن، نـاردن، برەو پێدان.
**روان ریگ**- ا.مـــر(رەڤـــان ریگ-

revan rîg): گردۆڵکەی لمی بزۆز.
**روان ساختن**- مص.م(رەڤان ساختەن- revan saxten): رەوانەکردن، ناردن.
**روان سالار**- ا.ص(رەڤان سالار- revan salar): خودان روح.
**روان شاد**- ص.م(رەڤان شاد- revan şad): رەحمەتی، مەرحوم، شادڕەوان.
**روان شدن**- مص.ل(رەڤان شودەن- revan şuden): کەوتنەڕێ، لەبەربوون، رۆیشتن.
**روان شناس**- ا.ص(رەڤان شیناس- revan şinas): دەروونناس، پسپۆری بواری سایکۆلۆژی.
**روان شناسی**- ا.مص(رەڤان شیناسی- revan şinasî): دەروونناسی، سایکۆلۆژی.
**روانکاو**- ا.ص(رەڤانکاو- revan kaw): پسپۆر لە شیکاری دەروونناسیدا.
**روانکاوی**- ا.مص(رەڤان کاڤی- revan kavî): شیکاری دەروونی.
**روانکاه**- ص.فا(رەڤان کاه- revan kah): روح پروکێن..
**روان کردن**- مص.م(رەڤان کەردەن- revan kerden): ناردن، بەڕێکردن، رەوانەکردن، ئەزبەرکردن، رەواج پێدان.
**روان گیر**- ص.فا(رەڤان گیر- revangîr): روح سێن، گیانسێن..
**روانە**- ص(رەڤانە- revane): وەڕێکەوتوو.
**روانەشدن**- مص. ل(رەڤانە شودەن- revane şuden): رۆیشتن، وەڕێکەوتن.
**روانەکردن**- مص.ل(رەڤانە کەردەن- revane kerden): ناردن، رەوانەکردن، بەڕێکردن.
**روآوردن**- مص.ل(روئاڤەردەن- rû averden): روو تێ کردن.
**رواوە**- ا(رەڤاڤە- revave): رەبابە.
**رواە**- ا(رەڤاه- revah): خواردنی زندانیان و یەخسیران..
**رواهش**- ا.ع(رەڤاهیش- revahiş): دەمار.
**روایت**- مص.ع(ریڤایەت- rivayet): گێڕانەوەی قسە، هەواڵ، حیکایەت.
**روایح**- ا.ع(رەڤایە- revayih): بۆن، عەتر.
**روایع**- ا.ع(رەڤایء- revayî’): لەبەر دڵان، جوان، داهێنراو، شاکار.
**روبارو**- ق.ص(رووباروو- rûbarû): رووبەڕوو، بەرانبەر.
**روباز**- ص.مر(رووباز- rûbaz): روو نەپۆشراو، رووکراوە.
**روبان**- ا.فر(رووبان- rûban): نەواری ئاورێشمی، سارغی.
**روباە**- ا(روباه- rûbah): رێوی، رۆڤی، رێڤی.
**روباە تربک**- ا.مر(روباە توربەک- rûbah turbek): ترێ رێویانە.
**روباە ترکی**- ا.مر(رووباهی تورکی- rûbahi turkî): سیخوڕ.
**روباە رز**- ا.مر(روباە رەز- rûbah rez): ترێ کێوی.
**روبر**- ا.مر(روبوڕ- rûbur): کلێشە، کەتەلۆگ، قوماش یان جل کە لەسەر

کەتەلۆگ و نموونە براپێ.

**روبراه**- ص.مر(روو بیراه- rû birah): ئامادە، حازر، تەیار، عازمی سەفەر.

**روبراه شدن**- مص. ل(روو‌بیراه شودەن- rûbirah şuden): ئامادەبوون بۆ سەفەر، حازربوون بۆ کار، جێبەجێ بوون، چاک هاتنی کار.

**روبرتافتن**- مص.ل(رووبەرتافتەن- rûber taften): روو وەرگێڕان، پشت تێ کردن.

**روبرگرداندن**- مص.ل(روو بەرگەرداندەن- rûber gerdanden): روو وەرگێڕان لە کەسێک، یان شتێک.

**روو‌برو**- ق.ص(رووبیروو- rû birû): رووبەڕوو، بەرانبەر.

**روبستن**- مص.ل(رووبەستەن- rûbesten): حیجاب کردن، رووپۆشین.

**روبل**- ا(روبل- rûbl): رۆبڵ، پارەی باوی روسییە.

**روبند**- ا.مر(رووبەند- rûbend): رووبەند، رووپۆش، پەچە.

**روبوسی**- ا.مص(رووبووسی- rû bûsî): ماچو موچ، یەکدی ماچ کردن، راموسانێ.

**روبه**- ا(رووبەه- rûbeh): رێوی، رێڤی.

**روبهانه**- ق.ص(رووبەهانە- rûbehane): رێوییانە.

**روبهک**- ا(رووبەهەک- rûbehek): بێچوە رێوی.

**روبەمزاج**- ص.مر(رووبەه میزاج- rûbehmizac): رێوی تەبیعەت، رێوی ئاسا، ترسنۆک، بێ جورئەت.

**روبیاسه**- ا.فر(روو‌بیاسە- rûbyase): تیرەیەکی رووەکانە.

**روبیان**- ا(روو‌بیان-rûbyan): رۆبیان، مەیگۆ، کولوی دەریایی.

**روبیدن**- مص.م(رووبیدەن- rûbîden): مالین، گسکدان، خاوێن کردنەوە.

**روبنده**- ا.فا(رووبەندە- rûbende): کەسێک کە شوێنێ بمالێ‌و پاک بکاتەوە.

**روبیده**- ا.مف(رووبیدە-rûbîde ): مالدراو، گسکدراو.

**روبیدیوم**- ا.فر(رووبیدیوم- rûbîdyûm): جۆرە کانزایەکە زۆر نەرم‌و زیوینەو، کەم دەست دەکەوێ.

**روپاس**- ا(رووپاس- rûpas): تری رێویانە.

**روپاک**- (رووپاک- rûpak): دەرسۆک، دەستماڵ، دەستەسڕ.

**روپنهان کردن**- مص.ل(رووپەنهان کەردەن- rûpenhan kerden): خۆڤەرشارتن، خۆدەرنەخستن، دوورە پەرێزی.

**روپوش**- ص.فا(رووپووش- rûpûş): هەر شتێ کە رووی شتێ بپۆشێ، روپۆش، بالاپۆش، جبە، پەردە، هەر شتێ کە روالەت‌و ناوەڕۆکی یەکسان نەبێ.

**روپوشه**- ا(رووپووشە- rûpûşe): عەبا، چارشێو،

**روپیه**- ا(رووپییە- rûpîye): روپێ (پارەی باوی هندستان‌و پاکستانە).

**روتافتن**- مص.ل(رووتافتەن- rû taften): روو وەرگێڕان، تۆران، هەلاتن.

**روتختی**- ا.مر(رووتەختی- rûtextî): چەرچەفی سەر تەختی نووستن.
**روتنیـــــوم**- ا.فـــــر(رووتینیـــــوم- rûtinyum): جـــۆرە کـــانزایەکی زۆر سەختە.
**روث**- ا.ع(رەوس- rews): شـیـاکـە، ریخ، تەرس.
**روج**- ا(رووج- rûc): رۆژ، وەخـــــتو زەمان، کات.
**روچە**- ا (رەوچە- rewçe): بەرسـیلە، جۆرە ترێیەکە.
**روح**- ا.ع(رەوھ- rewh): شنەی خۆش، بۆنی خۆش، میهرەبانی، شادی.
**روح**- ا.ع (رووھ- rûh): روح، گـیـان، رەوان، هەوێنی ژیان.
**روح افــــزا**- ص.فـــا(رووھ ئـەفـــزا- rûh efza): روح پەروەر، شادی بەخش، مایەی بەختەوەری.
**روحـانی**- ص.ن(رووهانی- rûhanî): روحانی، پێشـەوای ئاینی، زانای ئاینی، خواناسو ئەهلی سۆفیاتی.
**روحـــانیت**- ا.ع(رووهانیـــیـــەت- rûhanîyet): روحـانیـەت، مـەزەبو رێبازی ئەوانەی کە بە ماددی بوونی روح قایل نین، تەقواو پاکی، خواناسی.
**روحـــانیـــون**- ا.ع(روهانیـــیـــون- rûhanîyûn): زاناو داناو پێشـەوایانی ئاینی.
**روخ**- ا(رووخ- rûx): زەل، زەلـێـکـی تایبەتییە حەسیری لێ دروست دەکرێ.
**روخ چکاد**- ص.مـــر(روخ چەکـــاد- rûx çekad): سەر رووتاوە، دەغسەر.
**رود**-ا(رووە- rûd): رووباری گـەورە کـە برژێتە دەریاوە، شەت.
**رود**- ا(رووە- rûd): ژێـی کـــــەوانـی هەلاجی، ساز، رودو سرود، سازو ئاواز.
**رود**- ا(رووە- rûd): منداڵ (کـــوڕ یان کیژ) نەوەو نەتیرە، زارۆچە.
**رود**- ا.ص(رووە- rûd): رووت. مریشکی ئاوەرووتکراو، مەڕی کەوڵکراو.
**روداد**- ا.مر(رووداد- rûdad): رووداو.
**رو دادن**- مـــــــص.ل( روو دادەن- rûdaden): روو پێ دان.
**روداشتن**- مـص.ل(روو داشـــتــــەن- rûdaşten): پڕ روو بوون، بە جـورئەت بوون، رووداری.
**رودبار**- ا.مـــــر(رووبار- rûdbar): رووبار، شوێنێ کە چەند جۆبارو روبارێکی پێدا بڕوات، رۆخانە، رووباری گەورە.
**رودجـــامـــە**- ا.مـــر(رووجـــامـــە- rûdcame): ساز، سازی ژێدار.
**رودچکاد**- ص.مـــــر(رووچەکــــاد- rûd çekad): سەر رووتاوە، دەغسەر.
**رودخانە**- ا.مر(رووخانە- rûdxane): رۆخانە، ئاوەڕۆی رووبار، رووباری گەورە.
**رودربایستی**- ا.مص(رووەرباسیـــتی- rûder biyistî): لەرووداماـان، بەتەقـە کەوتن، بەشەرماکەوتن.
**رودرو**- ق.ص(رووەر روو- rûder rû): رووبەڕوو.
**دزن**- ا.ص(رووە زەن- rûd zen): ساز ژەن.
**رودساز**- ص.فا(رووە ساز- rûdsaz): سازژەن، وەستای ساز.
**رودست**- ص.مر(رووەست- rûdest): بالادەست، بالاترو باشتر.

**رودست خــــــوردن**- مـص.ل(رودەست خــــــــوردەن- rûdest xûrden): فـريوخـواردن، دەسـتـخـەرۆ بـوون، دەست بەزاخاچوون، هەڵخەڵەتان.

**رودک**- ا(روودەک- rûdek): مـنـدالّ.

**رودک**- ا(روودەک- rûdek): جــــۆرە گـيـانلەبەرێكى درِندەيە، لە پلّنگ دەچێ‌و بە ئەندازەى سـەگـێكە، كـەولّەكـەى بـۆ جلوبەرگ بەكاردێ.

**رودگــان**- ا(روودەگــان- rûdegan): رووت، ئـاوەرِووتـكـراو، كــەولّ كــــراو، درەختى گەلاّرِژاو.

**رودگر**- ا.ص(روودگەر-rûdger): ژێى سـاز، كـەسێ كـە ژێى سـازو كـەمـانجـان دروست بكات.

**رودل**- ا.مر(روودیل- rûdil): ئينتـەلا.

**رودلاخ**- ا.مــــر(روودلاخ- rûd lax): شوێنێ رووبارى زۆرى پێدا برِوات.

**رودن**- ا(روودەن- rûden): جـــــۆرە گولّێكە.

**رودنـــگ**- ا(روو دەنــگ- rûdeng): جۆرە گولّێكە.

**روده**- ا(روودە- rûde): ريـخـــــۆلّـە.

**روده**- ا.ص (روودە - rûde): رووت، ئـاوەرِووت كــراو، كــەولّكراو، درەخــتـى رووتى گەلاّرِژاو.

**رودەدراز**- ص.مـــــــــــــر(رودەدراز- rûde draz): چيــــرە درێژ، چەنەباز، چەنەچەقاوە، هەلّەوەرِ، زۆربلّێ.

**رودەشــو**- ا.مــر(رودەشــو- rûde şû): ئامێرى شۆردنى گەدە، گەدەشۆر.

**روده صـــائم**- ا.مــر(روودەى ســائيم- rûdey sa’im): بەشـێكە لە ريخـۆلّە بـاريـكـە لـە پـاش دوانـزە گــــرێـوە دێ و درێژييەكەى نزيكەى دوو مەترە.

**رودەكـــور**- ا.مــــر(روودەى كـــــور- rûdey kûr): ريخۆلّە كوێرە.

**روديوم**- ا.مــــر(روديوم- rûdyum): كانزايەكى سەختە.

**روذق**- ا(رەوزەغ- rewze¨x): مريشكى ئاوەرِووتكراو، مەرِى كەولّكراو.

**روروک**- (رەورووڤەک- rew rûvek): رەورِەوە.

**روز**- ا(árooz- rûz): رۆژ، وەخــــــتو زەمان، كات.

**روزافـــزون**- ص.مــــر(روزئـەفـــزون- rûz efzûn): هەر شـتێ رۆژ بە رۆژ لە تەرەقى‌و باش بووندابێ.

**روزافــكـــن**- ا.ص(روز ئـــەفـــكــەن- rûz efken): نۆرەتا، تاى رۆژنا رۆژ.

**روز اميدوبيم**- ا.مر(roozى ئوميدو بيم- rûz ’umîdû bîm): رۆژى پەسلاّنێ، رۆژى قيامەت، رۆژى حەشر.

**روزان**- ا(روزان- rûzan): رۆژان.

**روزانــه**- ق.ص(رووزانــە- rûzane): رۆژانە، هەموو رۆژێك، رزق‌و رۆزى.

**روزبان**- ص.مــر(رووزبان- rûzban): دەرگــاوان، پەردەدار، پاســەوانى دەرگــا، پاسەوانى بارەگاى ميرو پاشايان.

**روزباز خواست**- ا.مر( رووى باز خاست- rûzi bazxast): رۆژى قيامەت، رۆژى زيندووبوونەوە، رۆژى حــــەشـــر، رۆژى پەسلاّنێ.

**روزبـرات**- ا.مــــــــــر(روزى بـەرات- rûzi berat): رۆژى بــــــەرات، رۆژى پازدەيەمى شەعبان.

**روزبه**- ص.مـــر(روزبيـــه- rûzbih): خۆشبەخت، بەشانس، بەختەوەر.
**روزپسين**- ا.مـــــــر(رووزی پەسین- rûzi pesîn): رۆژی قـيـامـەت، رۆژی پەسلان.
**روزجــــزا**- ا.مـــــر(رووزی جــــەزا- rûzi ceza): رۆژی حیساب‌و کیتاب، رۆژی حـەشـر، رۆژی قــيـامــەت، رۆژی پەسلانێ.
**روزجک**- ا.مـــــر(رووزی جـــــەک- rûzi cek): رۆژی بــــــەرات، رۆژی پازدەیەمی شەعبان، جیرەی هەمیشەیی، نیـوەی مـانگی شـابانێ شـەوی جـێـژنی بەراتێ، لە خـودای دەکـەم تەڵەبێ بەشکو چاو جوانم داتێ.
**روزخـــسب**- ص.فـــا(رووز خــوسب- rûz xusb): کەسێک بە رۆژ بخەوێ، تەمەڵ و سست لە کارلاندا.
**روز درنگ**- ا.مـــــر(رووزی دیرەنـگ- rûzi direng): رۆژی قیامەت.
**روز رستاخيز**- ا.مر(رووزی رەستاخیز- rûzi restaxîz): رۆژی ئاخیرەت.
**روزســيــاه**- ا.مـر(رووزی سـيـاه- rûzî siyah): رۆژی رەش، رۆژی دژوارو پڕمـەینەت، رۆژی خـەم‌و خـەفـەت، رۆژی تازیەو پرسە.
**روزشـــمـــار**- ا.مـر(رووزی شـومـار- rûzi şumar): رۆژی حیـسـاب، رۆژی پەسلانێ.
**روزشـــمـــار**- ا.مـــر (رووز شـومـار- rûz şumar): رۆژژمێر.
**روزقـيـامـت**- ا.مـر(روزی غـيـامـەت- rûzi xîyamet): رۆژی حـەشـر، رۆژی پاشین.
**روزكار**- ا.مر (رووزی کار- rûzi kar): رۆژی کارو کۆشش، رۆژی شەڕو نەبەرد.
**روزكور**- ص.مر(رووزکور- rûz kûr): رۆژکوێر، کەسێک کە بە رۆژ چاوی لەبەر هەتاو هەڵنەیەت‌و نەبینێ.
**روزگار**- ا(رووزگار- rûzgar): رۆژگار، دنیا، گێتی، وەخت‌و زەمان.
**روزگـــاربردن**- مص.ل(رووزگــار بوردەن- rûzgar burden): رۆژگـــار بەســـەر بردن، رۆژ قەتاندن، ژیان بەڕێکردن.
**روزگار يافتن**- مص. ل(رووزگار یافتەن- rûzgar yaften): دەرفـەت دۆزینەوە، دەرفەت بەدەست هێنان، هەل هەڵکەوتن.
**روزگـانه**- ا.مـر(روزگـانە- rûzgane): رۆژمـز، کـرای رۆژانە، جـیـرەی رۆژانە، ئازووقەو خۆراکی رۆژانە، رۆژانە.
**روزگــــرد**- ص.فــــا(رووز گـــــەرد- rûz gerd): رۆژ، هەتـاو، رۆژگـــــەڕ، کەسێک کە بە رۆژ بسووڕێتەوە.
**روزگــــردان**- ا.مـــر(رووز گـــەردان- rûzgerdan): گوڵە بەڕۆژە.
**روزگــــردک**- ا.مـــر(رووز گـــەردەک- rûz gerdek): گوڵە بەڕۆژە..
**روزگــون**- ص(رووز گــون- rûzgûn): رۆژ ئاسا، سپی‌و رووناک وەکو رۆژ.
**روزمــــادر**- ا.مـــر رووزی مــــادەر- rûzi mader): رۆژی دایک، جـەژن و ئاهەنگی سالانەی رۆژی دایک.
**روزمــــــره**- ا.ص(رووز مــــــەرە- rûz mere): رۆژانە.
**روزمـه**- ا.مـر(رووز مـەه- rûzmeh): مێژوو، حیسابی رۆژو مانگ‌و ساڵ.

**روزن**- ا (رەوزەن- rewzen): دەلاقــە، کلاو رۆژنە، پەنجەرەی بچووک.
**روزنامـــچـــە**- ا.مـــر(رووزنامـــەچە- rûznameçe): دەفتـەرێ کە بازرگـانان دانوســتــانی رۆژانەی خــۆیانی تێــدا دەنووسن، نامەی سەربوردەو ژینامەو کارو روداوێن رۆژانە، دەفــتــەری حــیــســابی بازرگانان.
**روزنامە**- ا.مر(رووزنامە- rûzname): رۆژنامە، نامەیەک کە رۆژانە یان هەفتانە چاپو بلاوبکرێتــەوەو هەواڵو رووداوێن رۆژانە بلاوبکاتەوە، یەکـەمین رۆژنامــەی خەتی لە ساڵی ١٥٦٣دا لە ڤینیسیادا دەرچوو، یەکەمین رۆژنامەی چاپی لە ڤیێنا لە ساڵی ١٦١٥دا دەرچوو.
**روزنامــەنگار**- ا.ص(رووزنامــەنیگار- rûznamenigar): رۆژنامـــەنووس، رۆژنامەوان، رۆژنامەڤان.
**روزن داران**- ا.مــــــــر(رەوزەن داران- rewzen daran): مــێــرووی یەک خانەیی.
**روزنــــە**- ا(رەوزەنـــــە- rewzene): کلاورۆژنە، دەلاقە.
**روزە**- ا(روزە- rûze): رۆژوو، رۆژوو لە ساڵی دووەمی کـۆچیــیــەوە بوو بە واجب لەســەر مــوسـڵــمــانان، پێــشــتــر لە هەر مــانگێکدا سێ رۆژ؛ رۆژانی ١٣، ١٤و ١٥ رۆژوو دەگــیــراو پێی دەگــوترا رۆژانی سپی.
**روزەخـــوار**- ص.فـــا(رووزە خـــار- rûze xar): رۆژوو نەگر، رۆژوو خۆر.
**روزەدار**- ص.فا(رووزەدار- rûzedar): بەرۆژوو، رۆژوو وان.
**روزە گـشـودن**- مص.ل(رووزە گـوشـودەن- rûze guşûden): فـتـارکـردن، رۆژوو شکاندن.
**روزی**- ا(رووزی- rûzî): رۆزی، رزق، توێشو، جیرەو خۆراکی رۆژانە.
**روزیانە**- ا(رووزیانە- rûzyane): رزق و رۆزی، ئازووقە و خواردن.
**روزی دە**- ص.فـــــــــا(رووزی دە- rûzîdeh): رۆزیدەر، خوا.
**روزی رســان**- ص.فـا(رووزی رەســان- rûzî resan): رزقــدەر، یەکــێکە لە سیفەتەکانی یەزدان.
**روزی مـنـد**- ص(روزی مـــــــەنـد- rûzî mend): خاوەن رزقو رۆزی.
**روزینە**- ا(رووزینە- rûzîne): خـۆراکی رۆژانە، جیرەی رۆژانە، ئازووقەی رۆژانە.
**روزیــنــــەدار**- ا.ص(رووزیـــنـــەدار- rûzînedar): کـەسـێک کـە جـیـرەی رۆژانەی وەربگرێ.
**روژ**- ا.فـــــر(روژ- rûj): ســــوراو.
**روس**- ا(رووس- rûs): قــەومی رووس.
**روس انگردە**- ا.مــر(روڤــەس ئەنگوردە- rûvew engurde): ترێ رێویانە.
**روسپی**- (رووسپی- rûspî): سۆزانی، قەحبە، حەدیدی، ژنی بەدکار، داوێن تەڕ.
**روســپی بارە**- ص.مــر(رووســپی بارە- rû spî bare): قەحبەباز.
**روستا**- ا(رووستا- rûsta): گوند، دێ، ئاوایی.
**روســتــازادە**- ص.مــر(رووســتــا زادە- rûsta zade): دێهاتی زادە.
**روســـــتــــرە**- ا.ص(رووســـــو تورە- rû suture): خاولی دەموچاو سڕین.

**روسختج**- ا(رووسەختەج-rû sextec): ئۆکسیدی مس کە لە کۆنا وەکو دەرمانی چاو بەکار دەهات.
**روسختە**- ا(رووسەختە- rû sexte): ئۆکسیدی مس.
**روسفید**- ص.مر(روو سیفید- rûsifîd): سەرفراز، روو سوور، بێ گوناه.
**روس فیل**- ص.فر(رووس فیل- rûs fîl): لایەنگری رووس، هەواداری رووس.
**روسم**- ا.ع(رەوسەم- rewsem): نیشانە، مۆر.
**روسیاه**- ص.مر(رووسیاه- rûsîyah): روو رەش، کەسێک کە رەنگی رەش بێ، روو رەش، گوناحکار، بەدکردەوە، یاخی.
**روش**- ا.مص(رەڤیش- reviş): رۆیشتن، رەوت، بوار، رارەو، شەقام.
**روش**- ا(رووش- rûş): رۆشنایی.
**روشان**- ص(رەوشان- rewşan): رۆشن، رووناک.
**روشن**- ص(رەوشەن- rewşen): درەخشان، رۆشن، پرشنگدار، تابان، درەوشاوە.
**روشن**- ا.مص(رەڤیشەن- revişen): رۆیشتن.
**روشنا**- ا(رەوشەنا- rewşena): رۆشنایی، تیشک.
**روشناس**- ص.مر(رووشیناس- rûşinas): ناسراو، ناودار، بەناوبانگ.
**روشنایی**- ا.مص(رەوشەنایی- rewşenayî): رۆشنایی، رووناکی.
**روشن بین**- ص.فا(رەوشەن بین- rewşenbîn): دانا، زانا، هوشیار، بینا.
**روشن بینی**- ا.مص(رەوشەن بینی- rewşen bînî): بینایی، زانایی، رۆشنبیریی.
**روشن چراغ**- ا.مر(رەوشەن چیراغ- rewşen çirax): چرای رۆشن، نەوایەکی کۆنی مۆسیقایە.
**روشندان**- ا.مر(رەوشەن دان- rewşendan): چرادان، شوێنی دانانی چرا، کلاورۆژنە.
**روشن دل**- ص.مر(رەوشەن دیل- rewşen dil): بەویژدان، دڵو دەروون پاکو رۆشن، زانا، هوشیار.
**روشن رای**- ص.مر(رەوشەن رای- rewşen ray): خودان بیروبۆچوونی روون و دیار.
**روشن روان**- ص. مر(رەوشەن رەڤان- rewşen revan): هوشیار، زانا، دڵو دەروون پاکو رۆشن.
**روشن ضمیر**- ص.مر(رەوشەن زەمیر- rewşen zemîr): بەویژدان.
**روشن فکر**- ص.مر(رەوشەن فیکر- rewşen fikr): رۆشنفکر، رۆشنبیر، زانا، بەهۆش.
**روشن قیاس**- ص.مر(رەوشەن غیاس- rewşen xîyas): زیرەک، تیژفام.
**روشنک**- ا(رەوشەنەک- rewşenek): ناوی دەرمانێکی گیاییە، سوککراوەی (رۆشن)ـە ناوە بۆ ژنان.
**روشنگر**- ص.فا(رەوشەنگەر- rewşenger): روونکەرەوە، مشتومالْ

دەر، لێكدەرەوە، راڤەكار، شرۆڤەچی.
**روشن نهاد**- ص.مر(رەوشەن نیهاد- rewşen nihad): پاک سروشت، تەبیعەت پاکو روناک.
**روضه**- ا.ع(رەوزە- rewze): باغ و گوڵستان، گوڵزار، مێرگو سەوزەزار، مێرگوزار، بەهەشت، گۆڕ، رەوزە ئەو بابەتو شیعرانەش كە لە بۆنەی تازیەباریدا لەسەر مینبەرەكانەوە دەخوێنرێتەوەو بریتییە لە حەمدو شوكرانەی خواو درودو سڵاوات لە دیداری پێغەمبەرو ئیمامانو شەرحو شرۆڤەی هەندێ لە رووداوەكانی كەربەلا..
**روضه‌خوان**- ص.فا(رەوزەخان- rewzexan): رەوزەخوان، ئەوەی لە یادی شەهید بوونی ئیمام حسەیندا بابەتو شیعرەكانی ئەو بۆنەیە دەخوێنێتەوە.
**روع**- مص.ع(رەوع- rew'): ترسان، دڵەڕاوكێ، ترس، سەرسام بوون.
**روعت**- ا.مص(رەوئەت- rew'et): مایەی ترس، مایەی سەرسامی.
**روغ**- ا(روغ- rûx): قرقێنە، قرپ.
**روغان**- مص.ع(رەڤەغان- revexan): ئەملاو ئەولاكردن، حیلەكردن، گزیكردن.
**روغن**- ا(رەوغەن- rewxen): رۆن، دون.
**رغناس**- ا(روغناس- ruxnas): ترێ كێویلكە.
**روغندان**- ا.مر (رەوغەندان- rexendan): رۆندان، شتێ كە رۆنو مەڵحەمی تێ بكرێ.
**روغن سوزی**- ا.مص(رەوغەن سوزی- rewxen suzî): رۆن سەرفكردنی ئوتومبیل.
**روغنكاری**- ا.مص(رەوغەنكاری- rewxenkarî): چەوركردنی مەكینە (هەر مەكینەیەک پێویستی بە چەوركردنی بێ).
**روغنگر**- ا.ص(رەوغەنگەر- rewxenger): رۆنگر، كەسێک كە رۆن لە تۆوی رووەكان بگرێ.
**روغن ماهی**- ا.مر(رەوغەنی ماهی- rewxenî mahî): رۆنی ماسی.
**روغنی**- ص.ن(رەوغەنی- rewxenî): رۆنگر، نانێک كە رۆنیان لە هەویرەكەی كردبێ.
**روغنین**- ص.ن(رەوغەنین- rewxenîn): رۆناوی، نانی بەڕۆن، نانە چەورە.
**روف**- ا(رووف- rûf): جۆرە رووەكێكە.
**روفتن**- مص.م(روفتەن- rûften): ماڵین، گسكدان، ماڵین و خاوێنكردنەوەی تەپوتۆز و پوش و پەڵاشان.
**روفرشی**- ص.ن(رووفەرشی- rûferşî): نەعلی سەر فەرش، جاران پارچەیەكی كەتانییان بەسەر فەرشی گرانبەهادا رادەخست بۆ ئەوەی پێ خوست نەبێ، یان تیشكی هەتاو رەنگەكەی نەبا.
**روكار**- ا.مر(رووكار- rûkar): رووكاری خانوو بنیا، رووی بنیا.
**روكش**- ص.فا(رووكەش- rûkeş): رووكەش، شتێ بدرێ بەسەر شتێكی تردا، شتێ كە رواڵەتی جیابێ لە ناوەڕۆكی.
**روگرداندن**- مص.ل (رووگەرداندەن- rûgerdanden): روو وەرگێڕان،

دەستبەرداربوون، وازهێنان.
**رولت**- ا.فــر(رۆلیت- rolit): جــۆرە قــومــارێکە، (رۆلێت)، تایەی بچــووکی ژێرمێز یان کورسی، یان تەختی نووستن.
**رولور**- ا.فر(ریڤـول ڤیـر- rivol vîr): دەمانچە، وەروەر.
**روم**- ا(روم- rûm): تــووکـــــــەبـەر.
**رومال**- ا(رومال- rûmal): دەستـەسڕ، خاولی.
**رومبا**- ا.فر(رومبا- rûmba): جۆرە سەمایەکە.
**رومـــــی**- ص.ن(رومـــــی- rûmî): خەڵکی رۆم، رۆمی (خەڵکی تورک).
**رون**- ا(رەڤەن- reven): تاقیکردنەوە، ئەزموون، تەجرەبە.
**رون**- ا(رون- rûn): هـۆ، ســـــۆنـگـە، بایس.
**روناس**- ا(روناس- rûnas): جـــۆرە رووەکێکە.
**رونجـــو**- ا(رەڤـــەنجـــو- revencû): مۆریانە، مۆریکە.
**روند**-ا(رەڤـــەند- revend): رەوش، رەفتار، تەرز، رێچکە و شێواز.
**روند**- ا.ع(ریڤـــەند- rivend): رەگی رێواس.
**رونـــق**- ا.ع(رەونـــەغ- rewnex): رۆشنایی، روونـاکی، چاکی، جـــوانی، رەواج، برەو، پێشڤەچوونی کار.
**رونما**- ا.مـر(روونەمـا- rûnema): ئەو شت یان پارەیەی کە بە دیتنی رووی بووک یان ساوا وەکو دیاریی دەدرێ.
**رونمـــودن**- مـــــص.ل(روونمــــودەن- rûnmûden): دەرکـــــــەوتـن، روو

نیشاندان، روو تێ کردن.
**رونوشت**- ا.مـــــر(روونـڤـــیــــــست- rûnivişt): کۆپی، لەبەر گرتنەوە، لەبەر نووسینەوە.
**رونویس**- ا.مـــر (روونیـــــڤـــیس- rûnivîs): کۆپی، لەبەر نووسینەوە.
**رونی**- ص.ن(روونی- rûnî): خـەڵکی گوندی رونە-ی سەر بەنیشابور.
**روهـنـی**- روهـیـنـی- rûhinî): پـۆڵا.
**روی**- ا(روی- rûy): جـۆرەکـانزایەکـە.
**روی**- ا(روی- rûy): روو، لـەســـــەر: (کتاب را رووی میز گذاشت).
**روی**- ا.ع(رەڤـی- revî): هـەوری بـە باران، ئاوی شیـرین و سازگـار و تینوێتی شکێن، ساقی، ئاقڵ و تەندروست.
**رویا**- ص.فا(روویا- rûya): شتـێ کـە بڕوێ.
**رویـــارو**- ق.ص(رویـــارو- rûyarû): رووبەڕوو، بەرەوڕوو، بەرانبەر.
**رویـــانـــدن**- مـــص.م(رووویـــانـــدەن- rûyanden): رواندن، چاندن.
**رویانده**- ا.مف(رووویاندە- rûyande): روێنراو، چێنراو.
**رویـانـنـده**- ا.فـــــــا(رویـانـەنـدە- rûyanende): روێنەر، چێنەر.
**رویان شناسی**- ا.مص(روویان شیناسی- rûyan şinasî): پزناسی.
**رویداد**- ا.مـــــر(رووپداد- rûydad): رووداو، بوبەر، پێشهات.
**روی دادن**- مــــــــص.ل(رووی دادەن- rûydaden): رووادان.
**روی زرد**- ص.مـــــــــــر(رووی زەرد- rûy zerd): روو زەرد، شـــەرمـــەزار،

پەردەی روچاڵ بەسێ پروجیکتۆر لە سێ لاوە عەکس بکرێتەوەو بەرجەستە بکرێ.
**سینەریش**- ص.مر(سینەریش- sînerîş): دڵبرین لە خەم و خەفەتا.
**سینەزن**- ص.فا(سینەزەن-sîne zen): سینەکوت، کەسێک لە رۆژانی عەزاداریدا لەگەڵ دەستەی سینگ کوتانا سینگ بکوتێ.
**سینە سوز**- ص.فا(سینەسوز- sîne sûz): دڵسوت، خەم و خەفەتی زۆر کە دڵ ئازار بدات.
**سینەکردن**- مص.م(سینەکەردەن- sîne kerden): وەپێشدان.
**سینەکردن**- مص.ل(سینەکەردەن- sîne kerden): تیغ کردن.
**سینەکش**- ا.مر(سینەکەش- sîne keş): بناری کێو، شوێنی پانو هەمواری هەتاوگیر.
**سینی**- ا(سینی- sînî): سینی، کەشەفە.
**سیو**- ا(سیو- sîw): سێو، سێف.
**سیورسات**- ا.ت(سویورسات- suyûrsat): ئازووقە لە کاتی حەرەکەتدا بۆ لەشکر فەراهەم بکرێ.
**سیورغسال**- ا.ت(سویورغ سال- suyûrxsal): تیول، پارچە زەوی یان دەرامەتی ئەو پارچە زەوییە لە جیاتی مووچە لەلایەن پاشاوە بە کەسێک بدرێ.
**سیوف**- ا.ع(سویوف- suyûf): شمشێران.
**سیویل**- ص.فر(سیڤیل- sîvîl): مەدەنی، سیڤیل.
**سیە**- ص(سییەه- siyeh): رەش.
**سیەسار**- ص.مر(سییەه سار- siyeh sar): نەهەنگ، سەر رەش، بۆ ژنی بێنەوا دەگوترێ، ماسییەکە.
**سیەفام**- ص.مر(سییەه فام- siyeh fam) رەش.
**سیهک**- ا(سییەهەک- siyehek): زیوان، مرۆر.
**سیەکار**- ص.مر(سییەهکار- siyeh kar): بەدکردەوە، داوێن پیس، گوناهکار، زاڵم، ستەمکار، بەدکار.
**سیەگلیم**- ص.مر(سییەه گیلیم- siyeh gilîm): بەخت رەش، نەگبەت، بێ تالح، بێ یەغباڵ.
**سیەنامە**- ا.ص(سییەه نامە- siyeh name): یاخی، بەدکار، داوێن پیس، گوناهکار، کەسێک نامەی کردەوەی رەش بێ.
**سیهە**- ا.ص(سییەهە- siyehe): سۆزانی، ژنی بەدکار، قەحپە.
**سی یک**- ا.مر(سییەک- sîyek): ١ لەسەر ٣٠، سییەم، سی یەک، یەک بەش لە سی بەش.